عەلی باپیر

# چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم

نوزاد

## لە نێوان واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعیانە

- تیرۆرو تۆقاندن
- سیکۆلاریزم - عەلمانیەت -
- مافەکانی مرۆڤ
- جیهانگیری - عەولەمە -
- دیموکراسی



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە (د. عەلی باپیر) ڕێگەم بە مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و خێری زیاتر

بخاتە ئیش و کارەکانیانەوە.

وە جگە لەوان هیچکەس و لایەنێک مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

عەلی باپیر

١١ ربيع الثاني ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

# چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم

## ڕەخنێکی واقیعیانە و هەڵسەنگاندنێکی شەرعیانە

### تیرۆر و تۆقاندن - سیکۆلاریزم - مافەکانی مرۆڤ
### جیهانگیری - دیموکراسی

لەگەڵ
دوو ئەلقە چاوپێکەوتنی بەرنامەی سۆراغ
سەبارەت بە دیموکراسی

عەلی باپیر

تەفسیر

١٤٢٦ک - ٢٠٠٥ز

ناوی پەرتوک: چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم
ناوی نوسەر: عەلـــی بـــاپـیـــر
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٦ك – ٢٠٠٥ز
تیراژ: ٣٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر/ هەولێر
(٦٠٤)ی ساڵی ٢٠٠٥

تفسير
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٠١٦٩٥ - ٢٢١٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

چاپکردنی پێشووی کتێبەکانم بە نۆرە بە گوێرەی

توانا و هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .

وە ئێستێ بوو هیوادارم وا بوو شێوە چاپکردنێکی

وایان بۆ بڕەخسێنی کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانی لابێ . جارێکی تر سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم کە خۆی دەسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵدەستێ .

خوا بەرەکەت بخاتە ئیش و کاریانەوە و لەگەڵیان

بێت ، منیش سوپاسیان دەکەم .

عەلی باپیر

## پێشکەشە:

بەو کەسانەی کەبەر لە قسەکردن دەربارەی هەر مەسەلەیەك هەوڵ دەدەن چاك لێی تێبگەن و، پاش لێتێگەیشتنیشی تەنها لەسەر بناغەی بەڵگە قسەی لەسەر دەکەن و، لەهەر لایەکیشەوە ڕووی گەشی حەقیقەت دەربکەوێ پێشوازیی لێدەکەن.

# پێشەکی

الحمد لله حق حمده والصلاة والسلام على عبده محمد وآله والسائرين على دربه والمنخرطين في سلك حزبه.

خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم!

لە پێشەکی ئەم چاپی پێنجەمی کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا کە (نوسینگەی تەفسیر) پێی هەڵدەستێ، ئەم چەند ڕوونکردنەوەیە بەپێویست دەزانم:

١-لەم چاپی پێنجەمەدا کە چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیرە، ئەم کتێبە لە ڕووی نێوەرۆکەوە وەك خۆی هێڵراوەتەوەو دەستکاری نەکراوە، ئەویش لە سۆنگەی سەرقاڵیی و دەستگیراوییەوە، خوا پشتیوان بێ لە داهاتوودا، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ چی پێویست بێ و بۆمان بلوێ ئەنجامی دەدەین.

٢-سەرجەم پێشەکییە تایبەتییەکانی پێنج ئاڵقەکانی ئەم زنجیرەیە لابراون، کە زیاتر تایبەت بە کات و شوێن و چۆنیەتی تۆمارکران و نووسرانەوەیانەوەو، خوا پاداشتی هەرەچاکی هەموو ئەو دڵسۆزانە بداتەوە، کە سەروکاری بەستنی کۆڕەکان و تۆمارکردن نووسینەوەو ڕێکخستنی وتار و باس و بابەتەکانیان کردووەو بۆ هەموو لایەکیان دنیایەك سوپاسگوزارم و لێیان مەمنونم.

٣-برای بەڕێزم مامۆستا حەسەن بابەکر، ئەرکی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی ئەم چاپەی وەئەستۆ گرتوەو بەئاگاداری خۆشم دەستکاریی چەند وشە و بڕگە و ڕستەیەکی کەمی کردووە، بۆ زیاتر گونجان لەگەڵ حاڵەتی (کتێب بوون)ی باس و بابەتەکاندا، بەڵام بێگومان مۆرکی (وتاربوون) بە سەرجەم ئاڵقەکانەوە هەر دیارە.

٤-هیچ گومانی تێدانیە، کە چاپکرانەوەی ئەم کتێبە بۆ جاری پێنجەم

لـەماوەی سێچوار ساڵێکدا و لەبازاڕدا نەمانی نوسخەکانی، دوو ڕاستی گرنگی لێ دەفامرێتەوە:

٥-یەکـەم: کـە ڕەوتـی ئیسـلامیی لـە کوردسـتاندا لـە گەشـەکردن و بەرەوپـێش چـوون دایـە، بەتایـبەت لەنـێو چـین و توێژی هەرەزیندوو و کاریگـەری کۆمـەڵگای کوردەواریـی، کە قوتابی و لاوانن، بە هەردووك ڕەگەزەکەوە.

٦-دووەم: ڕەوتـی سیکۆلاریزم و بانگەشەکردن بۆ بیروبۆچوون و فەلسەفە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکان و دووریگرتن لە ئیسلام، لەگەڵ ئەوەشدا کە هـەردووك ئـیدارە حیزبـیەکانی هەولـێر و سلێمانی بەرەسمی تەبەننی‌یان کردووەو پشتگیریی دەکەن و مەسرەفێکی زۆریشی لێ دەکەن، بەڵام ڕوەو ئیفلاس و فەشەل و قەیرانێکی بیرەزا ملی ناوەو، هیچ هێزێکیش ناتوانێ لـەو ئاکامـە شـوومەی، کـە چاوەڕێی دەکات دەربازی بکات و دەفریای بێـت، هۆکارەکەشـی ئەوەیـە کـە عەلمانـیەت و فەلسەفە ڕۆژهەڵاتیی و ڕۆژئاوایـیەکان، زادە و هـەڵقولاوی زەمیـنەو ڕۆژگـار و بارودۆخـێکی دیکـەی تایبەت و جیاواز لەوەی کۆمەڵگای ئێمەن و، فاکتەرەکانی بوون و مانـیان لـەلای ئـێمەمانان-مسـوڵمانانی شـوێنکەوتووی قورئـان و پێغەمـبەری ئاخیرزەمان،صـلی الله علـیە وسـلم- نـین، بۆیـە خـۆ پێوە ماندووکـردن و مەسرەف لێکردنیان بێهوودەیەو، جگە لە ماندووبوون و ڕەنج بەزایەچوون هیچی لێ سەوز نابێ.

٧-خـوا سبحانە وتعالی لە لوطف و کەرەمی بێسنووری خۆی بەرەکەت و پـێزی زیاتـر بخاتـە ئـەم بەرهەمـەوەو، بـیکاتە مایـەی بەرچـاوڕونی ژمارەیەکی زیاتر لە گەنج و قوتابی و ڕۆشنبیرانی میللەتەکەمان.

علی باپیر

١٤/ شەووالی ١٤٢٦

٢٠٠٥/١١/١٦

سلێمانی

## ئەم زنجیرەیە بۆ؟!

خوێنەری بەرێز!

بەسەرنج دانو تێوەڕامانی مێژووی دوورو نزیکی بەشەر لەسەر خڕۆکەی زەوی، زۆر بەڕوونی‌یاسا (سنة) یەکانی خوا (تبارك وتعالى) کە لە ژیانی مرۆڤایەتی‌دا داینـاون دەردەکـەون، وەك چـۆن بەسـەرنج دان و لیّ ورد بوونەوەی بوونـەوەر ئـەو یاسـا گەردوونـیی‌و فـیزیایی‌و کیمـیایی‌و بـیۆلۆژیی‌یانەی کـە خـوای زاناو تواناو کاربەجێ (جل جلاله) لە بوونەوەرو سروشتو دەووربەریاندا داینـاون، بۆمان ئاشکرا بوونو دەبن!

هەربۆیـەش خـوای پـەروەردگار لە چەندان ئایەتی قورئان دا فەرمانی پـێکردووین کەسـەرنجی بوونـەوەرو دەوروبـەرمان بدەیـنو لـەدیاردە سروشـتی‌یەکان وردبیـنەوە، تـاکو یاسـا سروشـتی‌یەکانی خـوای بێ‌وێـنە لەبوونـەوەری سروشـتێنراو (الكون المطبوع)ی‌دا بەدی بکەین و بدۆزینەوە. وەك فەرمووی‌ـەتی: ﴿أَوَلَـمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَـقَ اللَّـهُ مِنْ شَيْءٍ﴾(الأعراف: من الاية١٨٥) وەفەرموویـەتی: ﴿أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلَى الْأبَلِ كَيْفَ خُلقَتْ ،وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفعَتْ، وَإِلَى الْجبَالِ كَيْفَ نُصبَتْ، وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطحَتْ﴾ (الغاشية:١٧-٢٠).

هـەروەها لـەبارەی سـەرنج لێدانی‌شـوێنەواری پێشـووانو تـێوەڕامانی بەسـەرهاتو سەرگوزشـتەکانیان بـۆ پـەند لێوەرگرتنـیانو پـەی پێـبردنی یاساکانی خوا لە ژیانی ئینساندا، فەرموویەتی: ﴿قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِـيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ،هَذَا بَيَانٌ لِلنَّاسِ وَهُدىً وَمَوْعِظَةٌ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (آل عمران:١٣٨).

جا یەکێك لەو یاساو سوننەتانەی خوای کاربەجێ کە لە ژیانی ئینسانو گـەلاندا دەبیـنرێنو (عـبدالرحمن ابـن خلـدون) لەکتێبی نایابی (المقدمة

خـۆیدا بـۆ یەکەمین جار وەك کۆمەڵناسێکیزەبر دەست ئاماژەی بۆ کردووە ئەوەیـە کەهەمیشە گەلو میللەتانی ژێر دەستو تێشکاو (المغلوب) لاسایی ئـەو کۆمـەڵو مـیللەتانە دەکەنـەوەو چـاویان لـێدەکەن، کەبەسـەریان دا زاڵبوونەو خستوویاننە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە(١).

جـا هـەر چـەندە ئەوەی (إبن خلدون) گوتوویەتی پێم وایە لەسەدا سەد ڕاسـتە، بـەڵام بـێگومان کۆمـەڵو میللەتانی زیندووو خاوەن عەزمو ئیرادە ئەوانـەن کە هیچ کاتێك لەبەرانبەر (قَدَر) و (سنة) کانی خوای پەروەردگاردا کەبەزیانـیان تـەواو دەبـن، تەسـلیم نـابنو چـۆك دانادەن، بەڵکو (عمـر بن الخطـاب(ﷺ)) گوتـەنی: (أفر من قدر الله إلی قدر الله)(٢)، هەوڵ دەدەن بەو (قَـدَر)و (سـنة)انـەی خـوای کاربەجێ کەلە قازانجیانن، خۆیان لەکاریگەریی ئەوانی دیکە بپارێزن کەزیانیان لێ دەدەن.

جـا ئـەوەی کـەمن دوای ئـەم زەمینە سازیی‌یەی ڕابرد دەمەوێ لێرەدا بیڵـێم، ئەوەیـە کە بێگومان میللەتی ئێمە بەگشتی کەمو زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگـەریی ئـەهلی کوفـرەوە- وەك بـاقی مـیللەتانی دیکـەی جـیهانی ئیسـلامیی-، وەکـەمو زۆر هـەوڵی داوەو دەدات کەلاسـاییی‌یان بکاتـەوەو تەقلـیدیان بکـات، وەك (إبـن خلـدون) دەڵـێ: هـەر لە جلو بەرگەوە هەتا بیروباوەڕ!

ئـەوەتا زۆر بـەزەقی دەبینین کەخەڵکێکی خوێندەوارو(٣) خۆ بەرۆشنبیر زانیشـمان لـەبواری بیرکردنەوەو بیروباوەڕدا بێ سێو دوو تەسلیمی سەرجەم

---

١) بڕوانە: (المقدمة) ص١١٧،١١٦، فصل: في أن المغلوب مولع ابداً بالإقتداء بالغالب في شعاره وزية ونحلته وسائر احواله وعوائده).

٢) (بخاري) گێڕاویەتەوە، هەروەها (عبدالقادر الگیلانی)یش قسەیەکی لەو جۆرەی هەیە.

٣) دیارە سوپاس بۆ خوای بەرزو مەزن، خەڵکی دیکەشمان هەیە کە قەناعەتو هەڵوێستیان وا نیە.

ئـەو چەمكو لێكدانەوانە بوونە کەئەهلی کوفر- بەتایبەت ڕۆژئاواییەکان- بـڕوایان پێیانە هەرچەندە بیروبۆچونو لێکدانەوەکانی ئەوان هەڵقوڵاوو زادەی واقیعو ژینگەو هەلو مەرجێکی زۆر جیاواز بن لەهی ئێمەو مانان!

جا بەندە بەپەنابردنە بەر (قدر)ێکی دیکەی خوای کاربەجێ، کەبریتییە لە (سـنة تغییر النفس لتغییر الواقع) یاسای: (خۆ گۆڕین بۆ گۆڕینی واقیع)، کـە چـەند ئایەتـێکی قوڕئان ئاماژەی بۆ دەکەن، بەتایبەت ئایەتی ژمارە (١١)ی (الـرعد) کـە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾.

واتـە: بـێگومان خـوا حاڵو واقیعی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ تاکو ئەوان حاڵەتی دەروونی خۆیان نەگۆڕن!

بـەڵێ بـەندە بەپەنابـردنە بـەر ئـەو قەدەرو سوننەتەی خوا (جل وعلا) دەمـەوێ ڕێـی دەربـازبوون لـەحوکمو کاریگـەریی قـەدەرو سـوننەتی: (لا ساکردنەوەو چاولێکەری ژێر دەست بۆ بالاْ دەست)، (تقليد وأعجاب المغلوب بالغالـب)، بخەمـە بەرچـاوی کۆمـەڵگاو مـیللەتەکەی خـۆم، چـونکە خۆم بەدڵسـۆزی کۆمـەڵگاو مـیللەتەکەم دەزانمو دڵنیاشـم کە کۆمەڵگای ئێمەو هـەر کۆمەڵگایـەکی دیکـەش لەسـۆنگەی لاسـاکردنەوەو چـاولێکەرییو خۆلێـبزربوونو دوژمن لە لا زلبوونەوە، سەری لە پووچەڵییو گەندەڵییەوە دەردەچـێ، بەتایبەتـیش کەتـەڕەفی لاسـاکراوەو چـاولێکراو (الطـرف المقلَد والمولـع بـە) شارسـتانێتی ئاژەڵییانـەی پووچو بێ کاکڵی ئەورووپاو ڕۆژئاوا بێت!

شـایانی باسیشـە کـە (إبـن خلـدون) کۆمەڵناسـی مسـوڵمانی بەتوانا دیـاردەی لەبـەین چـوونی مـیللەتی لاسـاکەرەوە بەیـەکی دیکـە لەیاسـاو

سوننەتەکانی خوا لە ژیانو مێژووی بەشەردا دادەنێ[٤].

جابۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەش-وێڕای هەوڵو هەنگاوەکانی دیکەم- بەپێویستم زانی زنجیرە باسێك بنووسم- کە هەر کامێکیان سەرەتا وەك وتار لەکۆڕێك دا پێشکەش کراون-، بەناوو نیشانی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)، وە هەر کامێکیشیان، خوا پشتیوان بێ، تەرخان دەکرێ بۆ توێژینەوەی یەکێك لەو بابەتو مەسەلە باوانەی کەلەم رۆژگارو سەردەمەمان دا لە نێو سەرجەم یان تێکڕای چین و توێژەکانی کۆمەڵگاو میللەتەکەماندا لە ئارادانو کەمو زۆر قسەو باسیان لەبارەوە دەکرێو مشتو مڕو بگرەو بەردەیان لەسەر دەکرێ.

هۆی هەڵبژاردنی ئەو جۆرە بابەتو مەسەلانەش لەلایەن بەندەوە ئەوەیە کە هیچ کام لەو بابەتانە زادەو هەڵقوڵاوی واقعی میللەتو کۆمەڵگای ئێمە نینو ئەگەر گریمان ئەو مەسەلانە خەڵکی رۆژئاواش ناچاریان بووبێو لە هەلو مەرجێکی ناسازگارو نەخۆشدا گرفتاریان بووبێت، وە ئەگەر گریمان ئەو جۆرە مەسەلەو بابەتانە رۆژێ لەرۆژان خێرێکیان لێهەڵوەریبێ بۆ خاوەنو پەیداکەرانیان، ئەوە بێگومان میللەتو کۆمەڵگای ئێمە نەبۆیان ئاتاجو ناچارەو، نەهیچ دەردێکیشی چارەسەر دەکەن، بەڵکو هەتا خێرێکیان لێدەبینێ سەد زیانی پێ دەگەیەنن.

بەڵێ هەرکام لەمەسەلەو بابەتەکانی: (تیرۆر، سیکۆلاریزم، مافەکانی مرۆڤ[٥]، دیموکراسی، جیهانگیریی (عەولەمە) کە خوا یاربێ هەرکامێکیان

---

٤) بڕوانە: (المقدمة) ص١١٨،١١٧، (فصل: في أن الأمة إذا غلبت وصارت في ملك غيرها أسرع إليها الفناء).

٥) مافەکانیمرۆڤ بەو چەمكو واتایەی کەرۆژئاواییەکان بەکاریان هێناوە کەلەکاتی توێژینەوەی (مافەکانی مرۆڤ) داباسی دەکەین، نەك بەموتڵەقی، ئەو ڕوونکردنەوەیەشم لەبەر

ئاڵقەیـەکی ئـەم زنجیرەیـە دەبـن، کـەمو زۆر پـەیوەندییان بەواقـیعو هەلو مـەرجی مـیللەتو کۆمەڵگای ئێمەوە نیەو، ئەگەر گریمان دەرمانیش بن بۆ دەردو نەخۆشـییەکانی کەسـانێکی دیکەی جیاواز لەئێمە گیراوەتەوەو هیچ ماقووڵـیش نـیە ئینسـان هـەر لەخۆوە دەرمانو چارەسەرێك کە بۆ خەڵكو واقـیع و شـوێنێکی دیکـە دانـراوە، بەکاربێـنی! چـونکە ئـەوە هـیچ کە چارەسـەری ناکـات! بگـرە دوور نـیە کـە ئەو دەرمان لەگۆتره بەکارهێنانو لاساکردنەوەو چاولێکەرییە سەری بەفەتارەت بداتو بیشیفەوتێنێ!

ئـیدی بەهیوای ئەوە کەهەرکام لە ئاڵقەکانی ئەم زنجیرەیە ببێتە مایەی بەرچـاوڕوون بوونـەوەی خەڵکـێکی زۆری کۆمەڵگایەکەمانو دەربازبوون یان پارێزرانـیان لە دەردی کوشندەی چاولێکەرییو لاساکردنەوەو بەچاوی خەڵك بیـنینو بـەگوێی خـەڵك بیسـتنو بەعـەقڵی خـەڵك بیرکردنەوە! بەتایبەتیش خەڵکـێکی سـەرگەردانو دەردەدارو گرفـتاری وەك رۆژئاواییـیەکان، کەهەرچـەندە لـەڕووی مـادییو تەکـنۆلۆژیاو تیر کردنی لایەنی ئاژەڵییو غەریـزەکانییەوە پەرێـزو شـوێنەواریان دیـارو بەرچـاوە، بـەڵام بـێگومان هەرکەسـێك بەوردبیـنیو لەڕوانگـەی ئـیمانو بەویژدانەوە سەرنج لە ژیانو گوزەرانو لایەنی ئینسانییان بدات لە پووچەڵییو گەندەڵیی کۆمەڵگاکانیان دڵنـیا دەبـێو، دەزانـێ کـە لەسـەر قـەراغی کەندەلانـێکی بـن هـەڵۆڵی هەڵواسراون!

کۆتایی پێناسەی ئەم زنجیرەیەش بەم دوو تێبینییە گرنگە دێنم:

یەکـەم: شـتێکی ڕوونو بـێ چەندو چوونە کەبۆ تێگەیشتنی هەر وشەو زاراوەیـەك بەتایـبەت ئەوانـەی کـە بوونەتـە ڕەمـزو ناوونیشان بۆ مەسەلە

---

ئەوەیە کەزاراوەی (مافی مرۆڤ) وشەیەکی بەرزو دڵگیرە ئەگەر بەڕاستی بێو جەوهەرو کاکڵێکی شایستەو وەك پێویستی هەبێ.

گـرنگەکانو رێچـکەو بیردۆزەکـان، پێویسـتە سـەرنجی ڕەگو ریشـەکانیان بدەیـنو گـوێ بـۆ خاوەنەکانـیانو ئەوانـە بگـرین کە بۆ یەکەمجار بەکاریان هێـناون، نـەك هـەر لەخۆمانـەوەو بـە گۆتـرە چـەمكو واتـای دڵخواستی خۆمانـیان بۆ دابتاشین! چونکە لەحاڵێکی وادا گیرۆدەی هەڵەو چەواشەبوونی زۆر خراپ دەبین.

دووەم: شـتێکی بـێ جـێو ناماقووڵە کەپێش لێکۆڵینەوەی وردو قووڵ لـەبارەی دیـنو کلـتوورو فەرهـەنگو واقـیعو هـەلو مـەرجو گرفـتو کێشـەکانمانەوە، بەشـێوەیەکی سـەرکێڵانەو عاتـیفیيانە ئـەو وشەو زاراوەو بیردۆزانـە کـە پـێمان نامۆنو زادەو هەڵقوڵاوی واقیعێکی دیکەی جیاواز لە واقعی ئێمەن، یەکسەر لەزاری خەڵکی دیکەوە بیان قۆزینەوە، چونکە وەك پێشـتریش گوتمـان ئـەوە وەك ئەوە وایە کە کەسێك هەروا لەگۆترە دەرمانی بابایـەکی نـەخۆشو دەردەدار بەکاربێـنێ! هـەروەها کەسێکیش لەوەزعی ماڵـێ خـۆی ئاگـادار نەبێـت داخـۆ چیو چی تێدایەو چيیان هەیەو چيیان نـیەو، لـە خـۆوە بکەوێـتە سـواڵو سەدەقە لەملاولا، زۆ نیزیکە ئەو پەندە کوردیيـەی بەسـەردا بچەسـپێ کـەدەڵێ: (ماڵـیان پـڕ بـوو لەڕازیانـەو منداڵیشیان بەزگ ئێشە دەمرد).

خـوای بەخشـەریش (تـبارك وتعـالی) هـێزو پـێزی ئـەوە بخاتـە ئـەم بەرهەمـەوە کـە بیکاتە شایستەی پێکانی ئەو نیشانەو ئامانجانەی کەبۆیان نوسراوە.

٢٥ڕەجەبی ١٤٢٣ك، بەرانبەر ٢/١٠/٢٠٠٢ز

عەلی باپیر/ ئەحمەدئاوا

**سێ ئاگاداری :**

١) سەرەتا بە تەما بووم ئەم بابەتانە بەزنجیرەیەكو هەركامێكیان لە ئاڵقەیەكی سەربەخۆدا چاپ بكەین، بەڵام دوایی ئەو ڕایەمان گۆڕیو بەپەسەندمان زانی هەر پێنج بابەتەكە لە دوو توێی كتێبێك دا چاپو بڵاو بكەینەوە، بۆیە لە زۆر جێیان بۆ تێكڕایان وشەی زنجیرەو بۆ یەك یەكیشیان وشەی ئاڵقەمان بەكارهێناوە.

٢) لەسۆنگەی ئەوەوە كە وەك باسمان كردووە هەركام لەو بابەتوئاڵقانەی ئەم كتێبە لە ئەسڵ دا وتار بوونەو لەكۆڕێك دا دراون، تاراددەیەك شێوەی وتارو دواندن (خطاب)یان پێوە دیارەو بەپێویستیشم نەزانی كە دەستكاری بكەم، بۆیە با ئەو مەسەلەیەش لە بەرچاو بگیرێ.

٣) هەركام لەو وتارانەی كە لێرەدانو كراون بە كتێب لەلایەن ژمارەیەك لە ئامادەبووانی ئەو كۆڕانەوە كەتێیاندا دراون، كۆمەڵێك پرسیارو بەشداریكردن (مداخلە)یشیان بەدوادا هاتوون، بەڵام بەپێویست نەزانرا كەلەگەڵیان تۆمار بكرێن.

# ئاڵقەی (١)

# تیرۆرو تۆقاندن لەتەرازووی شەریعەتدا

***پێشەکی:***

سەرەتا بەخێرهاتنی گەرمی هەموو لایەك دەکەم بەتایبەتی مامۆستایانی بەرێز، خوای پەروەردگار ئەم کۆڕو مەجلیسەمان لەو کۆڕو مەجلیسانە بگێڕێت کە بۆ دنیاو دوارۆژمان مایەی تێدا بەهەرەمەند بوون بێت.

بەڕێزان! مەسەلەی تیرۆرو تۆقاندن-کە بەزمانی عەرەبی بە وشەی: (إرهاب) ئیرهاب تەرجەمە کراوە، وە لەزمانی کوردیدا تیرۆر مانای ترساندن و تۆقاندنە یەکێکە لەمەسەلە هەرە باوو ڕەواج پێدراوەکانی ئەم رۆژگارەی ئێمە، دیارە شەریعەتی خوای پەروەردگاریش هیچ مەسەلەیەك نییە کە نوختەی تێدا نەخستبێتە سەر پیتو هەڵوێستی لە بارەوە دەرنەبڕیبێت.

جا وەك عەرەب دەڵێن: (عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ) وە لەسۆنگەی ئەوەوە کەمەسەلەی: (تیرۆر) یان (ئیرهاب)یان (ترساندنو تۆقاندن) چەواشە کاریی زۆری تێدا کراوەو دەکرێ، وەخەڵکێك نەزانانە یاخود زۆرزانانە دەیانەوێت کەتیرۆرو ترساندنو تۆقاندن بکەن بەهاو واتا (مرادف)ی ئیسلام. وە منیش وەك مسوڵمانێك ئەوەندەی کە تەماشای قورئانو سوننەتی پێغەمبەرم(ﷺ) کردوە، وە ئەگەر سەرنجی مێژوی پڕشنگداری دەوڵەتی ئیسلامیش بدەین هەر لەو رۆژەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) بەردی بناغەی دانا لەشاری مەدینەدا تا ئەو رۆژەی کۆتایی پێهات لەسەر

دەستی (کەمال ئەتاتورك)بە پیلانی ئیمپریالیزمی جیهانی لەساڵی (١٩٢٤ )زدا، دەبینین کە ئیسلام وەکۆمەڵگای ئیسلامییو دەوڵەتی ئیسلامی زۆر دوور بووە لەترساندنو تۆقاندن، ئەدی بۆچی دەبێ کەسانێك بیانەوێ خەڵکی وا فریو بدەن کە بۆ ئەوەی تۆمەتی تیرۆر لەخۆیان دوور بخەنەوە، دەبێ لە ئیسلام دوور بکەونەوە، یان بەلای کەمەوە ئەگەر لە ئیسلامیش دوور نەکەونەوە وەك دینداریی شەخسییو وەك ئیمانو عەقیدە، دەبێ لە کاری ئیسلامی دووربکەنەوە، وە دەبێ لە جیهادو جەنگ کردن لە پێناوی ئیسلام دا دوور بکەونەوە.

لەو سۆنگەوە خوا پشتیوان بێت من لە (٥) خاڵاندا باسی (تیرۆرو تۆقاندن لە تەرازووی شەریعەتدا)دەکەم.

لەخاڵێ یەکەم دا پێناسەی تیرۆر دەکەین، کە ئایا لەڕووی زمانییەوە وشەی تیرۆر لە چ زمانێکەوە هاتوەو لەکوێ سەری هەڵداوە؟ هەروەها ئایا وشەی ناوبراو وەك زاراوەیەکی سیاسیکەی بەکارهاتوەو ڕەواجی پێدراوە؟!

لەخاڵێ دووەمیشدا باسی ئەوە ددکەین کە نێوەڕۆك و جەوهەری تیرۆریزم وەك دیاردەیەکی جیهانی تایبەت نیە بەهیچ گەلو کۆمەڵێکەوەو بەهیچ شوێنو جێگایەکەوە.

پاشان لەخاڵێ سێیەمدا باسی ئەوە دەکەین کە تیرۆرو تۆقاندن ئەگەر تەماشای مێژووەکەی بکەین لەنێوان هەرکام لەمسوڵمانانو نامسوڵماناندا، ئەوکاتە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە جیاوازییان نێوانی ئاسمانو زەوییەو مسوڵمانان کەمترین پشكو بەشیان پێ دەبڕێو، زۆربەی هەرەزۆری بەر نامسوڵمانان کەوتوە.

وە دواتر لە خاڵێ چوارەم دا باسی تیرۆر دەکەین کەلەشەریعەتی خوای پەروەردگاردا جێگای نابێتەوەو هیچ شوێن پێیەکی دەست ناکەوێت وە لە کۆتاییشدا ولەخاڵێ پێنجەم دا وەڵامی چەند پرسیارو ئیشکالێك دەدەینەوە

وەك مەسـەلەی جـەنگو جـیهادو مەسـەلەی پـەنهانكوژی (إغتـیال)، وە مەسـەلەی كوشتنی جەنگی بێ دیفاعو خەڵكی مەدەنیو هاووڵاتی كە ئایا ئـەو مەسـەلانە لەڕوانگەی شەریعەتەوە چۆنن وە حوكمیان چیيە، وە بۆچی كەسـانێك دەیانـەوێ بەبـیانووی ئـەو شتانەوە مسوڵمانانو ئیسلام بەتیرۆرو ئیرهاب تۆمەتبار بكەن؟!!

## خاڵی یەكەم: پێناسەی تیرۆر

چونكە وەك زانایانیئوصوولْ[٦] فەرموویانە: (الحكم على شيءٍ فرعٌ عن تصورِهِ) بەڵێ ئینسان ناتوانێ هەڵوێستێكی ڕاستو ڕێكو مەنتیقیو ژیرانە لەبەرانـبەر هـیچ شـتێدا وەربگرێـت تاچـاك نەیناسـێ، هەربۆیەش زانایانی (أصـول الفقـه) لەمەسـەلی (قـیاس)دا عیبارەتێكـیان هەیـە كەبریتیە لە: (تنقـیح المـناط) یـان (تحقـیق المـناط) واتـە: ئـەو شـتەی حوكمەكـەی پێوە بەسـتراوە دەبێـت سـاغ بكرێـتـەوەو دیـاری بكرێتو جوان بپاڵێورێو سپی بكـرێ ئـەو جـا دەگونجێ وەك پێویست هەڵسەنگێنرێ، چونكە زۆر جار دوو كـەس لەسـەر شـتێك دەبێـتە كێشـەو مشتو مڕیان بەڵام دوایی تێدەگەن كەلەیـەكتر حاڵی نەبوون! بۆیە عەرەب گوتوویانە(فهم السؤال نِصْفُ الجَواب) ئەگـەر ئینسـان لەپرسـیارێك تێنـەگات بـێگومان ناتوانێ وەڵامی ڕاستو دروستی بداتەوە، كەواتە بابزانین وشەی تیرۆر چیيە، وە لەكوێوە هاتوە؟!

هـەموو فەرهەنگـەكانی زمان بۆ وێنە: فەرهەنگی (المعجم الوسيط)[٧] وفەرهـەنگی (مجمع اللغـة العربـية)[٨] وقاموسی (ئۆكس فۆرد)ی بەریتانیو

---

٦) واتە زانایانی (أصول الفقه) كەلەبارەی چۆنیەتی هەڵهێنجانی حوكمە شەرعیيەكانەوە دەكۆڵێتەوە.

٧) ص٢٧٦.

(لغـه نامـه)[9]ی (دَهخُدا) کـه گەورەتـرین قامووسـی فارسییە، هەروەها فەرهـەنگی (عمـید)[10] وە فەرهەنگەکانی دیکەش هەموویان لەسەر ئەوە یـەك دەنگـن‌و یەك قسە دەکەن‌و دەڵێن: وشەی تیرۆر لەئەسڵ دا وشەیەکی فەڕەنسـییە، کەسـپێڵەکەی بەم شێوەیە دەنوسرێ: (Terror)وە دەڵێن: تیرۆر واتاکـەی ترسـاندن‌و تۆقـاندن‌و هەڕەشـە لەخەڵك کردنە، کەجاری‌واش هەیە ترساندن‌و تۆقاندنەکە سەر دەکێشێ بۆ کوشتارو فەوتاندنیش!

ئـەوە مەعـنای زمانیـیەتی، جـا هەرچـەندە وشـەکە لەئەسـڵ دا فەڕەنسـی‌یە، بـەڵام دوایـی لە زمانەکانی دیکەشدا بەکار هێنراوەو ڕەواجی پێدراوە، وەك گەلێك وشەی دیکە.

مانـای سیاسـی ئـەو وشـەیەش لەقامووسی سیاسی‌دا بەکورتی بریتیە لە : (کوشـتنی سیاسـییانە بـەهۆی بەکارهێـنانی چـەکەوە) هەندێکیان ئاوایان پێناسـە کـردوە، بـۆ وێنە: (مجمع اللغة العربية) کە قامووسێکی بەناوبانگی زمانی عەرەبییە.

هەروەها( المعجم الوسيط) دوای ئەوەی کەلەڕووی زمانەوانییەوە وشەی (تـیرۆر) دەبەنـەوە سـەر ئیرهـاب، وشـەی ئیرهاب (إرهاب)یش وەك زانایان گوتوویانە: (أَرْهَبَ فُلانٌ فُلاناً يَرهبُهُ أَيْ: خَوفَهُ وفَزعَهُ).

واتـە: فلاَن کەس فلاَن کەسی ترساندو تۆقاندی‌و زراوی برد، دوای ئەوە گوتوویانـە (الأرهابـيون وصـف يُطلَقُ عـلى الذيـن يَسْلُكُون سَـبيلَ العُنْفِ والأرهـاب لتحقـيق أهدافهم السياسية) واتە: (ئیرهابییەکان، ئەوە وەسفێکە بـۆ کەسـانێك بەکاردەهێنرێت کەڕێگای توندوتیژی‌و تۆقاندن دەگرنەبەر بۆ هێنانەدی مەرامە سیاسی‌یەکانیان).

---

٨) کە (المعجم الوسيط) لێیەوە نەقڵ کردووە.

٩) ج ٥ ص٦٦٨٣.

١٠) ص ٤٣١ط٨.

کەواتــە هەرکەســێك ڕێگای توندو تیژیو ڕێگای کوشتنو بڕینو ڕێگای داپۆڵســینو تۆقــاندن بگرێــتەبەر بــۆ هێــنانەدیی ئامــانجی سیاســیی ئــەوە تیرۆریســتە، وەڕێبازەکەشــی تیرۆریزمەو کارەکەشی تیرۆرە، ئیدی ئەو کەسە هەرکەســێك بێــت مســوڵمان بێــت یــان کافــر بێــت، ڕۆژهــەڵاتی بێــت یان ڕۆژئاوایی جیاوازی نیە وهەمان حوکمی هەیە مادام ئەو وەسفو پێناسەیەی بەسەردا بچەسپێ.

فەرهــەنگی (عمــید) کەفەرهەنگــێکی فارسیـیە: بەم شێوەیە پێناسەی (تــیرۆررزم) دەکــات، (تیرۆریســم ڕوش کســانی کە ادمکشی وتهدید مردم و أیجــاد خــوف وحشــت را بهر طـریقی کەباشد برای رسیدن بەهدفهای سیاسی خــود أز قبــیل تغــییر حکومــت یــا درورست گرفتن زمام أمور، لازم ومباح میدانــند)[١١] واتــە: تیرۆریــزم ڕێــبازی کەســانێکە کــە خــەڵك کوشــتنو هەڕەشــەکردنی مــەرگ لەخــەڵك وەپەیداکــردنی تــرسو دڵەڕاوکەو تۆقاندن بەهەرشــێوەیەك کــەبۆیان بگونجــێ بەکار دەهێننو بەڕەوا دەزانن بۆ گەیشتن بەئامانجیسیاســی وەك گۆڕیــنی حکوومــەت یاخود بەدەست گرتنی جڵەوی حوکمڕانی.

## ئەو وشەیە کەی پەیدابووە؟!

لەکتێبی (تأریخ جیهان)[١٢] دا کەکتێبێکی فارسی گەورەیە هاتوە وەك قامووســەکانی زمانــیش ئاماژەیــان پــێکردووە کــە یەکەم جار وشەی تیرۆر لەســاڵێ (١٧٩٣)ز داو لــەوڵاتی فەڕەنسـا بەکارهێــنراوە، چــونکە شۆڕشی فەڕەنســی لەســاڵی(١٧٨٩)کراو، جا ماوەیەك دوای بەرپابوونی ئەو شۆڕشە یەکــێك بــەناوی (ڕوبســپیر) جڵــەوی حوکمــڕانی لەفەڕەنســا گــرتە دەســت،

---

١١) بڕوانە ص٤٣١ ط ٨ ساڵ:١٣٧٥.

١٢) ئەو کتێبەم لەسەر (CD) ییەك تەماشاکرد، کەبەفارسی نووسراو.

ئەوكابــرایە ڕێــبازی توندوتــیژیو تــیرۆرو تۆقــاندنی گرتەبەر، وەحوكمەكەی لەســاڵی (١٧٩٣) تــا(١٧٩٤) واتــە نــزیكەی ســاڵێك زیاتــری خایــاند، وەهەركەسێك گومانی لیٚ كردبایە كە دژی شۆرشە (شۆرشی فەرەنسا) دەیان كوشــت! ئــەوە بــوو لــەماوەی حوكمــڕانییەكەیدا (٣٥,٠٠٠) سیو پێنج هەزار كەسیان بەبیانووی ئەوەی كە دژی شۆرشن، كوشت، هەركەسێك بەس گومانــیان لــێكردبایە دەیــان كوشــت وەیەكــێك لەوانــەی بەو بیانووە كوژرا (دانــتۆن) بــوو كەڕێــبەری خۆشەویستی شۆرشی فەرەنسا بوو، یەكێكیشیان (لوئەی شازدەیەم) بوو كەپادشای فەرەنسا بوو.

وە ئەوانــەی كــە دەكــوژران بەئامــێرێك دەیانكوشــتنو ســەریان دەبڕین بــەناوی (گــیوتین) كــە ئالەتــێكە لەهــەندێك لەفەرهەنگــەكان دا وێــنەی كێشــراوەو شــوێنێكی تــێدایە كەئینســانیان وەك جــەنازە تێداراكێشــاوەو ئاســنێكی تــیژیش لەســەردوە بــووە پلاكێكی لێبوە كەدەستیان پێداهێناوە بەربۆتــەوەو مــلی كابــرای قــرتاندووە ئیدی (٣٥)هەزار كەسیان بەوشێوەیە كوشــتوە! دوایی لەساڵی (١٧٩٤)دا (ڕوبسپیر) بۆ خۆیشی هەر بەو ئامێری (گــیوتین)ە ئــیعدام كــراوەو پاشــان ئــەو ســەردەمە كە بەزمانیفارسی پێی گوتراوە (دورانی وحشت) وە بەزمانی عەرەبی پێیانگوتوە: (عصــر الأرهاب) وە بەفەرەنسی پێیان گووتوە: (چاخی تیرۆریزم)، كۆتایی پێهاتوە.

كەواتە ئەگەر واقیع بینانە تەماشای ئەو وشەیە بكەین وەتەماشای ئەو ڕێــبازە بكــەین، وەك لایەنی زمانیو وەك زاراوەیەكی سیاسیی بۆمان ڕوون دەبێــتەوە كە وشەو زاراوەی(تیرۆر) هیچ پەیوەندی نیە بەعالەمی ئیسلامیو بەجــیهانی ڕۆژهەڵاتــەوە بەگشــتی بــەڵكو وشەیەكی فەرەنسیو زاراوەیەكی فەرەنسیشە.

## خاڵی دووەم:- ناوەڕۆکی تیرۆر دیاردەیەکی جیهانیو گشتیو لەمێژینەیە

پێشتر باسی تیرۆریزمان وەك وشەو زاراوەیەکی سیاسیو شێوازێکی هەڵسو کەوت کرد ئێستاش باسی نێوەڕۆكو جەوهەری تیرۆریزم کە دیاردەیەکی هەم جیهانییو گشتییە، واتە تایبەت نیەو نەبووە بەگەلو کۆمەڵو کاتو شوێنێکەوە، هەم دیاردەیەکی لەمێژینەیە دەکەین! **تیرۆریزم** واتە: فەرزکردنی بیروڕای خۆت لەسەر غەیری خۆت بەزۆرو زۆرداریيو بێ ئەوەی قەناعەتی پێ بێت لەسەری فەرز بکەیو دای بپڵۆسیو ئیرادەی پێشێل بکەی، ئا ئەوە تیرۆریزمە، وە تیرۆریست کەسێکە کەهەوڵی سەپاندنو فەرزکردنی بیرو باوەڕو قەناعەتی خۆی دەدات، جا چ قەناعەتێکی دینی بێت، چ سیاسی بێت، چ فەلسەفی بێت، چ مەزهەبی، چ هەر شتێکی تر بێت، هەرکاتێك قەناعەتی خۆت یان قەناعەتی پێڕو دەستەو کۆمەڵی خۆت بەتۆبزی فەرز بکەیت لەسەر غەیری خۆت بێگومان ئەوە حاڵەتێکی تیرۆریستانەیە.

کەواتە نێوەڕۆکی تیرۆریزم و کاکڵو جەوهەرەکەی دیاردەیەکی گشتیو جیهانییە، چونکە ئەگەر ئێمە تەماشای مێژووی دنیا بکەین دەبینین کە ئەو حاڵەتە هەر هەبووە، چونکە ئەو حاڵەتە پەیوەندی بەغەریزەی شەڕخوازانەی یاخی بوونو لەخۆبایی بوونو غەرڕابوونی ئینسانەوە هەیە، ئەو غەریزەیەش وەك گەلێك غەریزەی دیکەی شەڕخوازانە لەسروشتی مرۆڤدا دانراوە وەك چۆن زۆر غەریزەی خێرخوازانەش لەگەڵ فیترەتی شێلراون تاکو بگونجێ بەهەردووك باری خێرو چاکەو شەڕو خراپەدا بجووڵێو بەکەڵکی ئەوە بێت کەتاقی بکرێتەوەو بجەرِبێنرێ، وەك خوای کاربەجێ

فەرموویەتی: ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ (الشمس:٨) واتە: خوا ئینسانی فێری خراپەکاریی‌و پارێزکاریی کردووە، بەڵی خوای پەروەردگار سروشتی ئینسانی‌وا هەڵخستوەو خوڵقاندوە کەبتوانێ هەمو جۆرەکانی‌خراپە بکاو هەمووجۆرەکانی چاکەش بکات.

ئینسان لەنێو بوونەوەردا مەخلوقێکی‌ناوازەیەو مەوداو مەسافەیەکی ئەوەندە بەرینی هەیە بۆ هاتوچۆ، بۆ بەرزبوون‌و نزم بوون، کەهیچ مەخلووقێك نیەتی، مەلائیکەت هەر مەلائیکەتەو دەبێ هەر لەو ئاستە بەرزەی خۆی‌دا بێت کەخوا پێی بەخشیوە، دارو بەردو گیاندارانیش هەر داروبەردو گیاندارن‌و کەهەکەشان و ئەستێرەو خرۆکەکانیش هەر لەپلەو شوێنی‌خۆیاندا دەمێننەوەو مەوداو بواری هەڵکشین‌و داکشین‌و بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەیان نیە، بەڵام ئینسان دەتوانێ هێندە بەرز بێتەوەو بەڕادەیەك چاك‌و پاك بێت کەشایستەی ئەوە بێت فریشتەکان سوجدەی بۆ بەرن، وە دەتوانێت هێندە نزم بێتەوە کەخوا-جل جلالە-و فریشتەکان وهەموو دروستکراوەکانی لەعنەتی لیّ بکەن، وەك خوای دادگەر دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْأنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ،ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ، إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ (التين:٦) واتە: بێگومان ئینسانمان لە جوانترین‌و چاکترین شێوەدا[١٣] خولقاندووە، شێوەیەك کەدەتوانێت بەهۆیەوە جێنشینی خوا بێت لەسەر زەوی، واتە شەریعەتی‌خوا

---

١٣) دیارە مەبەست لە شێوە (تقویم) تەنها دیمەن‌و ڕواڵەتی جەستەیی نیە، بەڵکو مەبەست شێوەو پێکهاتەی دەروونیی‌و ڕواڵەتیی‌یەتی کەمرۆڤ پێیان لەدروستکراوەکانی دیکە خوا جیاکراوەتەوەو ئەو حاڵەتە تایبەت‌و ناوازەیەی وەرگرتوو.

لەســەر زەوی پــیادە بکــات وەك (القــاسمي)و (القــرطيي)و (ســيد قطــب) لەتەفسیرەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردووە[١٤].

وە دەشــتوانێت بــەهۆی ئیرادەیئازادانەیەوە لەجیاتی بەرزبوونەوەی نزم بێــتەوەو وەك شــەیتان بێت، وە بچێتە پلەیەکینزمی هەرە نزم: ﴿ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ﴾ واتە: دوایی گێرامانەوە بۆ نزمی هەرە نزمان!.

جــا یەکــێك لــەو هــاندەرو غەریــزە شەڕخوازانەی کەخوای پەروەردگار بەمەبەســتی تاقــیکردنەوەی ئینســان، لەئینســاندا خوڵقــاندوونی بریتیە لە غەریزەی یاخیبوونو لەخۆبایی بوون، وەك خوایکاربەجێ فەرموویەتی ﴿كَلَّا إِنَّ الْأِنْسَــــانَ لَيَطْغَى، أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى﴾ (العلق:٦-٧) واتە: نەخێر، ئینسان یاخی دەبێت کاتێك کە خۆی بێنیازو باڵادەست دەبینێت.

ئەگەر تەماشای سەربردەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بکەین دەبیــنین هەمیشــە نــەیارانی پێغەمــبەران( (عليهم الصلاة والسلام) بەزۆری دووچــین بوون، چینی خۆش گوزەرانان، وەچینی خاوەن دەستەڵاتان، کە خوای دادگــەر وشــەی (مترفــين)و (مســرفين)ی بۆ پێناسەی چینی یەکەمی نەیارو ناحــەزانی پێغەمــبەران بەکارهێــناوە، چــونکە ئــەوان بــەهۆی مــاڵو سامانەکەیانەوە لەخوا عاسێ دەبنو لەخەڵك یاخی دەبن!.

وە بــۆ ئــەوانی دیکــەش وشــەی (مستكبرين)ی بەکارهێناوە، واتە: خۆ بــەزل گــرانو خــۆ گەورەکەرانی بەناهەق، چونکە وشەی (مستكبر) (كبر)ەو (س)ی (طلـب)ی چــۆتە ســەرێ! واتــە گەورەو زل نیە بەڵام خۆی گەورەو زل کــردووە، هــەروەها بــۆ پێناســەی کەسانێکیش کە دەچەوسێنرێنەوە، خوای پــەنهان بــین وشــەی (مستضــعفين)ی بەکارهێــناوە، کــە ئەمــەیش (س)ی

---

١٤) (تفسير القاسمي) ج١ص٩٥، وة (الجامع لأحكام القرآن)ج١ ص٢٢٣، وة (في ظلال القرآن)ج١ص٥٦.

(طلب)ی لەسەرە، تاکو دەری بخات کە ئەوانیش لەئەسڵ دا زەعیف نین بەڵام زەعیف کراون!.
دیارە ئەو ئایەتەی کە فەرموویەتی: ﴿وَخُلِقَ الْإِنْسَانُ ضَعِيفاً﴾(النساء: من الآية٢٨)

ناکۆکی نیە لەگەڵ ئەو مەبەستەدا کەخەریکی توێژینەوەو ئیسپات کردنینی، چونکە مەبەست لەو بێ هێزیەی ئینسانەکان ئەو حاڵەتەیە کەهەموویان تێیدا یەکسانن، بەڵام ئەو بێ هێزکردنەی کەلەلایەن طاغووت و فیرعەونەکانەوە بەسەر خەڵکی بێ چارەدا سەپێنراوە، مەبەست حاڵەتێکە کەبەناحەق دەیان چەوسێننەوەو زەعیفیان دەکەن! با تەماشای ئەم ئایەتە بکەین کە خوای پەروەردگار لە ئایەتی (٣٤)ی (السبأ)و هەر هەمان ئایەت لەسوورەتی (الزخرف)دا بەشێوەیەکی تر هاتووە، دەفەرموێ ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ﴾ (سبأ:٣٤) واتە: ئێمە هیچ ڕەوانەکراوێکمان لەهیچ ئاوەدانی‌یەك دا نەناردووە مەگەر خۆش گوزەرانەکانی گوتوویانە: ئەوەی ئێوە پێی ڕەوانەکراون ئێمە بڕوامان پێی نیە.

بەڵێ بەڕێزان! پێویستە هەموو لایەکمان ئەو ڕاستی‌یە گرنگە زۆر باش بزانین کە یەکەمین کەسانێك کە دژی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) وەستاونەتەوەو بەربەرەکانێیان کردوون (مترفین)بوون، ئەوانەی لەسەر حیسابی خەڵکی ڕەش و ڕووت سەروەت و سامانی حەڕامیان وەسەرێك ناوەو کۆشك و تەلاریان پێ دروست کردوە.

جا پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کە هاتوون بانگی زوڵاڵی ئازادیی و پەیامی سەرفەرازیی و ڕزگاریی لە چەوسانەوەیان بەگوێی ئەو خۆش گوزەرانانەدا داوە، بێگومان ئەوان دەستبەرداری نازو نیعمەت و کەیف و سەفاو سەروەت و سامانی ناشەرعی‌یانەی خۆیان نەبوون! بۆیە

سەرسەختانە لە دژی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەستاون وەلەگەڵیاندا دەستەو یەخە بوون.

ئەمە لەبارەی خۆشگوزەرانانەوە کە جۆری یەکەمی دوژمنانو ناحەزانی پێغەمبەرانی خواو شوێنکەوتوانیانن، جۆری دووەمیش کەوەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد دەستەڵاتدارە خۆپێ زۆرو خۆ بەزلگرەکانن، واتە کەسانێك کەوەك چۆن (مترفین) لەرێی حەرامو ناشەرعیی‌یەوە ماڵیان وەسەرێك ناوەو دەوڵەمەند بوونە، ئەوانیش لەرێی ستەمو ناهەقیی‌یەوە دەستەڵاتی سیاسیی‌یان بەدەستەوە گرتوەو خۆیان بەسەر خەڵکدا فەرز کردوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لَنُخْرِجَنَّكَ يَا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَكَ مِنْ قَرْيَتِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَارِهِينَ﴾ (الاعراف:٨٨) واتە: خۆ بەزلگەرەکان (واتە ئەوانەی کە دەستەڵاتیان هەبوو وبەهۆی دەستەڵاتەکەیانەوە لەخۆیان بایی بوون) گوتیان: ئەی شوعەیب! خۆتو ئەوانەی لەگەڵتۆ ئیمانیان پێت هێناوە یان لە ئاوەدانیخۆمان دەرتان دەکەین یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕێبازی ئێمە! ئەویش فەرمووی: ئەدی چارەمان چی‌یە کە حەز لەڕێبازی ئێوە نەکەینو قەناعەتمان پێی نەبێ؟!

وەك دەبینین نەیارانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) زۆر بەڕاشکاویی‌و بێ شەرمانە بەخۆیانو پەیڕەوانیان دەڵێن: کەمافی ئەوەتان نیە بەئازادیی بیر بکەنەوەو جگە لەڕێبازو بەرنامەی ئێمە شوێن شتێکی دیکە بکەون، ئەگەر نا دووچاری سزاو تۆڵەو دەرکران دەبن!

کەواتە ئەوانە نەیارو ناحەزانی ئاینو بەرنامەی خوا بوون کەمافی بیرکردنەوەی ئازادو هەڵبژارنی ڕێبازی ژیانو گوزەرانیان لە ئەهلی ئیمان زەوت کردوەو، بەپێچەوانەی پڕوپاگەندەی چەواشەکارانەی دوژمنانی دین سەبارەت بەئیسلام چونکە پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام) هیچ کاتێك

مــافی بیرکــردنەوەو بــیروڕای ئــازادو ئیمان دێنێ یان ناهێنێ یان لەخەڵکی زەوت نەکردوە وەك دوایی باسی دەکەین.

لەبەســەرهاتی (ئیــبراهیم -علــیە الصــلاة والســلام)و (نەمــروود)دا چ دەبیــنین؟! کاتــێك (إبراهیم) لەگەڵ (نەمروود)و دارو دەستەکەیدا ڕووبەڕوو دەبێــتەوەو لــەبواری گفــتو گــۆو وتوێــژدا هــیچ بەڵگەیەکــیان بەدەســتەوە ناهــێڵێ‌و بەتــەواوی بــێ قســەو بــیانوو بــڕاویان دەکاتو (إقامة الحجة) یان لەســەر دەکــات دوایــین هەڵوەێســت و وەســیلەی نەمروودو دارو دەستەکەی بریــتی بــووە لــە هەڕەشــەو گوڕشــەو سزادان وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿قَــالُوا حَرِّقُوهُ وَانْصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِنْ كُنتُمْ فَاعِلِينَ﴾ (الانبياء:٦٨). واتــە: (نەمــــروودو دارو دەســـــتەکەی) گوتــــیان: ئیــــبراهیم بســــــووتێنن‌و پەرستراوەکانی‌خۆتان سەربخەن ئەگەر دەتانەوێ شتێك بەشتێك بکەن!.

بــەڵی بەڕێــزان! ئــەوە هــەر نەمــروودو فیرعەونەکان بوون کەلەبەرانبەر (إبراهــیم)و (موســی)یــەکان دا (علیهم الصــلاة والسلام) پەنایان بردۆتە بەر ئاگــرو ئاســن‌و دارو قامچــی!چــونکە بیروبــاوەڕی بــت پەرســتانەی ئــەوان بیروباوەڕێکــە زادەی هــەواو ئــارەزوو گومانی‌خۆیــان وەك شتێکی چاوەڕوان کــراو لەبەرانــبەر ئــایین‌و بەرنامــەی راســتو هــەقی هەڵقولاّو لەزانیاریی‌و ڕەحمــەت و حــیکمەتی بــێ سنووری خوادا شکستی خواردوە، جاکاتێك لەو مەیدانــەدا شــکاون پەنایان بردۆتە بەر دوایین چەکیان کە بریتیە لەهەڕەشەو گوڕەشــەو ترســاندن‌و تۆقــاندن‌و پاشــانیش ئاگــرو ئاســن‌و پــەتو ســێدارەو قەمچی!!، کە هەر ئەوەشە لەسەردەمی ئێمەدا ناویان ناوە تیرۆرو تۆقاندن‌و کوشتن‌و بڕین.

یــان تەماشــا بکــە کاتێك کە (موسی)- علیە الصــلاة والسلام- لەگەڵ فیرعــوندا ڕووبــەڕوو دەبێــتەوە هــیچ قســەو بیانوێك بەدەست فیرعەونەوە ناهــێڵێ تــەنها بەمەنتیق‌و دەلیل‌و بەڵگەش چونکە (موسی)-علیە السلام-

بـەس خـۆی‌و گۆچـانەکەی‌و هـاروونی برایشــی لەگـەڵ بووە-سەلامی‌خوایان لەســەربێ- وجگە لە پەیامی هەقی خواو بەڵگەی ڕوون هیچیان پێ نەبووە، نەهــێزو دەســتەڵات‌و نەســوپاو لەشـکر، تەنها هەقیان بەدەستەوە بووە، جا کاتــێك بــەوجۆرە لەگـەڵ فیرعــەوندا ڕووبەڕو دەبنەوە دوایین قسەی فیرعەون وەك عـادەتی هەمیشەیی طاغووت‌و دیکتاتۆرەکان پەنا بۆ هەڕەشە دەبات‌و دوایــین بڕیاری لەبەرانبەر (موسی)و ئەو ئایین‌و پەیامە هەقەدا کەهێناویەتی ئەوەیەکە دەڵێ:﴿ قَالَ لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَهاً غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ ﴾ (الشــعراء:٢٩)، واتــە: (ئەگـەر بێـت‌و جگــە لەمن پەرستراوێکی دیکەت هەبێـت ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم)، واتە دەتخەمە گەڵ ئەو کەسانەی کەوەك تۆ سجنم کردوون! وا دیارە گەلێك کەسی دیکەی وەك مووسای بەزوڵم زیندانی کردوون!.

بــەڵێ ئــەوە دوایــین هەڕەشــەی فیرعەونە کەلە مووسای دەکات، ئینجا مووساش(علیه السلام) وەك خوای پەروەردگار لێی دەگێرێتەوە تەنهاو تەنها پــەنای بردۆتە بەرخواو فەرموویەتی: ﴿وقال مُوسَى إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ مِــنْ كُـــلِّ مُتَكَـــبِّرٍ لا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ﴾ (غافر:٢٧) واتە: وە مووسا گووتــی: مــن پەنا دەگرم بەپەروەردگاری خۆم‌و ئێوەش لەهەر خۆ بەزلگرێك کە ئیمانی بەڕۆژی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نیە).

بــەڵێ ئەوە طاغووتە خۆ بەزلگرەکانن کەهەمیشە پاش تێشکان‌و بەزین لەمــەیدانی وتوێــژو بەڵگــە هێــنانەوەدا پــەنایان بــردۆتە بــەر ئاگرو ئاسن‌و ئەشـــکەنجەو ئـــازاردان‌و گـــرتن‌و لـــەولات دەرکـــردنی پێغەمـــبەران‌و شــوێنکەوتوانیان، وەپــاش نــەمانی هێزی بەڵگە (قوة الدليل) هانایان بردوە بــۆ بەڵگــەی هێز (دليل القوة) بەواتایەکی دیکە: لەبەرانبەر قووەتی مەنطق دا پەنایان بردۆتە بەر مەنطقی قووەت!

هـەروەها پێغەمـبەری خاتەمو کۆتاییش(ﷺ) لەگەڵ نەیارو ناحەزانیدا هـەر بەهـەمان شـێوە بـووە: کاتـێك لەگـەڵ ئـەبوو جەهلو وەلیدی کوڕی موغـەیرەو باقی سەرانی قورەیش دا ڕووبەڕوو دەبێتەوەو هیچیان بەدەستەوە نامێنێـت لەمـەیدانی حـیوارو وتوویـژدا دەبـەزنو تێدەشـکێن، کافـرو موشـریکەکان هـەمان شـێوازی پێشووەکانیان ڕەچاو دەکەن! بۆیە بەڕاستی زۆر زۆر جـێی سەرسـوڕمانە کەلـەم چاخو زەمانەی ئێمەدا ئیسلامییەکانو مسـوڵمانان بـەوە تۆمەتبار بکرێن کەبڕوایان بەوتوویژ نیەو بڕوایان بەزمانی مەنتـیق نـیەو بـڕویان بەیـەکتر دوانـدنو گفتوگۆ نیەلو توندوتیژی دەدرێتە پاڵیان!

ئایـا دەبێ دینی خوا، هێندە بێ بەڵگەو دەلیل بێ لەمەیدانی وتووێژدا تـێ بشـکێ؟! نـەء یـان ئـەوەتا ئەوە تۆمەتێکە بەناهەق ئاڕاستەی ئیسلام دەکـرێ، یـان کەسـانێکی مسـوڵمان هەن کەمسوڵمانی کرچو کاڵو ناشێنو بـاش لـە دیـنەکەی خۆیـان تێنەگەیشـتوونو بـیانوویان بەدەسـتی تەرەفی بەرانبەرەوە داوە!.

ئەگـەر نـا وانیە کە ئایینو بەرنامەی خوای بێ وێنەو باڵا دەست توانای ئاخـاوتنو وتویـژی نـەبێو هێزی بەڵگەی بەدەستەوە نەبێو پەنا بۆ بەڵگەی هێز بەرێ!.

بەڵێ ئەگەر سەرنجی مێژوو وسیرەی پێغەمبەری کۆتاییش (ﷺ) بدەین، دەبیـنین کەهـەمان سیاسـەتو شـێوازی کـۆنو لەمێژینەی ئەهلی کوفر کە لەگـەڵ پێغەمـبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) بەکاریان هێناوە (قورەیش)و موشـریکەکانی سـەردەمی پێغەمـبەریش (ﷺ) پـەنایان بـردۆتە بەرهـەمان شـێوازو ڕێـبازو وەسـیلە، بـۆ نموونـە: خـوای بـاڵا دەسـتو دادگـەری دفـەرمووێ:﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُـرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ (الأنفال: ٣٠) واتـە: (ئەی

(محمد ﷺ) یادی ئەوکاتە بکەوە کە ئەوانەی بێ بڕوا بوون پیلانیان لە تۆ دەگێڕا کە یەکێك لەو سێ شتانەت لە دژ بکەن: یان زیندانی (سجن)ت بکەن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن).

کەواتە: ئەوە نەیارانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون کەپاش هیچ پێ نەمانو تێشکان لەمەیدانی وتوێژو بەڵگەکارییدا، پیلانیان گێڕاوەو هەوڵیان داوە یەکێك لەو سێ شتە: گرتن، کوشتن، دەرکردن،ی لەگەڵدابکەن.

وە لەسووڕەتی (إبراهیم)یشداخوای پەروەردگار بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و نەیارانیان لە ئوممەتەکانیان باس دەکاو ئینجا هەموو ئەهلی کوفر بەیەك مەنتیق قسە لەگەڵ هەموو پێغەمبەران دا (علیهم الصلاة والسلام) دەکەن، لەهەڵبژرانی یەکێك لە دوو ڕێیاندا سەرپشکیان دەکەن کەوەك گوتراوە: (أحلاهما مُرٌ) خوای گەورە دەفەرموێ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا﴾(ابراهيم:من الآية١٣).

واتە: وە ئەوانەی کەبێ بڕوان بە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت: یان لەسەر زەمینی خۆمان دەرتان دەکەین یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینەکەمان!.

دیارە حیکمەتی کۆکرانەوەی تێکڕای پێغەمبەرانی خوا (علیهم من الله أفضل الصلوات وأتم التسلیمات) لەبەرانبەر سەرجەم ئەهلی کوفردا لەم ئایەتەدا ئەوەیە کە دەربکەوێ کەهەم ئایینو پەیامی پێغەمبەران لەنێوەرۆکدا یەك شتەو، هەم شێوازی ڕووبەڕووبونەوەی نەیارو ناحەزانیشیان لەجەوهەرو نێودرۆکدا یەکە.

پاشان خوای پەروەردگارو دادگەر لەوەڵامی ئەو هەڕەشەیەی ئەهلی کوفردا کە ناراستەی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوایان کردوە، ڕوو لەپێغەمبەرەکانی خۆی (علیهم الصلاة والسلام) دەکاتو پێیان دەفەرموێ:

﴿فَـــأَوْحَى إِلَـــيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ﴾(ابراهيم: من الآية١٣) واتــه: پــەروەردگاريان پــێی ڕاگــەياندن-واتــه بەپــێغەمبەران (عليهم مــن الله أفضل الصلوات وأتم التسليمات) كەبە تەئكيد ئێمە ستەمكاران دەفەوتێنين!.

بــەڵێ لەحاڵــێك دا كــە ســەركردە ديكتاتۆرو خۆسەپێنەرو ملهوڕەكانی ئەهــلی كوفــر لەبەرانــبەر پــەيامی هەقو پڕ خێرو خۆشیو عەدالەتی خوای بەخشــندەدا دەســت بــۆ چەكو هێزو هەڕەشەو گوڕەشەو ترساندنو تۆقاندن-بەزاراوی ئەم سەردەمە (تیرۆرو ئیرهاب)- دەبەن، وە پێغەمبەرانی خوا(ﷺ)و شــوێن كەوتووانيشــيان چەكو هێزێكی ئەوتۆيان نيه كە ديفاعو بەرگری پێ لــە پــەيامو بەرنامەكەيان بكەن، ئەوە بەگوێرەی ياسا(سنة)يەكی خوايی كە بريتــيە لەتۆڵەســەندنەوە لەســتەمكاران (ليهلكن الظالمين) خوای تۆڵەستێن لەوكاتــەدا كــە خــۆی بەچاكی دەزانێ (تدخل) دەكاتو ئەهلی كوفر بەربادو ئەهلی ئيمان دەرباز دەكات!.

### بەكورتی:

(تيرۆريزم) يان (الارهاب) كە بريتيە لە فەرزكردنو سەپاندنی بيروباوەڕو قسەو بۆ چوونی خۆت بەسەر غەيری خۆتداو پێشێل كردنی ئازاديی طەرەفی بەرانــبەرو پلێشــاندنەوەی ئــيرادەو كەســايەتیو كەرأمــەتی، بــەڵێ ئــا ئەم ڕەفــتارو دياردەيــە وەك نــێوەڕۆكو جەوهەرەكــەی ديــاردەو حاڵەتــێكی لەمێژيــنەو گشــتیو جيهانیيەو هەميشەش نەيارو ناحەزانی پێغەمبەرانی خــواو دوژمــنانی ئاينو ڕێبازەكەی پاش تێشكانو بەزينو هيچ پێنەمان لە بــواری وتووێژو بەڵگە هێنانەوەدا، پەنايان بردۆتە بەری بۆ ئەوەی بەبەڵگەی هــێز (مــنطق القــوة) كەلــێنو بۆشــايی هێزی بەڵگە (قوة المنطق)ی ڕێچكەو بيردۆزەكانيان پڕ بكەنەوە، بۆيە:

شتێکی زۆر بێ ویژدانانەو دوور لەعەقڵو مەنتیقو واقیعە کە تۆمەتی (تـیرۆرو ئیرهـاب) پاڵدرێـتە لای ئیسـلامو ئەهـلی ئیسـلام، چونکە ئەگەر بگونجێ هەر بیروباوەڕو فیکرەیەکی‌دیکە بەتۆبزیی‌و زۆرو چاولێژەق کردنەوەو هەڕەشەو فشار لەسەر خەڵك فەرز بکرێ، مەحاڵە ئەو شێوازە بۆ ئیسلامێك دەسـت بـدات کەبـەر لەهـەر شـتێك سـەروکاری لەگەڵ دڵو دەروونو دیوی پـەنهانی ئینسـاندا هەیـەو، هـەر کـارو کردەوەو چالاکی‌یەك کەهەر چەندە بەڕواڵـەت زۆر چـاكو پەسـند بێت، بەڵام مادام قەناعەتو نیەتو خوا پێ مەبەسـت بوونی دەروونی لەگەڵ دا نەبێت ئیسلام نەك هەر قبووڵی ناکاتو فلسـێکی پـێ نـادات! بگـرە ئەگـەر خاوەنەکـەی بەئانقەسـتو بۆ فریودان ئـەنجامی دابێـت لەسەریشی تووشی سزاو جەزرەبەی توند دەبێتو، بابای وا لەپێناسـەی شـەرعدا بەدەغـەڵو دووڕوو (مـنافق) یـان لایەنی‌کـەم بڕباباز (مرائی) لەقەڵەم دەدرێ!.

هـە ربۆیـەش پێغەمـبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( **إن الله لا ینظر إلی صـــورکم وأموالكـــم ولكـــن ینظر إلی قلوبکم وأعمالکم**)) رواه مسلم وغـــیره. واتـە: بێگومان خوا سەرنجی دیمەنوماڵو سامانتان نادات، بەڵکو تەماشای دڵو کردەوەکانتان دەکات.

کەواتـە: بـا هەموو لایەك بزانن‌و دڵنیا بن کە تیرۆرو بەزۆر دین بەسەر خـەڵکدا فەرزکـردن بەرلـەوەی پێچەوانەو دژی حوکمەکانی شەریعەت بێت، لەگەڵ ئەسڵو بناغەی ئیسلام دا کەئیمانو عەقیدەیە ناکۆكو نەگونجاوە.

بۆیـە هـەر تۆمەتبارکردنێکی‌ئیسلام بەتیرۆرو ئیرهاب بەڵگەو نیشانەی نەزانیی‌و بێ ئاگایی‌و نەشارەزایی‌یە بە ئەلفو بێی ئیسلام.

دیـارە ئەگـەر گـریمان مسـوڵمانێکیش یـان تاقمە مسوڵمانێکیش لەو بـوارەدا دووچـاری هەڵەو کەمو کووڕی یەك بووبێ، ئەوە هیچ ڕەواو ماقووڵ

نـیه کەڕەفـتارو هەڵوێسـتێکی هەڵـەو ناشـەرعی کـە ئیسلام لێی بەرییە لەسەر ئیسلام حیساب بکرێ!.

ئـنجا وەك دواتـریش بـاس دەکـەین گەلێك جار ناحەزو دوژمنانی داخ لـەدڵی ئیسـلامو مسـوڵمانان هـەر جـۆرە زبـرییو تونـدو تۆڵـییو دەست کـردنەوەو هـێز بەکارهێنانـێکی مسـوڵمانان، هـەر لەبـەر ئـەوە بـەناوی ئیسـلامەوەیەو لەلایـەن مسـوڵمانانەوەیە هـەر بـە تـیرۆرو ئیرهـاب ناوزەد دەکەن! کە بێگومان ئەوەش دژو پێچەوانەی عەقڵو شەرعو ویژدانە، چونکە هـەموو خـاوەن عـەقڵو ویژدانێکی ساغو زیندوو دەزانێ کەتیرۆرو تۆقاندنو زەبـروزەنگی سـتەمکارانەو، دیفـاعو لەسەرخۆکردنەوەو بەر هەڵستیی ڕەوا (المقاومة الشرعیة)، هێندەیزەویو ئاسمان لەیەك جیاو دوورن!

## خاڵی سێیەم: تیرۆرو تۆقاندن لەنێوان مسوڵمانان‌و نامسوڵماناندا

ئەگـەر سەرنجێکی مێژوو بدەین: بەداخەوە زۆر جار دەبینین رۆشنبیرانی کـوردو بـرادەرانی (عەلمانیی) لەپشت پەردەی رەشەوەو بەچاویلکەی خەڵکی دیکە تەماشای‌مێژووی ئیسلام‌و مێژووی میللەتەکەی خۆشیان دەکەن! بەڵام بـێگومان قسـە لـەدوژمن وەرنـاگیرێ‌و قسـەی نـەیار لەسـەر فیکری نەیار ناکرێـتە بەڵگـەو دەلـیل، دەجـا ئـێمەش نابێـت قسەی رۆژهەڵاتناسەکان (مستشـرقین)و قسـەی رۆژئاوایی‌یـەکان بهێـنین‌و لەسـەر مـێژووی ئیسلام‌و مسـوڵمانانی بکەیـنە بەڵگـەو دەلیل، گەلێك جار ئەو تۆمەتە پاڵدەدرێتە لای مـێژووی ئیسـلامیی کـە گوایـە جەنگـەکانی مسـوڵمانان بەتایـبەتی لەسـەردەمی هـاوەڵانی پێغەمـبەردا-خـوا لێـیان ڕازی بـێ- بریـتی بوون لـەوڵات زەوت کـردن لەخەڵك‌و لە داپڵۆسینی خەڵك‌و میللەتان‌و ژێر دەست کردنیان‌و چەوساندنەوەیان!!.

بـەڵام کاتـێك تەماشـای دەقـەکانی قورئـان‌و سـوننەت‌و سـیرەو ژیانی‌کـردەیی پێغەمـبەر(ﷺ)و خەلـیفە راشـیدەکانی دەکەین، کە بێگومان ئـێمە بـەس سـیرەی کـردەیی پێغەمـبەر(ﷺ) وپاشان تا ڕاددەیەکیش سیرەو کـردەوەی چـوار جێیشـینە سـەر ڕاستەکانی (أبوبکرو عمرو عثمان وعلی)- خـوا لێیان ڕازی بێ- ئەوە وەك بەڵگەو سەنەدێکی شەعیی خەڵك دەتوانێ لەسـەرمان بـیکاتە بەڵگـەو دەلـیل، ئەگەر بەناو خەلیفەیەکی (ئەمەویی‌و عەبباسـی‌و عوسمانـیی) ئەگـەر رەفـتارێکی هەڵەو ناشەرعیی‌و پێچەوانەی ئیسـلامی لێ ڕوودابێـت، ئـەوە نابـێ ئیسـلام‌و مسـوڵمانان لەبەرانبەریدا بەرپرسـیار بـن، هەرچـەندە مـێژوی ئیسـلام بەسـەردەمی (ئەمـەویی‌و

عەبباسیو عوسمانیی)یشەوە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ مێژووی میللەتانو وڵاتانی دیکە دیسان هەر جیاوازییان ئاسمانو ڕێسمانە.

ئنجا ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە لە جەنگەکانو (فتوحات)ی ناوازەو دادگەرانەی ئیسلامیدا بنچینەیەکی شەرعی (قاعدة شرعية) هەبووە کە بەگوێرەی ئەو بنچینەیە ڕەفتاریان لەگەڵ خەلکیدا کردوە، ئەویش بریتی بوە لەوەی کەسوپای ئیسلام پاش ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ خەڵکی هەر ناوچەیەكو هەر وڵاتێك ئەو خەڵکانەیان خستۆتە بەردەم سێ(خيار)و سەرپشکیان کردوون لەنێوان سێشتاندا کەیەکێك لەوسێ شتانە هەڵبژێرن[١٥]، وەك لە (تأريخ الطبري)[١٦]و (البداية والنهاية)[١٧] و(الكامل في التأريخ)[١٨]و لەهەموو مێژووەکانی ئیسلامدا تۆمار کراوە، هەڵبەتە بەر لەمێژووش ئەو مەسەلەیە لە چەندان فەرمایشتی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتوەو حەقیقەتێکیڕوونو بەڵگەنەویستە، بۆ وێنە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوبارەوە فەرموویەتی: ((**فـإذا لقيـت عدوك من المشركين فادعوهم إلى ثلاث خصال...**)) رواه مسلم وغيرة.

واتە: (جا کاتێك بەرەنگاری دوژمنەکەت بوویەوە لەهاوبەش بۆ خوا دانەران، بانگیان بکە بۆ سێ شتان)-یان بۆ یەکێك لەسێ شتان-، دوایی لە درێژەی فەرموودەکەدا هاتووە: (جا هەرکام لەو سێ شتەیان قبوڵ کرد لێیان وەربگرەو وازیان لێبێنە، سەرەتا بانگیان بکە بۆ ئیسلام، جا ئەگەر

---

١٥) کەبریتین لە: ١- مسوڵمان بوون. ٢- سەرانەدانو ملکەچ کردن بۆ دەوڵەتی ئیسلامییو مانەوە لەسەر دینو بیروباوەڕی خۆیان. ٣- جەنگ لەگەڵ کران بەناچاریی.

١٦) بڕوانە: (تأريخ الأمم والملوك) ج٢ ص١٠٨،١٠٧، کە (ربعي بن عامر) نوێنەری سوپای ئیسلام بە (رُستم) سەرکردەی سوپای فارسی گوتووە: (آختر واحدة من ثلاث: إختر الإسلام وندعك وأرضك، أو الجزاء.. أو المنابذة)

١٧) بڕوانە: (البداية والنهاية) ج٧ ٤٩تا ٥٣.

١٨) بڕوانە: (الكامل في التأريخ) ج٢ ص ٤٦٤،٤٦٣.

لێـیان وەرگـرتی‌و مسـولمان بـون ئـەوە لێـیان قـبوولّ بکـەو دەسـتیان لیّ بپارێزە).

شـایانی باسیشە ئەوەی پێغەمبەر خوا(ﷺ) فەرموویەتی: فەرماندەکانی سـوپای ئیسـلام زۆر بـاش لەمـەیدانی واقـیعدا بەرجەستەیان کردووەو هەر گـەل‌و میللەتـێك مسـولمان بووبێـت سـوپای ئیسـلام یەکسەر وازی لێیان هێـناوەو ئەگـەر پادشـاو حوکمڕانەکەشـیان مسولمان بووبێت‌و شایستەی حوکمڕانیش بووبیّ ئەوە هەر لە شوێنی خۆی هێلراوەتەوە، بۆ وێنە:

پادشـای (بَحْـرَیَن) کـەناوی: (المنذر بن ساوی العَبْدي) بووە، کاتێك کە پێغەمـبەری خـواﷺ نامەیەکی بۆ دەنێریّ‌و تێیداهاتووە: (( .. **أَسْلِمْ يجعل الله لـــك مـــا تحـــت يديك**..) دیارە لەسەر ئەو حوکمڕانانەش فەرز کراوە کەبەگوێـرەی شـەریعەتی خـوای کاربـەجیّ حوکمڕانیی بکەن‌و گەل‌و وڵاتیان بـەڕێوە بـەرن. چـونکە ئامانجی سوپای ئیسلام لەجەنگ‌و جیهادیدا تەنهاو تـەنها تەخت کردنی‌کۆسپ‌و پەرچەکانی ڕێگای بانگەوازی ئیسلام بووە، نەك داگیر کردنی وڵاتان‌و دەست بەسەرداگرتنی خێرو بێرەکانیان! بۆیە هەرکاتێك ئـەو گـەل‌و مـیللەتانە ئامـادەیی وەرگرتنی دوایین ئایین‌و بەرنامەی خوایان پێشـاندابیّ، هـیچ داواکـاریی دیکەیان لێیان نەبووەو پاش دیاری کردنی برا گـەورەو حوکمڕانـێك‌و دانـانی چـەند زاناو مامۆستایەك کەلە ئایینی خوادا شارەزایان بکەن بەجێیان هێشتوون‌و گەڕاونەوە شوێنی‌خۆیان.

بـەڵام ئەگـەر خەڵکەکـە ئیسـلامیان وەرنەگرتبیّ‌و ئامادەیی‌یان پێشان نـەدابیّ کەمسـولمان بـن‌و شـەریعەتی خوا بەڕێوە ببەن، ئەوە پێغەمبەری خـوا(ﷺ) فەرموویـەتی: (دوایـی- ئەگەر مسولمان نەبوون- داوای سەرانە-(جـزية)یـان لیّ بکـە، جـا ئەگـەر ئامادەبوون بیدەن ئەوە لێیان قبوولّ بکەو دەستیان لیّ بپارێزەو لێیان گەڕیّ).

سەرانە (جزية)یش بریتیە لە ئەندازەیەك ماڵو سامان کەتەنها لەوانەی لەتوانایان دا هەیە لە پیاوان وەردەگیرێو ڕەمزو نیشانەی ئەوەیە کەئەو خەڵكو میللەتەی ئەو شوێنو وڵاتە دژی ئیسلام نیەو دوژمنایەتیمسوڵمانانو ئەوکیانو دەوڵەتە ئیسلامیی‌یە ناکات کە دەیەوێت سایەو کیانو دەوڵەتێك بۆ هەموومیللەتان پێك بێنیو سەرجەم ئینسانەکانو گەلو تیرە جیا جیاکانی مرۆڤایەتی لە ژێر سێبەریدا کۆبکاتەوەو بەختەوەریان بکات.

بەپێچەوانەوە ئەو جیهانگیریی‌یەی کە ئێستا ئەمریکا بانگەشەی بۆ دەکات بریتیە لە داگیرکردنو دەست بەسەرداگرتنی دنیاو، لەڕاستیدا بەجیهان کردنی حەقیقی واتە جیهان کردنە یەك دەوڵەتو یەك کیان بەشێوەی راستو دروستو بەشێوەی عادیلانە تەنیا لە ژێر سایەی شەریعەتی خوادا دەبێت، چونکە خوای پەروەردگارو شەریعەتی خوا دان بەتایبەتمەندیی(خصوصية)ی هەمو میللەتاندا دەهێنێ وەڕێگەش بەخەڵك دەدات کە عەقیدەی خۆیانو پەرستنو ڕەوشتو ئادابی خۆیان جێ بەجێ بکەن، نەك وەك عەولەمەی ئێستا-کە لەڕاستیدا (ئەمرەکە)یە نەك (عەولەمە)- دەیەوێت میللەتان هەموویان بەهاو نەریتو ڕێو ڕەسمەکانی ئەوان (ئەمەریکاو رۆژئاوا) وەربگرنو دەستبەرداری هەموو شتێکیخۆیان بنو، بەزۆری زۆرداریش بەسەریان دا دەسەپێنیو دەستکاری هەموو شتێکیان دەکات!!

پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئنجا ئەگەر ئەوەشیان نەکرد ناوی خوای لیّ بێنەو لەگەڵیان بجەنگە).

واتە: لە لایەکەوە ئیسلام وەرناگرن کەبیکەنە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانیان وەلەلایەکی دیکەشەوە دانیش ناهێنن بەدەستەلاتی ئەو دەوڵەتەدا کە جگە لە خێرو بەرەکەت چی دیکەی بۆیان نەهێناوە! ئەوە ئەوکاتە مانای وایە

بوونەتـــە لەمـــپەرێك‌و كۆســـپێك لەبـــەردەم ئـــەو جـــیهادو جـــم‌و جۆڵـــە ئازادیخوازانەیـــەی كـــە ئیســـلام دەســـتی پێكردووە كە دەیەوێ میللەتانی ژێر دەست‌و چەوساوە ڕزگار بكات‌و دەیەوێ میللەت‌و كۆمەڵگا پڵیشاوەو زەلیل كراوەكان لە زۆنگ‌و تاریكی زوڵمی طاغووتەكان دەربهێنێ‌و دیەوێ ئازادیان بكـات‌و دەربازیـان بكات، جا ئەوكاتە ئیمان دێنن یان نا، ئەوە گرفت نیەو گـرنگ ئەوەیــە ئـازاد بن‌و نەچەوسێنەوە، گرنگ ئەوەیە هیچ كەس زەخت‌و زۆری بەســەریانەوە نەبێـت ئـیدی ئەوكاتـە سەرپشـكن وەك خـوای دادگەر فەرموویـەتی: ﴿وَقُـــلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾(الكهـــف:من الآية٢٩)، واتـە: (بڵێ هەق لەپەروەردگارتانەوەیە، جا كێ حەز دەكات بائیمان بهێنێ كێش حەز ناكات با ئیمان نەهێنێ).

هـەندێك كـەس وا دەزانـن ئەو جەنگانەی كە سوپای ئیسلام كردوونی‌و فـتووحاتی ئیســلامیی كـە كـراوە بۆ ئەوە بووە كە خەڵك بە زۆر مسوڵمان بكرێـت!! نەء وا نەبووە، بەڵكو جەنگەكە لە ئەنجامی ئەوە دا درووست بووە كەهـەندێك لــە كۆمــەڵگاو مــیللەتان بەفیــتی حوكمــڕانە زۆردارەكانــیان نەمســوڵمان بوونــەو نــە ئامــادەیی دانی سەرانەشیان هەبووە، ئیدی سوپای ئیســلامیش بەناچـاری دەســتی بۆ چەك بردووەو هێزی بەكارهێناوە نەك بۆ مســوڵمان كردنــیان كەبــێگومان ئـەوە دروســت‌و ڕەوا نــیە بــەڵكو بۆ ڕێگا پاكردنەوەو لابردنی كۆسپ‌و پەرچەكانی‌سەر ڕێی بانگەوازو گەیاندنی پەیام‌و بەرنامەی خوای تاك.

شایانی‌باسیشــە كەلەمەســەلەی وەرگرتــنی ســەرانە[١٩] (جزیە)دا پاش لێكۆڵێــنەوەی زۆرو قــووڵ مــن بــۆم دەركــەوتووە كـە ئـەو ڕایـە ڕاســت‌و

١٩) شایانی‌باسیشە كە زۆرێك لەزانایانی‌ئیسلام بەتایبەت هاوچەرخەكان (المعاصرون) ڕایان وایە كە هەركاتێك (أهل الذمة) ئامادەی بەشداری كردنی جەنگ‌و جیهاد (سەربازیی كردن)

بەڵگـەدارە کە دەڵێ: هەموو جۆرەکانی کافران سەرانەیان لێ قبووڵ دەکرێ، کـە ئـیمام (مـالك)[٢٠] و (أوزاعـی)و زانایـانی (شـام) ئەو ڕایەیان هەیەو هــەرکام لــە (إبــن القــیم)[٢١] و (الشــوکانی)[٢٢]یــش هەڵــیان بــژاردوەو بەســەرنجدانی بەڵگەکانــیش هیچ کەس دوو دڵی (تردد)ی نامێنێ لەڕاستیو تەواویی ئەو ڕایەدا کە دەڵێ: تەنها ئەهلی کیتابو مەجووس سەرانەیان لێ وەرنــاگیرێ، بــەڵکو هــەموو خــاوەن فــیکرەیەكو هــەموو خــاوەن دینــێك بەهاوبــەش دانــەر (مشـرك)و بـت پەرسـت (وثـني)و بێبڕوا (مُلْحِد)یشەوەو هەموویان سەرانەیان لێ وەردەگیرێ، هەڵبەتە جگە لەهەڵگەڕاوە (مرتد) کە حیسـابێکی دیکـەی جـیاوازی هەیـە[٢٣]، ئەگەرنا هەموو خاوەن فیکرەیەك سـەرانەیان لێ وەردەگـیرێو بـێگومان ئـەو ڕاو بۆچونەش زۆر بەهێزەو وەك (إبــن القــیم) گوتوویەتی: (.. وهـذا القول أصح في الدليل كما ترى)[٢٤] واتە:

---

بوون بۆیان دەخرێتە بری سەرانەوەو لێیان وەرناگیرێ، بڕوانە: (الإسلام والمشكلات السياسية المعاصرة،نظام الحكم، حقوق الإنسان، الأقليات) د. جمال الدين محمود، ص٣٨٦ تا٣٩٦.

٢٠) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي)ج٧ ص٣١٢.

٢١) بڕوانە: ( زاد المعاد) ج٥ ص٩٢،٩١.

٢٢) بڕوانە: (السيل الجرار) ج٤ص٥٧١،٥٧٠.

٢٣) چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (من بدل دينه فاقتلوه) رواه البخاري، هەرچەندە وەك ئەمانەتیی زانستیی پێویستە ئەوەش بگوترێ کەلە مەسەلەی سزای هەڵگەڕاوە (مرتد)دا کە ئایا وەك سزای زیناو قەتڵو دزیی سزاو سنوور (حد)ێکی شەرعیەو هیچکەس بۆی نیە دەستکاریی بکات، یان سزاو تۆڵەیەکە لە جوغزی سیاسیەتی شەرعییو دەستەڵاتی برا گەورەی مسوڵمانان دایە و بۆی هەیە(إجتهاد)ی تێدابکات؟! لەنێو زانایان دا تاڕأدەیەك قسەو باسو مشتو مڕ هەیەو هەندێك لەزانایان سزادانی(مرتد) بەسزاو سنوورێکی دیاریکراو (محدد)ی شەرعی نازاننو چەند شتێکیش لەو بارەوە بەبەڵگە دێننەوە کەیەکیان بریتیە لەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) شەفاعەتی (عثمان بن عفان)ی خوا لێی ڕازی بێ دەربارەی نەکوشتنی (إبن أبی السرح) کەهەڵگەڕابۆوە قبووڵ کردو عەفوی کرد، کەدیارە ئەمەش لەسنووره شەرعیەکان دا دروست نیە.

٢٤) بڕوانە: (زال معاد)ج٥ ص٩٢.

وه ئــهم قسهیه لهڕووی بهڵگهوه ڕاست تره، وهك دهبینی. وه ئهو ڕایه لهگهڵ تێکڕای ئایهتو فهرموودهکانیش دا دێتهوه.
لــهوهڵامی ئــهو بهڵگهیهشــداکه دهڵــێ: پێغهمــبهری خــوا (ﷺ) هیچ کاتێك ســهرانهی لهبــت پهرســتهکان وهرنهگــرتووه! دهڵێن: هۆی وهرنهگیرانیسهرانه لهبتپهرســتهکان ئــهوهی که پاش هاتنه خوارهوهی ئایهتی: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِــنُونَ بِاللَّـــهِ وَلا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِيــنُونَ دِيــنَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ (التوبة:٢٩)
ســوپای ئیسلام لهگهڵ هیچ کۆمهڵێکیموشریك داڕووبهڕوو نهبۆتهوه تابزانین ســهرانهیان لێ وهردهگــیرێ یــان نــا؟! چــونکه لهوکاتــهدا موشــریکهکان ســهرجهمیان مســولْمان بووبوون، جائهوهی بهڕاستیمسولْمان بووبێو ئهوهی بــهناو مســولْمان بووبێــتو چووبێته حاڵهتی دووڕوویيو نیفاقهوه، ئهگهر نا دوایــی کهســوپای ئیســلام لهگــهڵ مهجووسدا ڕووبهڕوو بۆتهوه کهوهك (إبن القــيم) دهڵــێ: خــۆ ئاگــر پهرســت لهبــت پهرســت خــراپترن، ئــهدی بۆ چی پێغهمــبهر(ﷺ) لهبارهیانــهوه فــهرمووی: (سُنّوا بهم سُنَّة أهل الكتاب)[٢٥]
واتــه: ( وهك ئــههلی کیتاب (جوو ودیانهکان) ڕهفتاریان لهگهڵ بکهن)، جا (إبــن القــيم) دهڵێ: خۆ ئهگهر بۆ ئاگر پهرست ههبێ سهرانه بدات-که دیاره ژنیان لێ ناهێنرێتو سهربڕاویشیان ناخورێت، چونکه ئههلی دین نین-، ئهوه هــهر بتپهرستێکی دیکهشو ههر خاوهن فیکرهیهکی دیکهش بهههمان شێوه مامهڵــهو ڕهفــتاری لهگــهڵ دهکرێــت، جا ههر کهسێك که مسولْمان نابێت ئــهوه کــهیفی خۆیــهتی ئازاده، بهڵام کهمسولْمان نابێت، دهبێ لێگهڕێ ئهو بــانگی ئــازادی ئیســلامهتیيه ناگاتــه خــهڵك، بۆیــه بادژایهتی ئهو کیانو

٢٥) بروانه: (المدونة) للإمام مالك ج٣ ص٤٦.

ئەمڕۆ دیاردەیەکی جیهانی‌یە، واتە: جەوهەری تیرۆرکردنو ئیرهاب دیاردەیەکی جیهانی‌یەو هیچ پەیوەندی‌یەکی بەئیسلامو مسوڵمانانەوە نیە، وەئەگەر مسوڵمانێك رۆژێك لەرۆژان ئیراهابو تیرۆری کردبێ بەپیشە، ئەوە پێچەوانەی شەریعەتی خواو پێچەوانەی ئایینو بەرنامەکەی خۆی جووڵاوەتەوە، وەترساندنی دوژمنیش لەحاڵەتی جەنگو ڕووبەڕوو بوونەوەدا ئەوە هیچ پەیوەندیی بەتیرۆرو ئیرهابەوە نیە بەپێی پێناسەو چەمكو واتای راستەقینەی وشەی ناوبراو، وەبێگومان بەرگریی لەخۆکردنو تەسلیم نەبوون بەدوژمنیش شتێکی پیرۆزەو هەموو میللەتانو هەموو خاوەن عەقڵێکیش ئەوە بەرەوا دەزانێ کەلە کاتی ڕووبەڕووبونەوەدا سامێکی هەبێتو عیززەتو هەیبەتو قووەتێکی هەبێت و وابێ کە دوژمن لێی بسڵەمێتەوەو نەتوانێ دەستدرێژی بکاتە سەریو زوڵمی لێ بکات.

## ئالقەی (٢)

# سیکۆلاریزم (عەلمانییەت)
# سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە

سەرەتا بەخێرهاتنێکی گەرمی هەموو لایەکتان دەکەم، بێگومان شتێکی ڕوونو ئاشکرایە کە ئێمە وەك میللەتی مسوڵمانی کورد بەڵکو فراوانتر وەك میللەتانی مسوڵمانی عێراقو مسوڵمانانی جیهانی ئیسلامی بەگشتی، لەهەموو ساتو سەردەمێکدا زۆر پێویستمان بەیەکتر ناسینو یەکتر خوێندنەوەو لەیەکتر تێگەیشتنێکی ڕاستو دروست هەیە، چ جای لەم بارودۆخە دژوارەدا کە بەگشتی دونیای تێدا ڕەت دەبێو ئۆممەتی پێغەمبەرﷺو عێراقو کوردستانیش بەتایبەتی تر، چونکە بەڕاستی میللەتانی دونیا بەدرێژایی مێژوو ئەگەر بۆیانکرا بێ کە ئامانجێکی باشو گەورە بۆ خۆیان تەحقیق بکەنو فەراهەم بێنن تەنها بە برایەتیو تەبایيو یەکدەنگيو یەکڕەنگيو هاوهەڵوێستی نێوانیان بووە، وە بە پێچەوانەوەش هەرساتێك کە زەفەریان پێ برا بێت لەلایەن نەیارانیانەوە ئەوە لەو کونو کەلێنو درزانەوە بووە کەلەریزەکانیاندا بوون، بۆیە من بەپێویستی دەزانم کەهەموو ئەو بابەتە گرنگانەی کەپێویست دەکەن ئێمە وەك میللەتێکی مسوڵمان تێیاندا بگەینە بنجو بنەوانو حەقیقەتو، وەك خۆیان بیانناسین، پێویستە نوختەیان تێدابخەینەسەر پیت، جا چ مەسەلەی تیرۆر بێت کەلەکۆڕێکی پێشتردا باسمان کرد چ مەسەلەی عەلمانیەت بێ، چ مەسەلەی دیموکراتییەت بێ، چ مەسەلەی عەولەمە بێ، چ هەر مەسەلەیەکی دیکەو

هــەر بابەتێکی دیکەی گرنگ بێ کە ئێمە وەکو میللەتێکی مسوڵمان جارێ لــەو چەمكو بابەتانەدا نەگەیشتووینە رێکەوتن (إتفاق)ێك تاکو وەك خۆیان بیانناســینو تێــیان بگــەین، بۆیــە بــێگومان نــاتوانین یەکرِیــزو یــەکدەنگو یەکرِەنگو هاو هەڵوێست بین لەبەرانبەریاندا.

ئێستاش لە چوار خاڵاندا باسی سیکۆلاریزم دەکەین:

**یەکـەم**/ پێناسەی سیکۆلاریزم دەکەین کەچی‌یە؟ ، بۆ چی بەعەلمانیەت یان بەعیلمانیەت تەرجەمە کراوەو ناودەبرێت؟!

**دووەم**/ سـیکۆلاریزم (عەلمانــیەت) کــەیو لــەکوێو چــۆن و بۆ چی سەری هەڵداوە؟!

**سێیەم**/ بەرهــەمو ئاســەواری ســیکۆلاریزم لــە ژیــانو گوزەرانــی خەڵکی خۆرئــاوادا، چــونکە نابــێ ئــێمە هەر لەخۆمانەوە بانگەشە بۆ بیروبۆچوونو شــتێك بکــەین بەبێ ئەوەی کەبزانینو تێبگەین ئاخۆ خەڵکی تری سەرزەوی زەرەری لێ کــردوە یان قازانج، چونکە ئەو جۆرە بیرو تێرامانە لە ژیاندا زۆر هەڵەیــەو پێچــەوانەی عەقڵو (مـنطق)ە، وێرِای ئەوەی کەپێچەوانەی شەرعو بەرنامەی ئیسلامیشە.

**چوارەم**/ سیکۆلاریزم حاڵەتێکی بێ پاساوو حاڵەتێکی ناشەرعیو نارِەوایە بــۆ میللەتــێکی مســوڵمان، هــەروەك لــێرەدا لــەو بارەیەوە هەڵسەنگاندنو بەراوردکارییەکی دادەپەروەرانەو ژیر بێژانە دەکەین.

## خاڵی یەکەم

## پێناسەی سیکۆلاریزم (عەلمانییەت)

وشــەی (عەلمانیــیەت) ســەرجەم فەرهەنگــەکانی زمانی عارەبی لەسەر ئەوە کۆكو یەکدەنگن کە وشەی عەلمانییەت تەرجەمەی وشەی سیکۆلاریزم

(Secularism)ی ئینگلـیزی لائیك(laic)ی فەرەنسی‌یە، وە بەهیچ شێوەیەك پـەیوەندی بەوشـەی زانسـت (عـلم)ەوە نـیە نەلـە زمـانی فەرەنسی‌و نە لە ئینگلیزیشـدا. چـونکە وشەی زاست لەزمانی‌ئینلگیزی‌دا ساینس (Science)ە، بـەڵام مانـای تەرجەمـەی پـڕ بەپێسـتو ڕاسـتو دروسـتی وشـەی سیکۆلاریزم بریتیەلە[٤٣]:

(دنـیا پەرسـتی، دنـیا گـەرایی بێ دینایەتی (الدنـیویة،:اللادینیة))، هۆی ئـەوەش کەنوسـەرە عەرەبـەکان بـە (العَمانـیة) تەرجەمەیان کردوە ئەوەیە کەسـەرەتا بـە (العالمانـیة:واتـە:(الدنـیویة) تەرجەمـەیان کردەوەو پاشان بۆ ئاسـان بـوون لەسـەر زمـان ئەلـیف(ا)ەکەیان گۆڕیوە بە سەر (فتحة)و بۆتە (العَـلْمانیة).

کەواتە: تەرجەمەکردنی سیکۆلاریسم بە (العِـلْمانیة) کەوا پێشان دەدرێ پـەیوەندی بەزانـیاری (علم) یەوە هەیە، هەڵەیەو جۆرێکە لە چەواشەکردنی خـەڵكو فێڵ لێکردنیانو گۆڕینو لادان (تغییر وتحریف)ی راستی‌و جەوهەری مەسەلەکان!

لەڕاسـتیدا تەرجەمەکـردنی وشـەی (Secularism) بـە (عیلمانـیەت) فـێڵو تەزویـرو ساختەکارییەکی ئاشکرایە بەمەبەستی جوانکردنی بیچمی دزێوو ناشیرینی وشەو بیردۆزەی‌ناوبراو، چونکە زانراوە کە ئەگەر سیکۆلاریزم بـەماناو چـەمکی راسـتەقینەی خـۆی کەبریـتی‌یە لە: (بێ دینایەتی‌و دنیا پەرسـتی) تەرجەمـە بکـرێ ڕووی نـێو میللەتێکی مسولمانی نابێت، بەڵام ئەگـەر بگوتـرێ: عیلمانـیەت، ئەوە مانایەکی بریقەدارو فریودەری بۆ پەیدا دەبێ.

---

٤٣) (فەرهەنگی نوێ)یش لەپێناسەی سیکۆلاریزم داگوتوویەتی: (دنیا پەرست، باوەڕ بەکاروباری دنیایی‌و خۆشەویستی دنیاو باوەڕنەکردن بەدەرەوەی ئەمانە) بڕوانە: لاپەرە(١٩٠) نووسینی، بورهان قانیع، چاپی یەکەم ١٩٨٥.

ئێستاش دوای ئەوەی ماناو چەمکی (سیکۆلاریزم)مان لەئەسڵی زماندا زانی، بابۆ زیاتر دڵنیاییو بەرچاو ڕوونبوونەوە لەو بارەوە سەرنج بدەین داخۆ فەرهەنگەکانی رۆژئاواو ئەوروپا کەکانگاو مەڵبەندی سەرهەڵدانی رێچکەی سیکۆلاریزمیشە، چۆن پێناسەی وشەی ناوبراو دەکەن!

١- لە (ئینسکلۆپیدیای بەریتانی) (دائرة المعارف البريطانية)دا لەبارەی پێناسەی وشەی ناوبراوەوە، ئەمە هاتوە، کە من یەکسەر بەکوردی تەرجەمەی دەکەم.

دەڵێ: (سیکۆلاریزم: جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتییەو دەیەوێ خەڵکیلە ئەمیەتو بایەخ دانی بەدوارۆژەوە بگۆڕێ بۆ گرنگی دان تەنیا بەژیانی دونیا) هەروەها دەڵێ: ئەو رێبازگەو ئەو دیاردەیەش لەوەوە سەری هەڵدا کەپێشتر خەڵك لەسەدەکانی نێوەڕاستدا زۆر خولیای خوا بوونو زیاتر گرنگیان بە دوا رۆژ دەداو خۆیان دوور دەخستەوە لە ژیانی دونیاو بەشتێکی کەمو بێ بەهایان دەزانیو زیاتر ڕوو لەخوابوون نەك ڕوو لە دونیا، بۆیە بۆ بەرهەڵستی کردنی ئەو بیرو بۆچوونو ئەو هەستو نەستە قووڵە ئەو ڕێبازە (سیکۆلاریزم) پەیدابوو، بەو هیوایەی کە دوارۆژو خواو شتە پەنهانو نادیارەکان (غیبیات) لەدڵو دەروونو لە بیروبۆچونی بەندەکاندا لێڵ ون بکاو بیانسڕێتەوە، تا لەبری ئەوە تەنهاخەریکی خۆو دونیاو هەواو ئارەزووە بەدەکانیان بن، بەتایبەت لە دوای (ڕێنیسانس)[٤٤]ەوە، واتە لە دوای ڕاپەڕینی (شۆرشی زانستی)ئەو رەوتە هاتە کایەوە کە لەسەدەی (١٦)داهەم ئەو ڕێنیسانسە سەری هەڵداو هەم ئەوبیروبۆچوونەش ئەوکات پەرەی سەندو، هەمیشەش داکۆکی لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێ هەموو خولیاو خواستو

---

٤٤)شۆڕشی فەڕەنسی دژی کلێسا.

ئاواتـەکانی ئادەمـیزاد لەسەر ئەم زەویەو لەم ژیانەی دونیادا بێنەدیو نابێ هـیچ بیرێـك لـە خـواو لـەدینو دوارۆژ بکرێـتەوەو نابـێ هەرگیز هەستو مێشـکمان بـەوەوە بەندو خەریك بکەینو بۆشاییەکی دڵو دەروونمان بەوە پڕ ببێتەوە.

٢-لەفەرهـەنگی جـیهانی نـوێ (قـاموس العـالم الجدیـد) گوتـراوە: وشەی سیکۆلاریزم بەدوومانا دێت:

أ- واتـە گـیانی دونیا گەرایی، یان ڕێڕەوی دونیا گەرایەکان، واتە: ئەوانەی کەتەنها بڕوایان بەدونیا هەیە.

ب- بـڕوابوون بـەوەی کـە کاروبـاری کڵێسـاو ئـایین هـیچ پەیوەندییەکـیان بەکاروباری ئیدارەو وڵاتەوە نییە، بەتایبەت لەبواری پەروەردەی گشتیدا.

٣- وە فەرهــەنگی (ئۆکسـفۆرد) دەربـارەی وشـەی سـیکۆلاریزم دەڵێـت: سـیکۆلاریزم واتــە: دونـیا گـەرایی یـان مـاددە گەرایییـەك کـەدینو ڕووحینەبێت وەکو پەروەردەی سیکۆلاریستی کە بریتییە لە بێ دینایەتیو ئارەزووبـازیو تـەپڵ لـێدانو مۆسـیقاژەنی، وە دەسـتەڵاتی سیکۆلاریستی بریـتییە لـە حکومـەتی دژ بـەدینو دژ بەکڵێساو دژ بە بەندایەتی کردن بۆ خـوای کـردگار. وە دەڵێـت: سـیکۆلاریزم: هەڵگـری ئـەو پەیامو بەیداخەیە کەنابێ دین بناغەی ڕەوشتو پەروەردە بێت.

٤- (قـاموس معجم الدولی الثالث الجدید) دەڵێت: (سیکۆلاریزم) ڕێرەوێکە لە ژیانێك کە بەڕێوە چوونو کاروبارەکانی لەسەر ئەو بنچینەیە بنیات نراون کەنابێـت ئـاینو خـەڵکی دیـندار دەسـت وەربدەنـە حکومـەتو کاروباری دەوڵەتـەوە، وە دەڵێـت: (سـیکۆلاریزم) بریـتییە لـە: سیسـتەمو ڕژێمێکی کۆمەڵایـەتی، بۆیـە لـەبارەی ئـەخلاقی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییەوە دەڵێت: پێویسـتە ئاکـارو ڕەوشـتو بـەها ئەخلاقـیەکان ڕەچـاو نەکـرێن، بـەڵکو تەنهاخواسـتو بەرژەوەندیـیەکانی ژیـانی نـوێو هاوچـەرخیان لەبەرچـاو

بگیرێـت، واتـه: ژیـانی کۆمـەڵگای مـرۆڤایەتی بـەو شێویە بەڕێوه بچێت: لـەڕووی دەوڵەتو کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیەوە کەهیچ حسابێك بۆ خواو دینو دوارۆژ نەکرێت.

جابەڕێزان! ئەم پێناسانە بیرو بۆچوونی فەرهەنگەکانی رۆژئاوان لەبارەی وشـەی سـیکۆلاریزمەوە. بۆیـە لەنـێو کـوردەواری خۆماندا زۆر جار وشەی (عەلمانـیەت) بـە (فصـل الدين عن الدولـة) یان (فصل:الدين:عن:السياسة) پێناسەی دەکرێت، واتە لێکتر جیاکردنەوەی ئاینو دەوڵەت یان جیاکردنەوەو قـرتاندنیئاین لەکاروباری سیاسەتو حکومەت، لەڕاستیدا ئەو لێکدانەوەو ئـەو مانا کردنە بۆ سیکۆلاریزم، ماناکردنی جوزئیيەو تەنها بەشو لایەنێك لەسـیکۆلاریزم ئاشـکراو ڕوون دەکاتـەوە، بۆیە هەقە بۆ مانای پڕ بەپێستی عەلمانـیەت بڵـێین: واتـە لـێك دابـڕینو لێك جویکردنەوەی دین، نەك تەنها دیـنو دەوڵـەت یان تەنها دینو حکوومەت، چونکە سیکۆلاریزم بەر لەوەی سـەروکاری لەگـەڵ سیاسەتو حوکمڕانی هەبێ، سەروکاری لەگەڵ ئەخلاقو چـۆنیەتی بیرکـردنەوەی بەشـەرو بـەهاو رەوشتە بەرزەکانیئادەمیزادە، وەك دەڵـێ: نـابێ هـەموو ئەوانـە لەدیـنەوە وەربگیرێـنو، لەدینەوە هەڵقوڵێنو هەڵبهێـنجرێن، بۆیە ئەگەر بگوترێ (سیکۆلاریزم) تەنها واتە (جودایی دین و دەوڵـەت)، بەڕاسـی ئـەوە واتاو پێناسەیەکی بچوکی سیکۆلاریزمە بەڵکو دەڵـێ: وە دەبێ بەهەمو شێوەیەك ژین لەدین جیابکرێتـەوەو هیچ حیسابێك بۆ دینو دوارۆژو لێپرسینەوە نەکرێ، جا ئەوە بەکورتی پێناسەو لیکدانەوەی واتـاو چـەمکی وشـەی (سیکولاریزم) عەلمانیەت بوو، کە بریتییە لە دونیا پەرستیو بێ دینایەتیو گوێ نەدان بەدینو دوارۆژو خواو پێغەمبەرﷺ.

## خاڵی دووەم :

## (سیکۆلاریزم) کەیو لەکوێو چۆن و بۆچی سەری هەڵدا؟!

دیـاره ئـەو پرسـیاره لـەناخو مێشـکی زۆر کەسدا خۆی مەڵاس داوەو دەخولێـتەوە، کە ئاخۆ ئەو بیروبۆچوونە بۆ پەیدابوو؟ وە خەڵکی ئەورووپا بۆ ئـەو ڕێگەیان گرتە بەر؟! چەندان پرسیاری دیکە لەبیروهۆشی ئەو خەڵکانەدا لـەو بارەوە هەن، بۆیە ئیمەش بەر لەهەموو شتێك دەڵێین: نێوەڕۆكو کرۆکی ڕەوتی سیکۆلاریزم کەبریتی‌یە لە بێ دینایەتی، واتە حساب نەکردن بۆ خواو پێغەمـبەر ﷺو حیسـاب نەکـردن بـۆ شـەریعەتی خـوای تـاكو تەنـیا، ئەو ڕێچـکەو بیرکردنەوەیە (جگە لەزاراوەکەی)شتێکی زۆر دێرینو لەمێژینەیە، هـەر لـەو ڕۆژەوە کـەخوای پـەروەردگار ئـادەمی لەسەر گۆی زەوی داناو خسـتیە ژێـر بـاری تـاقی کردنەوەو، پاشان (قابیلو هابیل)ی ڕۆڵەکانی ئەو بەشـەڕهاتنو، هابیل لەترسی خوا، خۆی لەیاخی بوونو سەرپێچی گرتەوەەو دەسـتی نەچـووە خوێـنی (قابـیل)ی بـرای، بـەڵام قابیل لەبەر یاخی بوونو بـەرژەوەندیخۆی بێ فەرمانی خوای گەورەی کردو گوێی نەدایە خوێن ڕشتن، هابیلی برای خۆی کوشت، ئیتر هەر لەوساتەوە ئەو ناکۆکی‌یەو ململانێ‌یە، ئـەو دوو ئیتـیجاهەی: گوێـنەدان بـەخواو بـە دوارۆژو، گـوێ دان بـەخواو بـەدوارۆژو لەبـەر چـاوگرتنی قەبـرو قـیامەتو لێپرسـینەوەی خـواو، لەبەرچـاونەگرتنی‌ئەو لایەنـە، لەنـێوان ئادەمـیزادەکاندا سـەریان هـەڵداو پـەیدابوون تا دونیاش دونیایە، بەردەوام دەبن، وە هەردوو ئەو ئیتجاهە دوو ڕووگـەو ڕووکـاری هاوتەریـبو ناکۆكو پێچەوانەو دژ بەیەکترنو، هەمیشە ململانـێی یـەکتر دەکـەنو بەپێچەوانەی یەکتر دەڕۆنو دەجوولێنەوە، دیارە ئەو دوو ئیتیجاهەش هەڵقولاوی سروشتی ئینسانن‌و، خوای پەروەردگار هەر لەسـەرەتاوە ئینسـانی وا خولقـاندوە کـە بـتوانێ چـاکەکار بێـت یـان

خراپەکاربێـت، ڕێی ڕاستی یان ڕێ چەوت، ڕێی هەق یان باطل بگرێتە بەر، وەك خـوای دادگەر دەربارەی ئەوە دەفەرموێت ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ (الشمس:٨)

وە دەفەرموێـت: ﴿إِمَّــا شَـــاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً﴾ (الانسان: ٣)، وە هەر ئەوەشـە کـەوای کـردوە ئینسـان لەسەر ئەم زەوییە بەکەڵکی ئەوە بێت کە جێنشـینی خـوای[٤٥] بـەرز بێـت، وشایسـتەی هەڵگرتنی پەیامو بەرنامەی خوابێـت[٤٦]، وە بەکـەڵکی ئـەوە بێـت کـەبۆ تـاقی کردنەوە دابنرێت[٤٧]، چـونکە دەتوانێـت بـەرزو نـزم بێـتەوە، هەڵـەو ڕاست بکات، ڕاستو خوار بـڕوات، دەتوانێ هەم هەق وەربگرێو هەم بەدوای باطـڵ بکەوێت، وەئەگەر تەماشـای قورئـان بکـەین دەبیـنین خوایبەرزو مەزن لەسەر زاری کۆمەڵێك لەبێ بڕوایەکان ئاوا بۆمان باسی ئەو ڕێڕەوو ئیتتجاهە دەکات کەبریتیە لە دونـیا گـەرایيو بـێ دیـنایەتی، وەك دەفەرموێت:﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْـيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُمْ بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾:(الجاثــية:٢٤).

واتــە: وەکافـرەکان گوتـیان: ژیان تەنها ئەم ژیانەی دونیایەو دەمرینو دەژیـن، وەتـەنها ڕۆژگاریش ئێمە لەنێو دەباتو دەمان فەوتێنێ، دەنا ئێمە بەهـیچ لەنـێو ناچـین، چونکە هیچ خوایەك ئێمەی دروست نەکردووەو نامان مرێـنێ، بـەڵکو ئـێمە بـۆ خۆمـان دەژینو دەمرین، جاکاتێك کە تەمەنمان

---

٤٥) وەك خوایبەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾(البقرة: من الآية٣٠) واتە: کاتێك کەپەروەردگاری تۆ بەفریشتەکانی فەرموو، دەمەوێ (جێنیشین)ێك لە زەوی دا دابنێم، (کەبریتیە لە ئادەمو وەچەکەی).

٤٦) ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنْسَانُ﴾ (الأحزاب: من الآية٧٢)

٤٧) ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ (الملك: من الآية٢)

بەسـەر چـوو، زەمـانو رۆژگـار ئێمە لەناو دەباتو نامان هێڵێت، وا دەڵێن ئەگەر چی هیچ نازانن‌و هیچ زانیارییەکیان لەو بارەیەوە نی‌یەو سەریان لیٚ دەرناچیٚ، چونکە ئەوە غەیبەو غەیبیش تەنها خوای دادگەر دەیزانیٚ، بەڵکو ئـەوەی کەئـەوان دەیڵێن تەنها گومانێکی ناڕەوایە جابەڕاستی ئەوەی خوای پـەنهان بـین فەرموویـەتی لەسەداسـەد وایـە، چونکە هیچ کافرو مولحیدێك نی‌یـە کەلـە کوفـرو بـیٚ دیـنایەتی‌دا بگاتـە یـەقین، وە چـەندەها جـار (بـەندە)لەگەڵ خەڵکی کافرو خەڵکی مولحیدو بیٚ باوەڕدا گفتوگۆو مناقشەم کـردووە لەسـەر ئـەو مەسـەلانە، جـا کاتێك کە صادیقانە قسەیان کردوە، دانـیان بـەو حەقـیقەتە مەزنەداهێـناوە، کەهەمیشـە لەگومانو دوو دڵی‌و دڵەڕاوکـەدان، چـونکە هەرگـیز ئینسـان لـە ئیـلحادو بیٚ باوەڕی‌و لەدوور لـەخواییدا دڵی ئارام ناگریٚو ناگاتە یەقین، ئەوپەری گومانێکی بەهێز (ظن: راجـح) یـان، دەبێـت، بەڵام هەر ناگاتە پلەی یەقین چونکە ئینسان تەنها لە حـەقدا دەگاتە یەقین، هەروەها خوای بەرز بەسەرهاتی گەلی (شوعەیب)مان (علـیه السـلام) بـۆ دەگێڕێتەوە، کە ئەوانیش گوتوویانە: نابیٚ دین ئاوێتەو تـێکەڵاوی ژیـن بکریٚو، نابیٚ دین بەشداری حوکم‌و سیاسەت بکات، بەڵیٚ ئـەو مەسـەلەیە شـتێکی‌زۆر دێـرین‌و لەمێژیـنەیە، ئـەوەتا گەلی شوعەیب بەشـوعەیب دەڵـێن: ﴿قَـالُوا يَا شُعَيْبُ أَصَلاتُكَ تَأْمُرُكَ أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَـا أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ إِنَّكَ لَأَنْتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ﴾ (هود: ٨٧)، واتـە: ئـەی شوعەیب ئایا نوێژو عیبادەتەکەت بۆ خوا فەرمانت پیٚ دەکـات کەئـێمە دەسـت لە دوو شتی سەرەکی‌و باو هەڵبگرین کە بریتین لە

<u>یەکـەم</u>: ئایـا تـازە ئـێمە دەسـت لەبت پەرستی‌و سەنەم پەرستیساڵەهای سـاڵمان هەڵـبگرین کەهـەر لـە دێـرزەمانەوە بـاب‌و باپیرانمان پەرستویانن،

<u>دووەم</u>: ئایـا تـازە دەسـت لـەوە هەڵـبگرین کـە چەندین ساڵە بە ئارەزووی

خۆمـان تەسەرڕوف لە ماڵو سامانماندا  دەکەین بەبێ گوێ دانە هیچ قیەمو ئـەخلاقو دوارۆژو بـەرژەوەندی گشـتی، جائایـا نوێژەکـەت وات لێدەکاتو فەرمانـت بەوە پێ دەکات کەرێگە لەبت پەرستیەکەی ئێمە بگرێت، وەرێگە لـە دەوڵەمەندبوونو سەرمایەداریەتی‌مان بگرێت، ببێ بەربەستو ئاستەنگ لـەرێگای خواسـتو ئارەزووەکانمـانداو لێ نەگەڕێـت کەبـە کـەیفی خۆمان بکـەین، بۆیە بەتانەو توانجەوە پێی دەڵێن: بەڕاستی تۆ پیاوێکی زۆر هێمنو لەسەر خۆو سەر راستی ﴿إِنَّكَ لَأَنْتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ﴾.

کەواتــە ئــەو رەوتو رێــبازەی کــە دەڵێــت: نابــێ عیــبادەت تــیکەڵی سیاســەت بکرێــتو، نابــێ دیــن هــەقی بەســەر ژیــنەوە هەبێــت، ئــەوە بیروبۆچـوونێکی زۆر کۆنـەو شتێکی تازە نی‌یە، بەڵێ بابزانین (سیکولاریزم) وەك زاراوەیــەك تــازە پــەیدا بــووەو ئێســتا بەکاردێـت، بـەڵام لەمێژە وەك ئیتتیجاهــێك بــووە هەرکاتێك ئینسان لەخواوەند دوور بووبێت، هەوڵی داوە هــەر خــەریك و ســەرقاڵی دونــیا بێت، وەهەرکاتێك ئیمانی‌بەخوا نەبووبێت هــەوڵی داوە کــە بۆخــۆی بەرنامەی ژیان بۆ خۆی دابنێت، چونکە بێگومان هەرکاتــێك ئینســـان پــەیوەندی لەگــەڵ  خـوا بپچـڕێ، ئـەوە پشـت بەخۆی دەبەســتێ، بۆیــە سیکۆلاریزم وەك زاراوەیەکی فیکریو سیاسی لە ئەورووپا لەجــەووێکی واداســەری هــەڵدا، وەکــە دەڵــێین ئـەورووپا مەبەسـتمان پێی رۆژئاوای ئێستایە کە ئەمریکاش دەگرێتــەوەو تەواوکەری رۆژئاوایە، چونکە ئەمەریکیــیەکانی ئێســتائەوانی کەلــەوێ باڵادەســتو دەســەڵاتدارن، هــەر ئەوروپــیەکان بــوون کــە چــوونە ئــەوێ، بەتایــبەت ئینگلــیزەکان چــوونە ئەمــەریکاو لــەوێ  جــێگیرو نیشــتە جــێ‌بوونو، چەندان ملیۆنیان لەهیندە

سـووره‌كان قـه‌لاَ چـۆكردن[٤٨] (ته‌نها كه‌مێكیان هێشتنه‌وه)، كه‌واته ئه‌مڕۆ ئه‌مریكیه‌كانـیش هـه‌ر ئه‌ورووپی‌یـه‌ كۆنـه‌كانن، هـه‌روه‌ك شاراسـتانیه‌تی ڕۆژهـه‌لاَت‌و بلۆكـی شـه‌رقیش له‌راسـتی‌دا لـه‌ ژێر كاریگه‌ری شارستانیه‌تی ئـه‌ورووپا دایـه‌، جاكـه‌ ده‌لـێین ئـه‌ورووپا واته‌ ڕۆژئاوا به‌هه‌ردوو سیسته‌می ڕۆژهـه‌لاَت‌و ڕۆژئاوایـیه‌كه‌وه‌ كـه‌ ده‌ره‌نجـام و درێژبوونـه‌وه‌ی شارسـتانیه‌تی ڕۆمـانی‌و ئـیغریقین، جائـه‌وروپا چ له‌سه‌رده‌می ئیغریقی‌و ڕۆمانیه‌كانداو چ دوای ئـه‌وه‌ی كه‌عیسای مه‌سیح هات (علیه السلام) هه‌ر بت په‌رست بوون‌و بـه‌وه‌وه‌ ڕاهاتبوون هه‌روه‌ك زۆربه‌ی كتێب‌و سه‌رچاوه‌ مێژوویـیه‌كان كه‌باس له‌ مـێژووی دونـیا به‌گشـتی‌و مـێژووی ئه‌ورووپا به‌تایبه‌تی ده‌كه‌ن له‌سه‌ر ئه‌و ڕاسـتیه‌ كـۆك و یه‌كده‌نگن كه‌ئیغریقیه‌كان‌و ڕۆمانیه‌كان بت په‌رست (وثني) بوونـه‌، هه‌روه‌ك ئێستاش هه‌ندێك له‌ ئه‌دیب‌و نووسه‌ره‌كان له‌هه‌ندێك په‌ڕاوو په‌رتووكه‌كانـیاندا ئه‌و جۆره‌ ته‌عبیره‌ به‌كار دێنن: خوای جوانی‌و خوای شه‌ڕو خـوای ئاشـتی‌و خـوای.باوهتد، كه‌بێگومان هه‌موو ئه‌و زاراوانه‌ له‌بنه‌ڕه‌تدا هی ئیغریقیه‌كانن، چونكه‌ ئه‌وان باوه‌ڕیان به‌چه‌ند په‌رستراوێتی (تعدد الآلهـة) هـه‌بوو، بـه‌م شـێوه‌یه‌ ئه‌ورووپـیه‌كان له‌سه‌ر ئه‌و جۆره‌ بیرۆكه‌و بیركردنه‌وه‌یه‌ ڕاهاتـبوون بۆیـه‌ كاتێك كه‌عیسا (علیه السلام) وه‌ك هه‌موو پێغه‌مبه‌ره‌كان (علیهم الصلاة والسلام) به‌ (توحید)ه‌وه‌ بۆیانهات، ئه‌وان ئه‌و (ته‌وحید)ه‌ یان بـۆ هـه‌زم نه‌كرا، كاتێك كه‌عیسا فه‌رموی : ﴿**إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَـٰذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ**﴾ (آل عمران:٥١) واتـه‌: به‌ڕاستی ته‌نها خوا پـه‌روه‌ردگاری من‌و ئێوه‌یه‌، جاته‌نهابه‌ندایه‌تی ئه‌و بكه‌ن‌و هه‌ر ئه‌و بپه‌رستن، وه‌ ئـا ئـه‌وه‌ ڕێگـه‌ی ڕاسـته‌، ئا به‌م شێوه‌یه‌ هیچ كام له‌پێغه‌مبه‌رانی خوا

---

٤٨) به‌لاَم كیشوه‌ری ئه‌مریكا بۆ یه‌كه‌مجار له‌(١٥٠٠)ه‌ كان له‌لایه‌ن (كریستۆڤه‌ر) دۆزرایه‌وه‌ پاشان له‌ ٤٧٧٤/٧ بۆیه‌كه‌مجار ده‌وڵه‌تی ئه‌مریكا له‌لایه‌ن جۆرج واشنتۆن دامه‌زرا، به‌گشتی ئه‌مریكا له‌سه‌ر خوێنی هینده‌سووره‌كان دروست بووه‌و دامه‌زراوه‌.

نەهاتوون (سەلامی خوایان لیٚ بیٚ) مەگەر بە (توحید)ەوە نەبیٚت، مەگەر بۆ ئەوە نەبیٚت کەخەڵکی بەرەو پەرستراو (معبود)ی راستەقینە بانگ بکەن کەخوای تاكو تەنیایە، وە بەرەو شەریعەتی‌ئەو مەعبودە راستەقینەیە بانگ بکەن کە ئاینو بەرنامەکەیەتی، جا ئەوروپیەکان بەجیددی کەوتنە دژایەتی (عیسی)و لە بری ئەوەی کەبەقسەی‌بکەنو پەیڕەوی لەرێبازەکەی بکەن، سەرسەختانە کەوتنە دژایەتی‌کردنی بۆ ئەوەی بەرگری بکەن لەو کەلەپوور (تراث)ەی کەبریتی بوو لە بت پەرستی (الوثینة)وهەر لەدێرینەوە لەشارستانیەتی رۆمانەوە بۆیان جیٚمابوو، وە ئەو دژایەتیەیان بەپاڵنانو دەست لەپشت دانی جوولەکەکانیش دەکرد، چونکە جوولەکەکان گوتیان (مریم)ی دایکی‌عیسا زینای کردوە چونکە مێردی نی‌یەو عیسا بیٚ باوکەو بەزینا (بەبیٚ باوکی) لەدایك بووە!، بەو شێوەیە ، بەو ئەندازەیە دژایەتی عیسایان دەکرد کە نەك بەپێغەمبەری بزانن، بەڵکو بەزۆڵ (بیژو) یشیان دایە قەڵەم، بەڵام خوای زاڵ بۆ بەرگری کردن لەپەیامبەرو بەندە راستەقینەکانی خۆی، بۆ راست کردنەوەی هەڵەو پروپاگەندەکانی‌مێژوو، ئەم حەقیقەتانەی لەقورئانی‌پیرۆزداپشت راستو روون کردۆتەوە، بەڵیٚ دەفەرمووێ عیسا تەنهادایکی هەبووەو بیٚ باوکە، بەڵام خوای پەروەردگار بەقودرەتی‌خۆی عیسای خولّقاند وەك چۆن ئادەمی خولّقاند، جائەگەر عیسا دایکی هەیە خۆ ئادەم نەدایکی هەبووەو نەباوکی هەبووە، ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾:(آل عمران: ٥٩)، ئاوا جوولەکەکان دەستیان لەپشتی دەوڵەتی رۆمانییەکان دەدا بۆ دژایەتی کردنی‌عیساو، بۆ خامۆشو خەفە کردنی‌ئەو بەرنامەو پەیامەی کەپێی هاتبوو، تا سەرەنجام عیسایان هەر دەرکردو خۆی دالّدەو پەنا دەدا لە حەشارگەکان، لەمو ئەو قاچاغو یاساغ بوو لەدەوڵەتی رۆمەکان، چونکە جوولەکەکان هەمیشەو لەهەموو لا هەر سیخوڕی (جاسوس)یان

لەسـەر دەکرد، تاکو بیگرن‌و بنبڕی بکەن‌و لەداری بدەن، تا سەرەنجام ڕۆژێك یەکـێك لـە قوتابـیانی خـۆی خیانەت‌و ناپاکی لەگەڵ کردو هەواڵ‌و خەبەری لـێداو درکاندی کەعیسا لە کوێیە، بۆیە بەدەستەو کۆمەڵ چوون کەبیگرن، بەڵام بۆ پووچەڵکردنەوەی هەوڵە بەدو گڵاوەکانی ئەوان، خوای مەزن بەکڵاو ڕۆژنـەدا لـەو شـوێنەی کەتێـیدا بووسـەری خستو بۆ ئاسمان بەرزیکردەوە، بەبێ ئەوەی کەهیچ زیانێکی پێ بگات، وەك خوای باڵادەست دەفەرموێ:

﴿وَمَكَـــروا وَمَكَـــرا اللهُ وَاللهُ خَـــيرُ الماكرين۞ اذ قالَ اللهُ يا عيسى إنى مُتوفِّيك وَرافعُكَ الىَّ وَمُطَهِّرُكَ منَ الذينَ وَجاعِلُ الذينَ اتَبعوكَ فَوقَ الذينَ كَفَروا الى يومِ القيامة﴾:ال عمران (٥٤-٥٥):واتـە ئـەوان پیلانیان گێڕا بۆ کوشـتنی عیسا، خواش بە دەستەڵاتی خۆی، بە ویست و نەخشەو بەرنامەی خـۆی پیلانەکانی ئەوانی پووچەڵ کردەوە، چونکە خوا باشترین نەخشە ڕێژە، کاتـێك کـە خـوا فەرمووی: ئەی عیسا من دەمەوێ کە تۆ بۆلای خۆم بەرز بکەمـەوەو وەرت بگـرم و پاکـت بکەمـەوە لە پیسی و گڵاوی کافرەکان کە شایستە نین چی دیکە تۆ لە نێویاندا بژی و گوزەران بکەی.

وە لـە سـورەتی (النسـاء) دا دەفەرمووێ﴿وَما قَتَلوا وَما صَلَبوهُ وَلكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ﴾الآية (ئ١٥٥):بـەم شـێوەیە خوای پەروەردگار عیسای لە فروفێڵ و داوی جووەکـان پاراسـت، کەچـی ئێسـتاش گاورەکـان (نەسرانی‌یەکان) بەو پـڕوپاگەندەیەی جووەکـان بڕوا دەکەن و پێیان وایە عیسا گیراوەو لە سێدارە دراوە، بـەڵام قورئـان ئـەو ڕاستی‌یەشـی بـاش ڕوون کـردۆتەوە کـە نەخـێر وانـیە،بەڵکو کاتـێك کـە جوولەکەکان چوونە ژوورەوە بۆ ئەوەی عیسا(عـلیـە الصـلاة والسـلام) بگـرن، خـوای بـەرز بـۆ پاراستنی ئەو عیسای بردە سەر شـێوەی ئـەو قوتابی‌یـە ناپـاك و خائیـنـەی کـە ئەو پیلانەی بۆ دارِشتبوو و جاسووسی لەسەر دەکرد، بە فەرمانی خوا شێوە (شكل) ی عیسای وەرگرت و ئـەویان گـرت و کوشت، وە عیساش لە کڵاو ڕۆژنەی ژوورەکە سەرکەت و

لەلایـەن خـوای خۆیـەوە بەرزکـراویەوە، ئەگەرچـی ئەوانەی چوونە ژوورەکە گوتیان: ئەدی ئێوە دووکەس نەبوون، ئەوی دیکە چی لێهات؟!

جـا کە ئەو پیلان گێڕو جاسووسەیان گرت گوتی: من عیسا نیم، بۆچی مـن دەگرن، من ئێوەم دەست ڕاکێش کردووە، بەڵام جووەکان گوتیان نەخێر تـۆ عیسـای، دیسـان گوتـی: مـن ئەو نیم، بەڵکو ئەو تازە لێرە گوم بوو و بەرزکرایەوە، بەڵام هە بڕوایان پێی نەکرد.

خـوای پـەروەردگاریش ئـەو حەقـیقەتە لـە قورئـانی پیرۆزدا باش ڕوون دەکاتـەوە وەك دەفەرمووێـت :﴿ وَما قَتَلوا وَما صَلَبوهُ وَلكنْ شُبِّهَ لَهُمْ وانَّ الذيـنَ اخْـتَلَفوا فيه لَفي شَكٍّ منهُ مالَهُمْ به منْ علم الاّ اتباعَ الظَّنِّ وَما قَتَلوهُ يَقيناً۞ بَلْ رَفَعَهُ اللهُ اليه وَكانَ اللهُ عَزيزاً حكيماً﴾:(النساء: ١٥٤- ١٥٨) . واتـە: نەیانکوشـتو هەڵـیان نەواسی، بەڵکو خواشێوەی عیسای بردەسـەر شـێوەی یەکـێك لـەخۆیانو، ئـەوان تێیداکەوتـنە کێشەوناکۆکیو ڕاجـیایی، چونکە بەتەئکید نەیان کوشتن بەڵکو خوابەرزی کردەوە، جاکاتێك کەعیسـا لەنـێوایاندا نـەما جوولەکـەکان کەوتـنە دژایەتیکـردنیقوتابیو لایەنگـرە (حـواری)ە دڵسۆزەکانیعیساو سەرسەختانە دوژمنایەتیان کردنو کەوتـنە ڕاوە دوونانـیان، دەیانگرتن، دەیانکوشتن، زەختو فشارێکی زۆریان لـێکردن تـاکو هەڵگەڕێـنەوە وپاشـگەزببنەوە، بۆیـە فـریا نەکەوتن کەئەو تعالـیمو (ئـەو ئینجـیل)ەی کـە عیسا هێنابووی لەبەر پڕ مەینەتیان کۆی بکەنـەوەو بینووسـنەوەو بـڵاوی بکەنـەوە وەك خـۆی، بۆیـە کتێبەکە (یان کـەمتر لـەدەقی کتیـبەکەش( لەنـێویاندا دابـەشو پەرشـوبڵاو بـوو، دیارە مەبسـت لەوکتێـبەش (ئینجـیل)ە کە خوا وەك پەیامو دەستوور بۆ عیسای نـارد، ئینجـیل واتـە: مزگیـنیومژدە، بەڵام نەسرانیەکان (٧٠) ئینجیلیان هـەبوو، وەك دواتـر باسی لێوە دەکەین، بۆیە گاورەکان لەبەر عەیبەی دونیا کۆبوونـەوەو دەرەنجـام گوتـیان ئابڕوشـوومان دەچـێ، خوا یەك (ئینجیل)ی

ناردوه کەچی ئیمە (٧٠) ئینجیلمان هەیەو کێ پێمان بڕوا دەکا، چۆن ئەو هەمو ئینجیلە پێنە بکەین، بۆیە باکەمیان بکەینەوە، ئەوە بوولە (٧٠) کردیانە (٤) ئینجیل[٤٩]، ئیدی لەو کاتەوە دەست کرا بەگۆڕانو تێکدانو شێواندنی ئاینیعیسای مەسیح، بۆ یەکەم جار یەکەم کەس بەناوی (شائوول طەرسووسی) کە (بولّص)یشی پێ دەگوترێ دەستیکرد بەگۆڕینو شێواندنیئایینی پیرۆزی مەسیح، ناوبراو لەسەرەتادا زۆر دژایەتیمەسیحیەکانی دەکرد، کەچی دوایی لەناکاو جاری بوونە مەسیحیی خۆیدا، بەلاّم ئەگەر چی مێژوو نووسە ئەورووپیەکان کاتێك کە تەحقیقیان لەوە کردووە دەڵێن: دادگای بالاّی جوولەکە بەدەستوپلان ئەو پیاوەیان ناردۆتە نێو مەسیحیەکان، بۆ ئەوەی تێکیانداو ئایینەکەیان بگۆڕیو بشێوێنێ چونکە جوولەکەکان گوتیان هەرچەندە زەخت و فشار لەحەواریەکانو پەیڕەوانی عیسا بکەین، هەر سوورتر دەبن لەسەر ڕێبازی خۆیانو زیاتر پەرە دەستێننو گەشە دەکەن، زیاتر بەرگری لە خۆیانو لەئاینەکەیان دەکەنو بەرهەڵستیمان دەکەن، بۆیە وا چاکە کە بەو شێوەیە بچینە نێویانو لاڕێیان بکەینو ئاینەکەیان بشێوێنین، هەروەك کردیان.

وە یەکەم کەس کە لەنێوان نەسڕانییەکان دا مەسەلەی خوایێتیو پەرستراوێتی عیسای ورووژاند (بۆڵص) بوو کەوای لە خەڵکەکە گەیاند عیسا کوڕی خوایەو دەبێ بپەرسترێ، دەناپێشتر دەیانگوت عیسا بەندە (عبد)ی خوایەو، دایکی هەیەو باوکی نییە، بەلاّم بەندەی خوایەو، خوای بێ وێنە وەك ڕێزو تەقدیر هەندێك موعجیزەی پێ داون کەبە ئیزنی خوا مردوو

٤٩) ئەم چوار ئینجیلەش بریتین لەمانە( متتا، لۆقا، مرقس، یوحنا) کە گۆڕاونو گاورەکان بەئارەزوی خۆیان نوسیویانو گوایە کاریان پێ دەکەن کەپڕن لەشتی پڕو پووچو ئەندێشەو ئەفسانە بۆ هەڵخەڵەتاندنو، دەستخەڕۆکردنیمیللەتیخۆیان ، دەناکار بەوانەش ناکەنو بێ مەبدەئن.

زیـندوو دەکاتـەوەو گولیو بەڵەكو کەڕو کوێرو لاڵی زکماك چاك دەکـەوەو نـەخۆش چـاك دەکاتـەوە، بـەڵام هـەر عەبدیخوایەو نابێ بپەرسترێ، بەڵام (پۆڵـص) گومـانو جـیاوازیو دڕدۆنگـیەکی خستە نێوانیانو کوتی: مادام عیسـا مـردوو زیـندوو دەکاتەوەو ئەوهەموو شتانەی پێ دەکرێ ئەوە کوڕی خوایـە ئەگـەرنا ئـەوە لە توانای مرۆڤدا نیيە! بۆ ئەوەی بەهەڵەیاندابباتو لاڕێیان بکات لەئایینی راستەقینەی عیسا.

وە هـەر (بۆڵـص) بیروبۆچـونی (لاهـوتو ناسـووت)ی هێـنایە کایەو، گووتـی عیسـا دوو بەشـە، بەشـێکی لاهووتـەو پەیوەندی بەخواوە هەیەو، بەشـێکیتری ناسـووتە کـە پەیوەندی بەمرۆڤو خەڵکی سەرزەوییەوە هەیە، ئـیتر لەوسـاوە کێشەومشـتومڕ کەوتـە نـێوان نەسـڕانیەکانو لارێ بـوونو لەئەصڵی ئاینەکەیان لایاندا کە بریتی بوو لەخوا بەیەکگرتن (توحید الله)و، لـەو رۆژەوە تەوحـیدەکەیان خڵـتەی تـێکەوتو، نەسـڕانیەکان بوونـە دوو دەسـتە، دەسـتەیەك پێیان دەگوترا: لایەنگرو هەوادارانی (بۆڵص) کەبڕوایان بەسـێ پەرسـتراوێتیهەیە واتـە: (الاب، الابـن ، الروح القدس) کوڕو باوكو گـیانیپاك، کـە مەبەسـتیان پێـیان: خـواو عیساو جوبرائیلە، واتە بڕوایان بەسێکوچـکە (تـثلیـث) هەیـە، وەدەستەکەی تر پێیان دەگوترا، لایەنگرانی (توحـید) کـە زیاتـر شـوێنکەوتووی (ئاغـیوس) بوون، بەڵام لەساڵێ (۳۲) زاییـنی (قسـطنطین:یەکـێك بـوو لە ئیمپراتۆرە هەرە بەهێزەکانی رۆمو بوو مەسـیحی کـەتا ئەوکاتـەش کێشـەو مـلملانێ هـەر هـەبوو لەنـێوان ئاینیمەسـیحیو نـەیارانو تـێکدەرانیدا، واتە لەنێوان ئایینیمەسحیو بـــت پەرســـتەکاندا، جائــــەو (قســـطنطین)ە کـــەبووە مەســـیحی کۆبوونەوەیەکیگـەورەو فـراوانی بەزیاتـر لـە (۲۰۰۰) هەزار زاناو قەشەو پاپـاو گـەورە پیاوانیمەسـیحی کـرد بەناویکۆبوونـەوەی (النیقـیة) کـە کۆبوونەوەیـەکیزۆر نـاودار بـوو لـەو کۆبوونـەوەیدا، دوای تـاوو توێکردنو

مشـتومڕێکی زۆر بیروبـاوەڕی خوا بەسێ زانینو بڕوا بەسێ پەرستراو هەبوون واتـە ثڵـیث) پەسـندکراو بـڕیاری لەسـەر دراو، دەرەنجام ئەوانە وەلانرانو پەراوێـز کـران کەلەسـەر ڕێـبازی تەوحیدی عیسا بوونو دەیانگووت: عیسا گوتویـەتی: تەنهایـەك خـوا هەیـەو منـیش بـەندەی خـوام، ئەوانـە چەوسـێندرانەوەو، سەرەنجام ئایینی نەسڕانی ئەو مەسەلەی سیانە ثڵـیث)ی بەسەرداسـەپاو چەسـپا، دواتریش بۆ سەرگرتنی ئەو ڕێبازو بیرو بۆچوونەیان ئینجیلەکانیشیان کەم کردەوەو تەنها چواریان هێشتنەوە، کە (مەتتا،لوقا ، مـرقس، یوحـنا)نو ئـەو چـوارانەیان لەنـێو ئەوانـەدا هەڵـبژارد، وە ئـەوە ڕاسـتییەکەیە کەئـەوەی عیسـا لای خواوە هێناوبووی هیچ پەیوەندی نەبوو بـەوەی کـە دواتر لەکۆبوونەوەی (النيقية)دا بەئایینی عیسا لەقەڵەم درا، وە هـەموو مێژوونووسەکانی ئەورووپی دانیان بەوەداناوە کە (بۆلص) (شانوولی طەرسوسی) دامەزرێنەری نەسڕانیەتە، بۆ وێنە یەکێك لەزانا مێژوو نووسەرە ناودارەکانی ئەورووپی بەناوی (دیلّس) لەبەرگی (٣)ی کتیبی (معالم التأريخ الإنسـاني) لەلاپـەڕە (٦٩٥)ی دا دەڵـێ (شـائوول) بەیەکـەم دامەزریـنەری ڕاستەقینەی نەسرانیەتی ئێستا دادەنرێت، وەنەصڕانییەت هیچ پەیوەندیەکی بەئاییـنی عیساوە نیە!! هەروەها کتێبی (الدائر٢ :المعارف:البريطانية) بەرگی (٥) لاپـەڕە (٦٣٢) دەڵێـت: بـێگومان سـەیدمان (عیسـی) هـیچ کاتـێك بانگەشـەی ئـەوەی نەکـردوە ئـاخۆ لەڕەگـەزی خوایە یان کوڕی خوایە، یان لەرەگەزێکی باشـترو بەرزتـرە لەرەگـەزی مـرۆڤ، بـەڵکو هـەر گووتوویـەتی بەندەی خوام، بەڵام ئەو نەسرانیەتە ئەوەی داهێناوە کەعیسا کوڕی خوایە،کە (شـائول) نەخشەی بۆ داڕشتو دوایش (قسطنطين) بەڕەسمی دانی بەوە دانا و پەیڕەوی لێی کرد، وە (مۆریس بۆکاری) کەکابرایەکی ئەورووپی یە لەکتێبی دراسة:الكتب:المقدسة:في:ضوء:العـلم) دادەڵێت: هیچ شتێك لەبەرهەمەکانی (سـید مسـیح) نـەماوە لـەو ئینجـیلانەی کەهـەن، تەنانـەت وشـەیەکی

راســتەقینە نی‌یــە کــەوەك خۆی‌هــەڵگیرابێ‌و نووســرابێتەوە لەئینجــیلەکانی ئێســتادا، چونکە خوا تەنها (ئینجیل)ێکی بۆ عیسا ناردەووە، کەچی ئەوان (٧٠) ئینجیلــیان هــەبووە، دوایــی کردوویانەبە چوار ئینجیل، جادەبێ لەو چوارەشــیان کامــەیان ئــەو ئینجیلە ڕاستەقەینەی عیسا بێت، کە بێگومان هــیچ کامیان لەوانە ئەو ئینجیلە نیە کە خوای بێ وێنە ناردویەتیە خوارەوە بــۆ عیســا (علــیە الســلام)، جائەوە کورتەو پوختەیەك بوو لەسەرگوزشتەی نەســڕانیەت‌و مەسیحیەت وەك ئایین، ئەو ئایینەی کەلە (توحید)ەوە گۆڕدرا بۆ تثــیث)، ئەو ئایینە کەتام‌و بۆنی خوای پێوە نەمابوو.

بــەڵام بابــزانین ئــاخۆ پــیاوانی دین‌و دام‌و دەزگاکانی کڵێسا چیان کردو چــیان لــێهات !؟ دیــارە هەر لەو ڕۆژەوە کەزانایانی مەسیحی ناوی پیاوانی ئاییــنی (رجــال الدیــن)یــان لــەخۆناو بــۆ خۆیــان بــڕیاردا، کۆمــەڵگای مەســیحیەتیان بەرەو شتێکی تر ئاراستەو ڕێنمایی کردو بەجۆرێکی دیکەی دوور لەدیــنی هەقــیقی هەڵســوکەوتیان دەکــردو بەشــتێکی تــر لــەخۆیان دەگەیشــتن، ئەگەرچــی ئــەو زاراوەیــە واتــە (پــیاوانی ئاییــنی) لەڕوانگــەی حەقــیقەتی دیــنی خــواوە هــیچ ئەســڵێکی نی‌یــە، بەڵکو تەنها هەڵقوڵاوی کۆمــەڵگای ئــەورووپی‌و ئــەو پــیاوانەیە کەباسکران، چونکە زاراوەی (رجال الدیــن) لەیــەك ئایــەت‌و حەدیســی پێغەمــبەردا ﷺ نــەهاتووە، بــەڵکو تەنهازانایانی‌ئاییــنی هەیــە، کەزاراوەیەکی‌گشتگیرەو رەگەزی پیاوو ئافرەت دەگرێــتەوە، چــونکە لەئیسلامدا ئەوەی پیاوو ئافرەتی مسوڵمانە هەموویان بــەندەی خــوان‌و دین تەنها لەسەر پیاوان تاپۆ نی‌یە، بەڵکو دینی‌پیاوو ژن‌و تەنانــەت هــی منداڵەکانیشەو، هەموویان لەبەرانبەر دینی‌خوادا بەرپرسیارن، بۆیــە زاراوەی پیاوانی‌دین کەکۆمەڵە پیاوێك (خەڵکێك) هەبن کەتایبەت بن بــەدین‌و هــەر ئــەوان خــزمەتکاری دینی‌خوا بن‌و مشوور لەئایین بخۆن، ئەوە لەدیــندا نی‌یەو هیچ پەیوەندییەکی بەئیسلامەوە نی‌یە،بەڵکو ئیسلام هەموو

مسـولمانێك دەگرێـتەوە بەهـەموو چـینو توێـژو رەگـەزەكانی كۆمـەڵگای مۆڤایەتی‌یەوە،بـەڵكو ئـەو وشـەیە وەك زاراوە سـەرەتا لـە ئەوروپا سەری هـەڵداو، وەك پراكتیكـیش لەوكاتـەوە پیادەو پەیڕەو كرا كە پیاوانی‌ئایینی مەسـیحی كەوتـنە ژێـر فشـاری رۆمانـەكان، بەتایـبەت دوای ئـەوەی كـە (شائول) رێبازەكەی لێ گۆڕینو پەیڕەوانیشی دەستیان بەتەنازول كردن كرد، وە دوای ئـەوەی كەتەنازولـیان لـە (توحـید) كـرد تەنازولـیان لـەزۆر شتی دیكـەش كـرد، هـەروەك خاوەنی‌كتێـبی مـێژووی ئـەوروپا لەسـەددكانی نێوەڕاسـتدا (تـأریخ:أوروبـا:في:العصـور:الوسـط٤)دا كـە لـە ئینگلیزیـیەوە تەرجەمەكـراوە، دەڵـێ: (هۆشـیاریی‌و لێزانی پیاوانی كڵێسای مەسیحیەت لـەوەدابوو كەكاتـێك زانیان وا شالاوی بت پەرستی (وثنـیة)وبیروباوەڕی سێ خوایـەتی(تثـیث) زۆر بەهـێزەو، وا زۆریـان بـۆ دێـنێو ئەوانـیش ناتوانن بەرپەرچـی بدەنـەوەو بەربەسـتی بكەن، هەستان ئاینی مەسیحی‌یان لەگەڵ ئەو بیرو باوەڕو شالاوانەی‌بت پەرستی‌دا گونجاند دەڵێ: كەواتە ئەوان شتێكی ژیـرانەیان كـرد بـۆ ئـەوەی ئاییـنی مەسـیحی بەیـەكجاری لەنـێو نەچێت، ئاینەكەیان بە تثـیث) ەوە موتوربەكرد.

وە دواتر هەرشتێكی تر كە پێچەوانەی بیروڕاو ئارەزوی كۆمەڵگاكەیان بـوو، پـیاوانی ئاییـنی بەوپێـیە دەیانگۆڕی كەلەگەڵ ئارەزووی خەڵكەكەدا بگونجـێ، هـەتاوای لـێهات زۆر شـتیان دەستكاری كردو، دین بووە گاڵـتەو گـەپو یـاری پـێكراوی دەسـتی ئینسـانەكان، بۆیە ئەو دینە نەما كەپێی بگووتـرێ دیـنی‌خوا، دینی‌حەقـیقەت، بـەڵكو وەك هـەر بـیردۆزەو هـەر رێچـكەیەكی ئینسـانی لـێهات كەبەپـێی بیرو بۆچوونی‌ئینسانێك داڕێژراوە دوور لـە ئـایینو رێـبازی خـوا، بۆیـە ئێستاكە ئێمە هۆكارو عیللەتی ئەوە دەزانـین كـە ئەورووپـیەكان هەرچـەندە خۆیـان بەمەسـیحی دەزانی، كەچی لەهـەمان كـاتدا هەمیشـە گۆشـتی بـەراز دەخۆن و شەڕاب دەنۆشنو زینا

دەکـەنو سوود (ربا) دەخۆنو خۆیان خەتەنە (سوننەت) ناکەنو، هەموو ئەو شـتانەو زیاتـریش لەناشـەرعیەکان دەکەن. بەشتێکی حەڵاڵو ڕەواو ئاسایی دەزانـن، لەمـێژووی وڵاتانی ئەورووپادا هـاتوە کەهـەموو ئەوشـتانەی دوایی لەدینی مەسـیحیەتدا زیـاد کـران، چـونکە ئەوانـە هـەمووی لەفەرهـەنگو بیروبـاڕودی ئـیغریقو ڕۆمانیـیەکاندابوون، وەپیاوانی مەسیحی لەحەقیقەتی (شـەرعو عەقـیدە) دابـەزینو چـوونە سـەر بـیروڕای ئـەوانو بەدوای ئەوان کەوتن، ئەوان ئەو شتە خراپو پڕوپووچانەیان لەفەرهەنگی خۆیان خستە نێو ئاینی مەسیحیەت.

## ئەو شتانەی کڵیسا لە ئاینی مەسیحیەت دایهێنان؟!:

### ١- دروستکردنی چین (طبقة)ی (کەهەنووت): واتە پیاوانی ئایینی (ئەکلیرۆس):

ئـەوە یەکـەمین دەردو بـەڵا بـوو کـە پـیاوانی کڵێسـا بەسـەر دیـنی مەسـیحیەتیاندا هێـنا، ئەگـەرنا عیسـی (علـیەالصـلا۲ والسـلام) پێغەمـبەرێکی زۆر زاهـید بـوو وبەسـادەیی دەژیـا چـونکە لەژیانی‌دا ژنی نەهێـناوەو هەر باسی ڕووحانیەت و زوهدو دونیا بە کەمگریی کردوەو، زۆر باسـی ئاکـارو ئـەخلاقی کـردوەو، باسی پەروەردەو ڕاهێنانی دڵو دەروونو ئەندامەکانی لاشـەی مـرۆڤی کردوە لەسەر چاکە، بەگشتی زۆر سادە ژیاوەو دونـیای بەکـەم زانـیوە، بۆیە هەرگیز ڕۆژێك نەهاتووە دین وەك هۆکارێکی ژیـان لەبەرژەوەندی خۆی بەکاربێنێو بازرگانی پێوە بکات بۆ ژیانو بژێوی خۆیو، تەنازولی لێ بکات بەڵکو هەمیشە تەنهاپەیڕەوی لەفەرمایشتەکانی خـوای پـاكو بـێ گـەرد دەکـردو لەفەرمانـەکانی ئـەو لای نەدەدا، کەچی پـیاوانی ئـاردزوو بازو دونیا ویستی کڵێسا، بەناوی ئاینەوە هەستان خۆیان بەچینێکی جیا لەچینو خەڵکانی تری نێو کۆمەڵگا پیشاندا لەهەموو ڕووێکی

ژیانــەوە، بگــرە هــەر لــەجلو بــەرگو چــۆنیەتی ژیــانو گوزەرانــیاندا، لەعیبادەتــیانداو، لــە تەفەسیرکردنی کیتابی موقەددەسیاندا، لەهەموو ئەو شــتانەو لەگەلــێك شــتی تریشــداخۆیان جــیاکردەوە لەخەڵکەکــەیان، بۆیــە بەکــەیفی خۆیــان (کتێــبی موقــەددەس)یــان دەگــۆڕیو پێناسەیان دەکردو، تەنهابــەمولکیخۆیان دەزانیو لەسەر خۆیان تاپۆ کردو، لێکدانەوەو تەئویلی خراپیان بۆ دەقەکانی دەکرد.

وە کــە لەئیســلامدا هەموو کەس بۆی هەیە قورئانی خوا بخوێنیو لێی وردبێــتەوەو تێیبگــات، لــەلای کلێســاو پــیاوانی ئاییــنی شــێوێندراوی مەسیحی وانەبووە، بەڵکو تەنها لەدوای (ڕێنیسانسەوە) خەڵکی ئەومەجالو بــوار دەروازەیــان بــۆ کــرایەوەو ڕێگــەیان پــێ درا کە لە کیتابیموقەددەس وردببــنەوە، ئەگەرنا پێشتر جگە لە پاپاو [illegible] قەشەکان کەس بۆی نەبوو ســەرنجی (ئیــنجلو تــەوڕات) بـ[illegible]ـتو بیزانێــت، بــەڵکو دەبــوو تەنها پاپاو قەشەکان (ئینجلو تەوڕات)بۆ خەڵك راڤە (تفسیر) بکەن، ئەگەرنا کەسی تر ئــەو توانــاو مــتمانەو دەســتەڵاتەی نــەبوو کــەکاری وا بکات، ئەوە لەڕووی ئایینییەوە، وە لەڕووی فیکرییەوە کەنیسە کارەساتێکی زۆر گەورەی بەسەر ئایــنی مەســیحیەتدا هێــناو، ئاشــووبو ئاژاوەیــەکی زۆری تــیادانایەوەو بەرپاکــرد، بــۆ وێــنە تەنانەت کیتابی موقەددەسی گۆڕیو (تحریف)ی کردو، پــڕی کــرد لــەبیروباوەڕی پــڕوپووچو (فەلســەفی) زادەی بــیرو بۆچــوونی ئینســانێکی نــەزانو دوور لــە خــوا بــۆ نموونــە (بطــیموس) و (ئیقلــیدس) دووزانــای گەردوونناسی ئیغریقی بوون، ئەو بیردۆزانەی کە ئەوان هەیانبوون دەربــارەی بوونــەوەر هــەموویان وەك حەقیقەتــێکی دینی لەگەڵ (ئینجیلو تەورات)دا پەیوەست کرد، بۆ وێنە (بطیموس) دەربارەی بوونەوەر دەیگووت: زەوی چەقی بوونەوەرەو هەموو ئەستێرەکان بەدەوری زەویدا دەخولێنەوە، و مەسیحیەکانیش ئەوەیان چەسپاندو بڕوایان پێی کرد، وە بڕواشیان بەهەموو

ئـەو شـتانە کـرد کـە (ئەرسـتۆ) هـەندێك خەیاڵاتی خۆی بەناوی زانستەوە دەربـارەی سیاسـەتو حوکمـڕانو پزیشـکی پیشـان دەداو دەیخسـتنەڕوو، مەسـیحیەکان پەیـڕەویان لەسەرجەم لەو شتانەی ئەویش دەکرد، ئەگەر چی لەئەسـڵدا کـەمتر حەقیقەتـیان تـێدابوو، وە هەرشـتێك کـە (ئەرسـتۆ) یان بطـیموس) یان (ئیقلیدس) گوتبوویان، ئەوان بەموقددەسیان دەزانیو لێیان لانـەدەدا، بـەڵکو هـەر شـتێکیتر پێچەوانەی بیروڕاو قسەو بیردۆزەی ئەوان بوایـە، پـیاوانی ئاییـنی ئـەو شتەیان بەکوفر دەزانیو بەپێچەوانەی کتێبی موقەددەسـیان دەزانـیو ڕووبەڕووی دەبوونەوەو دەیانگووت تۆچۆن ئەو شتە لەخۆڕا دەڵێی، ئەوەتا دەبینین کە (کۆپەرنیك) لەساڵی ١٥٤٣ز دا کتێبێکی بـەناوی جووڵـەی خڕۆکەی ئاسمانییەکان (الحرکات الاجرام السماویة) نووسی کەتەرجەمـە کـراوەتەوە سـەر (عـارەبی)، کەهێشـتا (تەلەسـکۆب)یـش دانەهاتبوو، ناوبراو لەو کتێبەیدا دەڵێت: زەوی یەکێکەلە خڕۆکەکانو زەوی سەنتەرو مەرکەزی بوونەوەر نییە، دەیارە ئەمەش تەواو پێچەوانەی ڕاو بیرو بۆچـوونو بیردۆزەکـانی بطـیموس:و ئیقلـیدس)ە سـەبارەت بەگـەردوونو بوونـەوەر، بۆیــە دادگـای پشـکنین (محکمـە التفتـیش) کـە تایـبەت بـوو بەسانسـۆری ئایدیۆلۆژیـا (مراقبة العقائد)یخەڵی، کەلەلایەن کلێسا بۆ ئەو مەبەسـتە دروسـت کـرابوو، داخۆ چ کەسێكو چ دەزگایەك قسەیەك دەکات کەپێچـەوانەی بـیردۆزەی ئـەو زانایانـەو پێچەوانەی تەعالیمی کلێسا بێت، بۆیـە ئەو دادگایە ویستیان (کۆپەرنیك) بگرنو لەسێدارەی بدەن، هەرچەندە ناوبـراو قەشـە بـوو، بـەڵام بـەر لەوەی کەدادگای ناوبراو دەستگیری بکات وەفاتیکردو لەچەنگ ئەوان ڕزگاری بوو!.

بەڵام دوای ئەو کاتێك (جۆردان برۆنۆ)ی ئیتاڵی ئەو بیردۆزەیەی زیندوو کـردەوەو کاریپـێ کـرد، دادگـا (٦) ساڵێ زیندانیکردولەساڵی (١٦٠٠)دا چـیخێکیان پـێوە پێچـاو نەوتـیان پـێداکردو بەبەرچـاوی ئاپۆڕەی خەڵکەوە

گـرپانداو كـردیانه سـوتماك‌و خۆڵه‌مـێش، ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه ده‌یگووت: زه‌وی چه‌قی بوونه‌وه‌ر نی‌یه، به‌ڵكو خڕۆكه‌یه‌كه له‌خڕۆكه‌كانی بوونه‌وه‌ر.

وه‌چـه‌ند سـاڵێك لـه‌پاش ئـه‌و (گالـیلو)[٥٠] سـه‌ری هه‌ڵداو (ته‌لسكۆب)ی داهێـنا، وه له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌ی بـه‌هۆی ئـه‌و ته‌لسـكۆبه‌وه بڕوای به‌بیردۆزه‌كانی (كۆپه‌رنیك برۆنۆ) كرد، له‌سه‌ر ئه‌وه دادگا (گالیلۆ)ی له‌ته‌مه‌نی (٧٠) ساڵێ داگـرت‌و زیندانی‌كرد، پاشان له‌وێ چه‌ند (ویرد)ێكی‌له‌سه‌ر فه‌رزكرا كه ده‌بێ رۆژانـه بیان خوێنێ‌و تۆبه بكات تاكو پاك ببێته‌وه، جادوای (٣) ساڵ چوونه لای‌و (گالیلۆ) پێی گوتن؛ ئه‌گه‌ر رێگه‌م بده‌ن په‌شیمان ده‌بمه‌وه‌و ئازادم بكه‌ن بـا لـه زیـنداندا نه‌مـرم‌و له‌بـه‌رده‌می‌پاپا له‌بیروبۆچوونه‌كانی خۆی دابه‌زی‌و گووتـی: ئـه‌وه بیرۆكه‌یـه‌كی شـه‌یتانی‌یه بـۆم هـاتوه‌و ئێسـتا لێی په‌شیمان ده‌بمه‌وه‌و جارێكی‌تر ناچمه‌وه سه‌ری‌و هه‌ڵه‌ی وا ناكه‌مه‌وه‌و، ناڵێم زه‌وی خڕه‌و ده‌سورێته‌وه، ئه‌وه له‌كتێبی (معالم تأريخ الانسانية)دا له لاپه‌ڕه (١٠٠٨)ی به‌رگی یه‌كه‌می‌دا هاتووه.

وه‌لـه كتێـبی‌(قصة:الـنزاع:بـين:الديـن:والفـلسـفة)دازۆر نموونه‌و بابه‌ت لـه‌وباره‌وه هـاتوون. بـۆ وێـنه رۆژێـك مامۆسـتایه‌كی ئاییـنی مه‌سـیحی له‌وسـاته‌ی كه‌ده‌رسـی به‌قوتابـیه‌كانی ده‌داو لـه‌و مـیانه‌وه باسـی ئه‌سـپ ده‌كرێـت، قوتابیه‌كیش ده‌پرسێ: ئایا مامۆستا ده‌بێ ئه‌سپ چه‌ند ددانی له شـه‌ویلاگه‌دا هـه‌بێ، لـه‌وه‌لامدا مامۆسـتاكه گووتـی: كوڕم ئه‌وه له‌كتێبی موقه‌دده‌سـدا نـه‌هاتوه‌و باسـی ئـه‌و مه‌سـه‌له‌یه مه‌كـه، چـونكه هه‌رشتێك له‌كتێـبی موقه‌دده‌سـدا نه‌هاتـبا كـه‌س بۆی نه‌بوو باسی لێوه بكات، به‌ڵام یه‌كـێك له قوتابیه‌كان گووتی: مامۆستا خۆ ده‌توانین شه‌ویلاگه‌ی ئه‌سپێكی

---

٥٠) گالیلۆ گالیلی: فه‌یلوسوفێكی‌گه‌ردووناسه له ١٥٦٤له (بیـنرا)ی ئیتالیا له‌دایك بووودو له ١٦٤٢دامردووه.

تۆپــیو یــا ئەســپێکی زیــندوو بهێــنینو ددانــەکانی بژمێرین ئەوسا بەڕوونی دەزانــین کەچــەند ددانی هەیە!، مامۆستاکە زۆر لێی تووڕە بوو، پێی گوت: ئەگــەر لــەو قســانەت پەشــیمان نەبیەوە ئەوە دەرت (فصل)ت دەکەمو دەت دەمــە دادگــای لێکۆڵیــنەوەو پشــکنین، بۆیــە بەناچاری قوتابیەکە یەکسەر پەشــیمان بــۆوەو داوای لێبوردنی لە مامۆستاکەی کرد، بەو شێوەیە بەناوی ئــایین لەگــەڵ مەسائیلی سیاسیو فکیریو فەرهەنگیو زانستیدا ڕەفتاریان کردوە.

وە(مارتن لۆتەر) کابرایەك بوو کەبزووتنەوەی پرۆتستانتی لە ئەورووپا بەرپاکــرد، بەئومێدی بژارکردنی نەصرانییەت لەهەڵەو پەڵەو تازەکردنەوەی دین، بەو شێوەیە کۆمەڵێك شتی تازەو نوێی لە ئایینی نەسرانیەتدا داهێناو ورووژاند لەدژی دەسەڵاتو بیروڕای پاپاو قەشەکان، بەڵام پاپایەکان لەساڵی (١٧٥٢)دا قەســابخانەو کوشــتارگەیەکیان بــۆ پرۆتســتانەکان ســازدا بەناوی قەســابخانەی (ســانتی بــارتلی) کەلەیــەك شــەودا(١٠٠) هــەزار کەسیان لێ کوشــتن!! وە تــەنها لەســەدەی (١٣) تــا ســەدەی (١٨)دا لەســەر فەرمانی دادگــای تەفتیش (٩) ملیۆن مرۆڤیان کۆمەڵکوژو تارومار کرد کە زۆربەیان گــاورو نەســڕانی بــوون تــەنها لەوانــە کۆمەڵــێك نــەبێ کەمســوڵمانی (ئــەندەلووس) بــوونو هەڵــنەگەڕانەوە، ئەگــەرنا هــەموویان ئیــبادە کــردن بەفەرمانی مەحکەمەی خوێن ڕێژی نەصرانی.

ئێســتا مەسیحیەکان(٣) خــەتو ئیتتجاهن کەئەمانەن (کاسیۆلیك- پرۆتســتانت- ئــۆرثدۆکــس)، جــا ئەوانــەی کەدادگای پشکنینیان داناوە و دەســتەڵاتی ڕەهــا (مطلق) یــان بــەخۆداو ئــەو قەســابخانەیان بەرپاکــرد، کاسیۆلیکەکان بوون.

٢- **كلێسا لەڕووی ڕووحی‌یەوە:**

أ- گۆشـە نشـینی (الرهبانـیة)یەکـێك لەوشتانەی پیاوانی کلێسا لەلایەنی رووحـیی‌یەوە لەدینی‌مەسـیحیەت دایانهێـنا بریـتی بوولـە گۆشەنشـینی (رهبانـیة) وەك خـوای بـەرز دەفەرموێـت: ﴿**وَرَهْبَانِـــيَّةً ابْـــتَدَعُوهَا مَـــا كَتَبْـــنَاهَا**﴾(الحديـــد: من الآية٢٧) واتە: گۆشە نشیی‌یان لەنێو خەڵکەکەدا داهێـنا کەئـێمە لەسـەرمان فـەرز نەکـردبوون، بـەڵکو خۆیـان دایان هێناو پـەیدایان کـرد. جاداهێـنان و شـت لەدیندایەیداکردن‌و بڕیاردان زۆر خەتەرو گرفـتە، چونکە خوای بێ وێنە ئینسانی دروست کردوەو هەر ئەویش دەزانێ کـە ئادەمـیزادو ژیـن پێویستی بە چ دین‌و بەرنامەیەکی ژیان هەیە، جا کە لێـت زیـادو کـەم کـرد کەموکوڕی‌و گێرو گرفتی زۆر گەورە ڕوودەداو ژیانی ئینسـان تـێك دەچـێ‌و تێك دەگیرێت. وە نەصرانیەکان ڕەهبانیەتیان لەسەر ئـەو ئەساسـە هێـناوە کـە ئادەم گوناهی کردوە، بۆیە خوا (عیسا)ی کوڕی خـۆی ناردۆتـە خـوارەوە بۆ ئەوەی ببێتە قۆچی قوربانی‌و گوناهەکانی ئادەم بسـڕێتەوەو مەسیح ببێتە بەلاّ گێڕەوەی بەشەرییەت!، دەڵێن: ئادەم گوناهی کـردوە کەچـی دەبێ عیسا باجەکەی بدات!، وە دەڵێن رەهبانیەت بۆ ئەوەیە کـە دەبـێ زۆر خـۆت ئەزیـەت بدەیـت، چونکە عیسا کوڕی خوایەو بوو بە بەلاّگـێڕەوەی مرۆڤایەتی‌و بوو بەباج‌و کەفارەتی پێناو گوناهەکانی‌ئادەم، جا هـەر کەسـێکیش کەدەیەوێت گوناهی لەکۆڵ ببنەوەو پاك ببێتەوەو خوا لێی رازی بێـت، دەبێـت هەمیشــە زۆر خـۆی ئەشـکەنجەو ئـازار بـدات‌و خـۆی ناڕەحـەت بکـات‌و خۆی بفەوتێنێ، هەربۆیەش راهیبەکان ژنیان نەدەهێناو، خۆیـان نەدەشـۆرد، خۆیـان بـۆن خـۆش نەدەکـردو، خۆیـان پـاك‌و خـاوێن نەدەکـردو، خواردنـی خۆشـیان نـەدەخوارد، ئـەو شـتانە کە لەگەڵ سروشت (فطرة)و عـەقڵ‌و ژین دا نەدەگونجان ئەوانەیان ئەنجام دەدا.

ب- وەیەکێکیتر لەوشتانە کەکڵێسا دای هێنان مەسەلەی قوربانی پیرۆز (القربان المقدس)ە کە ئێستاش هەر هەیەو بەردەوامەو، نەسرانیەکان (عید الفصح)ی پێ دەڵێن، یان (العشاء الرباني) کەمەبەستیان ئەوەیە گوایە رۆژێ عیسا نەسرانییەکانی داوەت کردووەو (حوارییەکان)یش نانو شەرابیان بۆ داناون، جادەڵێن عیسا گوتوویەتی: هەرکەسێك ئەو نانە بخوات ئەوە وەك گۆشتی منی خواردبێو چووبێتە ناو لاشەی من وایە، وە هەرکەسێك ئەو شەرابە بخوا، وەك ئەوە وایە کەخوێنی منی چووبێـە نێو لاشەوە!، کەواتە خواردنی ئەو داوەتە، واتە خواردنیخوێنو گۆشتی من کەبەوە تێکەڵ بەمن دەبێت، بۆیە ئێستاش ئەوان جەژنێکیان هەیە کەتیایدا نانو مەی (شەراب) دادەنێن، گوایە نانەکە گۆشتی عیسایەو شەرابەکەش خوێنی عیسایە!، ئای لەو خەیاڵو ئەفسانەیەی کە بێگومان لە نەقڵو مێشکی کەسداجێگای نابێتەوەو خۆی نانوێنێ، کەچی زۆر بێ شەرمانە ئەوانە ئێستاش لەگەڵ ئەوپەڕی پێشکەوتنی زانستو تەکنۆلۆژی تازەی سەردەمدا، هەر ئەو داوەتو پروپاگەندانە دەکەنو ئەو شتە پڕوپووچو ناژیرییانە بڵاو دەکەنەوە، کەچی خۆیان بەپێشکەوتووش دەزانن، دیارە ئەوانە تەنها بۆ لە خشتەبردنو چەواشەکردنی گەلانی گێتییە، بۆ ئەوەی بیرو هۆشیان بەنج و سڕ بکەنو لاڕێو بێ هۆشیان بکەن.

ج- وە هەروەها پەیکەرتاشیو پەیکەر پەرستیو بت وسەنەم پەرستیان داهێنا کەپێشتر نەبوو، وەك (ویل دیورانت)ی نووسەری پەرتووکی (قصة الحضارة) لەبەرگی (٢٤) لەلاپەرە (١٥٤)دادەڵێت: لەسەرەتاداکڵێسە زۆر دژی پەیکەرتاشیو وێنە سازیو ئەو جۆرە شتانە بوو، وە بەشوێنەواری بت پەرستەکانی دەدایە قەڵەم، بەڵام دوایی کەکڵێسا ئینحرافیکرد، ئەوسا پەیکەرتاشیو پەیکەرسازییان هەزم کرد.

د- وەکلێســاو پاپایەکان (صكوك الغفران)یان داهێنا، واتە چەکو پسوولەی لێخۆشــبوون، بــۆ وێــنە پاپا بەیەکێکی دەگووت: هەر کەس بیەوێ خوا لێی خــۆش بــێو، بەهەشــتی پێ ببەخشێ؟، ئەوەندە پارەیە دابنێ خوالێی خۆش دەبــێو، یەکســەر پسوولەیەکیان بۆ دەکردو پێان دەگووت، ئەوە لەبەرانبەر ئــەوەدا مــن تــۆم عەفووکــرد لەجــیاتی عیســا، وە عیساش لەجیاتی خوای گــەورە تــۆ عــەفوو دەکــات، چــونکە عیسا کوڕی خوایە، بەڵکو بەهەندێك کەســیان دەگــووت: لەبــری ئــەو پارەیەو بەو پسوولەیە وا لەگوناهی رابردوو داهــاتووت خــۆش بــووم، بــەڵکو لەوەش زیاتر زێدەڕۆیی (غلو)یان کرد، بۆ وێــنە بەهــەندێك کەســیان دەگــووت وەرە باپســوولەی لــێخۆش بــوون بــۆ مردووەکانیشــیتان بکــەین تــا لەمردووەکانیشتان خۆش بین، جا بەم شێوەیە خەڵکــیان چەواشــە دەکــردو تەفرەیان دەدا، بەڵام دەگێڕنەوە کەپیاوێکی زۆر دەوڵەمــەند هــەبووەو زۆر زۆرزان بــووە، تەماشــای کــرد کەقەشــەو پاپایــەکانو(کلێســا) ئــاوا ئــەو خەڵکە دەچەوسێننەوەو لەخشتەیان دەبەنو پارەیــان بــەخۆڕایی لێ دەستێنن، رۆژێك ئەو دەوڵەمەندە زۆرزانە چووە لای پاپــاو پــێی گــووت: مــن هــاتووم کە سەودایەکت لەگەڵدا بکەم، پاپا گوتی ســەودای چی؟، دەوڵەمەندەکە گووتی دەمەوێت:جەهەننەمت لێبکڕم، پاپا سەری سوڕماو، واقی وڕماو گووتی: جاتۆ جەهەننەمت بۆ چییە، خۆ خەڵك بەهەشتیگەرەکەو دەیکڕێ؟!، کابرا گوتی: من هەر جەهەننەمم دەوێ، بەڵام هەموویــت لــێدەکڕم بەگۆتــرە، پاپــا لەتەنگە تاویان هەردەی گوت ئاخر تۆ جەهەننەمــت بــۆ چــییەو نــەیدەزانی چــی بکاتو چۆن پەشیمانی بکاتەوە، کابــراش هــەر دەیگــووت: ئاخر من پێویستیم بەجەهەننەمەو پارەی خۆمەو پــێی دەدەم، دەرەنجــام بەبــڕە پارەیــەکی دیاریکــراو جەهەننەمی لێکڕیو، دوایــی لەنێوخەڵکی بڵاوی کردەوە کەمن جەهەننەمم لەپاپا کڕیوەو باکەس لەمــەودوا لەجەهەنــنەم نەترســێو بابەهەشــت نەکڕێو بەهەشتی بۆ چییە،

خـۆم لێـناگەڕێم بچـنە نـێو جەهەنـنەمو عـایدیخۆمەو، بۆ پارە بەبەهەشت دەدەنو ئـەو قسـانەی بڵاوکـردەوە، تـا خـەڵك تێـبگات کەعەفووکـردنو بەهەشـتو جەهەنـنەم هیچـی بەدەسـت پاپـا نیـیـە. وە دیسـان (ویـل دیورانـت)لەکتێبەکەیدا دەڵێ: یەکێك لەپاپاکان گووتی: پاپا نوێنەریخوایەو سـێبەری خوایـە لەسەر زەوی، بۆیە دەبێ دەستەڵاتی رەها (السطلة المطلقة) هـی ئـەو بێـت بەسـەر چـینی(حـاکم و محکوم)دا، بەجۆرێك کەهیچ پادشاو ئیمـپراتۆرێك بـۆی نـەبوو کەبەبێ بڕیاری پاپا لەسەر تەختو بارەگای خۆی دابنیشـێو کاربکـاتو بڕیار بدات، وەپاپا لەهەر فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارو ئیمـپراتۆرێك تـوڕە بووبایـە، ئـەوە تـەنها لـەماوەی یەك رۆژدا لای دەداو دایدەبەزاند.

### ٣-لەڕووی سیاسیەوە:

هـەروەك باسم کرد هەرچی حوکمو دەستەڵاتی سیاسییە بەدەستیخۆیانەوە بووە،

لێرەدا لەو بارەوە تەنها دوونموونەتان بۆ لە مێژوو دێنمەوە:-

١- (هەنـری چـوارەم)ی ئیمپراتۆر کە لە ساڵێ (١٥٧٦)مرد، کاتێك کەپاپا لـێی تـووڕە بوو، لەبەبر ئەوە (٣) رۆژان لەنێو بەفردا بەپێیەتیو بەپێ خواسـی ڕای گـرتو تەوبـەی پێ کرد، پاشان خەڵك تکا(شەفاعەت)یان بـۆ کـرد، ئیـنجا عـەفووی کردوو لێیگەڕا، ئەوەش تەنها لەبەر ئەوەی کەگوتـبووی بـۆ پاپـا دەسـتیلە کاروبـاری سیاسـی دەوڵـەتو حوکمڕانییەوە وەردەدات!!

٢- وە (فریدریك) کەئیمپراتۆرێکی رۆمەکان بوو، لەساڵێ (١١٧٧) دامرد، بەهـەمان شـێوە، پاپـا سزاو ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر سەختو دژوارو

نامـرۆڤانەی دا، تـەنها لەسـەر هـەندێك رەئـیو تـەرح و پێشـنیار كە لەبەرانبەر پاپا دا كردبوونی.

**٤- لەڕووی ئابووریشەوە:**
دەسـتەڵاتی كلێسـاو، پیاوانی ئایینی لەڕووی داراییەوە بەشێوەیەك بووو، بەشـێوەیەك دەژیـان كـەزۆر لـە ئیمپراتۆرە زلهێزەكان زەنگینو دەوڵەمەندتر بـوون، بـەجۆرێك كەسـامانو دارایـیو زەویو زارو كۆیلەیـەكی زۆرو بـێ ژماریـان هـەبوو، سـاڵانە سـەرانەو باجـیان لەهەژارو نەداران وەردەگرتو، سـۆغرەیان بەخـەڵكی دەكـردو، هـەموو بارگرانیەكیان بەهەژاران دەكردو، هـیچ كەس خاوەنی هیچ شتێكی خۆی نەبوو لە بەرامبەر پیاوانی كلێساداو، زۆر زوڵمو شتی ناشیاویان بەناوی‌ئاینەوە دەكرد.

كەواتـە بـەكورتی (سـیكولاریزم) لەو هەلو مەرجەو باردۆخە سەختو دژوارەداو، لەبەرانبەر ئەو دینە تێكدراوو شێوێنراوەدا لەبەرانبەر ئەو هەموو دامو دەزگـا داپڵۆسـێنەرو سـەركوتكەرە بـەناو ئایینـیانەدا دروسـت بـوو كـەڕێیان لەزانسـتو لەبـەرەو پێشەوەچـوونی ژیان دەكرت، كەواتە خەڵكی ئـەورووپاو (مـاركس) گـێل نـەبوو كەدەیگووت: دین تلیاكی گەلانە (الدین افـیون الشـعوب) ئەگـەر مەبەستی پێ لە ئایینی شێوێندراوی مەسیحیەت بـێ، ئەگـەرنا بەرانـبەر بـە ئیسـلام هەركەس ئەوە بڵێ ئەوە درۆی كردوەو هەڵەیـەو راسـت نـیە، چـونكە ئیسلام بەرنامەی گشتگیرو بێ‌هەڵەو پەڵەی ژیانـەو، كلـیل و چارەسـەری هەموو گیرو گرفتەكانە ئینسان بانگ دەكا بۆ خواپەرسـتی راسـتەقینەو چەسـەپاندنی دادگەریو هەوڵدان بۆ پێشكەوتن و زانـیاریو ئـاوەدانی، بەڵام ئەوان هەر شارەزای ئایینی شێوێندراوی نەسرانی بوونـە، بۆیـە وایـان بـیر لـەدین كـردۆتەوەو، وایـان حوكم داوە، بەراستیش

ـ یینی گۆڕاوی نەسرانی تلیاك بوو، خەڵكی پێ بەنجو سڕو بێ هۆش كرابوو، هەمیشە كۆسپو تەكەردو ئاستەنگ بوو لەبەردەم زاناریو پێشكەوتن دا، لەبەر دەم عەقڵو هۆشدا، لەبەردەم بیركردنەوەو بەرژەوەندی كەندا .لەبەردەم پێشكەوتنو ودرچەرخانی ژیاندا،بۆیە كۆمەڵگای ئەورووپا ناچاربوون كەلەبەرانبەریدا بوەستن و لێی راپەڕن، ئەوە بوو سەرەنجام زاناو فەیلەسوفەكانیان بەو واقیعە رازی نەبوونو ڕەخنەیان دەگرتو سیاسەتمەدارو چاكسازەكان كتێبو گووتاریان لەسەر ئەو بارودۆخە ناهەموارە داسەپاوە دەنووسیو، شاعیرەكان لەشیعرەكانیاندا توانج و پلاریان لەپاپاو ئایینو دەسەڵاتدارەكان دەگرت، تا سەرەنجام شۆڕشی فەڕەنسا لەساڵی (١٧٨٩) لە دژی كڵێسا بەرپابوو، وەك دوایین كوتەكو بزمار لە تابووتی ئایینی شێوێندراوی مەسیحیەتو لە داموو دەزگا زۆردارەكانی كڵێسا دراو، لەو ڕۆژەوە گلۆڵەی كڵێسا كەوتە لێژیو خەڵك ڕزگاری بوو لەكۆتو زنجیری كڵێساو پاپا خۆپەرستەكانو، لەو كابووسو دێوەزمە ڕەشە رزگاری بوو كەساڵەهای ساڵ بوو خۆی بەسەر خەڵكەوە سەپاند بوو، وە خەڵكی لە دەستی چەوسێنەرو زۆردارو خوێن ڕێژو خوێن مژانی رزگاریان بوو، ئەوانە كەهەمیشەو بەهەمووجۆرێك وەك زەروو خوێنیگەلیان دەمژیو لەبەرژەوەندیخەلكیان دەدا. بۆیە یەكێك لە دروشمو شیعارەكانی شۆرشی فەڕەنسا ئەوە بوو كە دەیانگووت! (أعدموا أخر ملك بأمعاء أخر قسيس) واتە: دوایین پادشا لەسێدارە بدەن بەریخۆڵەی دوایین پاپاو قەشە. واتە: سەرەتا قەشەكە بكوژن بیفلیقێننەوەو ریخۆڵەكەی دەربێنن، ئینجا بەڕیخۆڵەكەی ئەو پادشایە بخنكێننو لەسێدارەی بدەن، تاكو لەهەردووكیان ڕەزگارمان ببێ، چونكە هەردووكیان یەك لەیەكی زاڵمترن).

## خاڵی سێیەم

### بەرهەم و شوێنەواری سیکۆلاریزم لەژیان و گوزەرانی خەڵکی خۆرئاوادا

رۆژاوا لەو بارودۆخەدا دەژیان کەباسمان کرد، بۆیە شۆرشیان بەرپاکرد بەرانبەر بەدینی شێویندراوی نەسرانیەت و دام و دەزگا ستەمکارە ئایینیەکان، چونکە هیچ چاریان نەبوو، یان دەبوو هەر لەو وەزعە دژوارو سەختەی خۆیاندا بژین و بمێننەوە، یان دەبوو دژی ئەو دینە بوەستن، کەهەر ئەو دینەیان دەناسی و بەس، یان دەبوو رێگە چارەی سێیەمیان بدۆزیبایەوە وەك (بدیل)ێك کەئیسلام بوو، بۆ ئەوەی شوێنیبکەوتبان و ، خۆیان لەکۆت و پێوەندی نەسرانیەت رزگار بکردبایە، دیارە ئەوەش کاتێك دەگونجا کەهەم دەمارگیریان بۆ ئاینیکۆنی خۆیان نەبوایە هەم کۆنەقینیشیان بەرانبەر ئیسلام و مسوڵمانان لەدڵدا نەبووایە کەبەداخەوە هەردووك کۆسپەکان هەبوون، چونکە خاچپەرستەکان چەندان جار شاڵاوی درندانەیان کردبۆ سەر وڵاتانی مسوڵمانان و بەهەزارانیان لێ کۆمەڵکوژ کردبوون، وە مسوڵمانانیش ئەوانیان بە کوشتارو بەهێز لەسەر موقەددەساتی خۆیان بەدەرنابوون، بەتایبەت لەسەردەمی (صلاح الدین)ی ئەیوبی گەورە سەرکردەی مسوڵمانان، لەبەر ئەو رقەیان کە هەر مابوو ، روویان لەئیسلام نەکرد، ئەگەرنا بێگومان ئیسلام پڕ بەپێستی ژیانەو، ئەو دینەیە کە ژیان بەرەو پێشەوە دەبات و ئینسان ئازاد دەکات و، بەرژەوەندیەکانی دونیاو دوارۆژی بۆ فەراهەم و دەستەبەر دەکات، وەکۆمەڵگای مرۆڤایەتی تەنهابەئیسلام ئازادو ئاسوودەو بەختیارو گەشاوە دەبێت و، پێش دەکەوێ و پەرە دەستێنێت، بەڵام بەداخەوە بەهۆی ئەو کۆنە بوغزو قینەی کە نەزانانە هەیان بوو، روویان لەئیسلام نەکرد،بەڵکو لەجیاتی نەسرانیەتێکی شێوێندراو

ڕوویـان کـردد عەلمانیەتـێکی لادەرو بێ دینو، لەکۆلك سڵەمینەوەو بەسەر بەرازدا کەوتن.

ئیـنجا بابزانین داخۆ لەسایەی بەرنامەو ڕێبازی عەلمانیەتدا ژیانیان چۆن بـوو؟ بـەکورتی دەڵـێین: ئـەورووپا لە کۆمەڵێك خورافاتو شتی پڕو پووچو کۆسپ و تەگەرەو ئاستەنگو شتی دژ بە ئەقڵو زانستو ئەو کابووسەی کە نەسـرانیەت دایهێـنابوو ڕزگاریـان بـوو، بەڵام لەبەرانبەردا خۆیان دووچاری کۆمەڵـێك شـتی خراپتر کرد لەڕووی ئایینی‌یەوە، چونکە بەرەو بێ مەبدەئی چـوونو، لایەنـێکی گەورەیان وەلانا کەبریتی‌یە لەلایەنی رووحیو دەروونیو مەعـنەوی، بۆیـە ئەوڕووپـیەکان ئایینـیان یـەکجاری وەلانا، چونکە پێشتر لەسـەردەمی نەسـرانیەتدا ئەوەندە لێی داخ لەدڵو بوون، نەدەبوو کەس هەر باسـی ئـایین بکـات، چ جای دواتر کەپەیتا پەیتاو، بەرە بەرە زانست بەرەو پـێش چـوو، وەدوای ئـەوەی کە ئازاد بوون لەداوو کۆتو زنجیرو کابووسی نەسـرانیەت، وە دوای ئـەوەی کـە چـاویان زیاتر کرایەوەو لە دونیا گەیشتن، بەتایـبەت دوای ئـەوەی کـە کتێبەکانی زانایانی جیهانـــــی ئیســــلامی‌ی تەرجەمـەی سـەر زمانی ئەوان کران، کەلـەشـەڕی خاچپەرستەکانداچنگیان کەوتـبوو،، وە لەریگای دوورگەی (صقلیة)ەو لەڕێی (ئەندەلوس) ئیسپانیای ئێســتاوە کتێبەکانی‌جـیهانی ئیسـلامی تەرجەمەکـرانو پێیان گەیشتن، وە پاشـان زانسـت لـەڕووی (فـیزیاو کیمـیاو جـبرو هەندەسـەو پزیشـکی‌و گەردووناسـی‌و..تاد)ەوە زیاتر بەرەو پێش چوو، بۆیە بەهۆی بەرەو پێشەوە چوونی زانست ئەوان زیاتر[٥١] لەدین بێ‌منەت بوون، دینیان وەلاناو، ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بـێ‌دین تـر دەبـوونو هەڵدەگەڕانـەوەو دوورتـر دەکەوتـنەوە لـەدین، بـەجۆرێك کە (جۆلیان هکسلی) لەکتێبی (الانسان في العصر الحديث) کە لە

---

٥١) واتە دینی شێونراوو لەئەفسانە ئاخنراوی نەصرانیەت.

ئینگلـیزی‌یەو تەرجەمەکـراوە، لەوکتێـبەیدا دەڵێـت: مـرۆڤایەتی بەسـێ قۆناغدا تێپەڕیوە کەئەمانەن:

١- قۆناغی ئەفسانە ٢- قۆناغی دین ٣- قۆناغی زانست.

لـێرەدا ناوبراو راست ناکاو کەوتۆتە هەڵەوەو لەهەنبانەی خۆیدا گوێز دەژمـێرێ، چـونکە راسـتە ئـەوروپا پێش هاتنی عیسا (علیه السلام) هەر خـەریکی ئەفسـانەگەریی بـوون، وە دوای هاتـنی عیسـا ئەوانـەی کە خوا هـیدایەتی‌دان، ئـەوە ڕاسـتەڕێ بوونو دینیان بەڕاستی وەرگرت بەڵام دوای ئـەوەی کەدینـیان گۆڕیو شێواند، هەر لە ئەفسانەگەریی‌دا مانەوە دواییش کـە لە دینی نەسرانیەتیان لاداو، ڕوویانکردە زانستو زانیاریو پێشکەوتن، بۆیـە ئـەوە دەرهـەق بەئـەوروپا راسـتە کـە وابووە، بەڵام بەنسبەت هەموو مـرۆڤایەتی‌یەوە وا نی‌یـە، چونکە راست نی‌یە کە (دین)و (علم) دژی یەکتر بـنو پـێکەوە نـاکۆك بـن، بەڵکو ئەوە بۆ دینێکی پڕ لە خوڕافاتو گۆڕاو وایـەو، بـەڵێ دینێکی پڕ لە خوڕافات لەگەڵ (علم)دا هەردەم ناکۆکنو تێك دەگیرێـن، وە لـە بواری حوکمو دستەڵاتو سیاسەتدا بێگومان ئەوە بوو کە گـوتم: لـەبواری دیـندا ئەوروپـیەکان دینـیان لەبەرچاو بێزراوبوو، بەشتێکی هەڵـەو کۆنەپەرسـتو دژی پێشـکەوتنیان دەزانـیو، دینیان بەختەرو تلیاك دەزانـی بۆیـە لـەو بوارەوە بەیەکجاری خۆیان رشاندەوەو هەرچی لەناو ناخو دڵو دەروونو مێشـكو بـیرو هۆشـیاندا هـەبوو، دەریانهاویشـتە دەرەوەو توڕیـان داو، بـەدوای زانسـتو سیاسـەتێکی ڕووتو ڕەهـای دوور لـەدین کـەوتن، بـەڵام هەر کارو زانستێك، جا چ سیاسەت بێ یان کۆمەڵایەتی یان ئـابووری یـان هـەر لایەنێکی تری ژیان ئەگەر ئاین هەوێنو ئاوێتەی نەبێ، واتـە بـێ دیـن بـێو دوور لـەدین بـێ، هیچ کەڵكو نرخێکی نی‌یە، چونکە دەبێـتە هەواو ئارەزووی بەدی شەیتانو ئینسان بەکەیفی خۆی دەکاتو هیچ قیەمو ئەخلاقو ویژادنێکی لەژیاندا لەلا نامێنێتو ڕەچاویان ناکات.

وەلەڕووی سیاسەتەوە گۆڕانکاری سەلبی زۆ ڕوویدا بەتایبەت دوای ئەوەی کە(نیکۆلای میکاڤیل) پەرتووکی (ئەمیر)ی دانا، کۆمەڵگای ئەوروپا زیاتر بەرەو خراپە گۆڕاو وەرچەرخا، وە ئەگەر سەیری‌سیاسەتی ئەوروپا بکەین کەمو زۆر بەتێکڕا بەدوا بیرو بۆچوونو ڕێبازی میکاڤیلی کەوتوون کەبریتی‌یە لەسیاسەتو پرانسیپی (الغایة تبرر الوسیلة) واتە: مەبەست پاساوە بۆ هۆکارو[٥٢]، ئەورووپیەکان لەسەر ئەو سیاسەتو شێوازە ڕۆیشتن، بۆ وێنە (نازیزم) کە لەسەر دەستی (هیتلەر) پەیدابوو، وە (فاشیزم) کەلەسەر دەستی (مۆسۆلۆنی) پەیدابوو، پاشان دیکتاتۆریەت لە بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا بەناو پرۆلیتاریا لەسەر دەستی (لینینو ستالین) پەیدابوو، لەولاش (ماوتس تۆنگ) لە (چین) هەمان ڕێبازی پەیداکرد، هەموو ئەوانەو زیاتریش وەك ئایدیۆلۆژیاو بیردۆزەو ڕێبازگەیەك بێگومان لەوسیاسەتەوە پەیدابوون کە دینیان توڕداو وەلانا چونکە ئەو سیاسەتە دوور بوو لە هەموو قیەمو ئەخلاقێکی ئاینیو ئاسمانی.

وە لە ڕووی ئابووریو سەرمایەوە بێگومان کارگەی زۆر بونیادنرانو سەروەتو سامانێکی‌زۆر پەیدابوو، بەڵام بەرهەمو سەرمایەکەی کەپێشتر چووبووە دەستی‌کۆمەڵێك بەناویدەربەگەکان (إقطاعیین)و، بەس ئەوان بوونە خاوەنی موڵكو زەویو زار، دواتریش چووە دەستی سەرمایەدارو کاپیتالیستەکان، بەجۆرێك کەتا ئەمڕۆش ئەوپارەو پووڵو سامانە هەر

---

٥٢) واتە: مەبەست پاساوە بۆ هۆکار. یانی: ئامانجو مەبەستی‌گرنگ هەقی لەهۆکارو شێواز نی‌یە، گرنگ ئەوەیە تۆ مەبەستێکی گرنگت هەبێو بەئامانج بگەیت. جاهەر هۆکارو ریگاو شێوازێك دەگریەبەر کرفتو سەیرنی‌یە، جائەو هۆکارانە شەرعی بن یان ناشەرعی، گرنگ ئەوەیە ئامانجی خۆت بپێکیو سەربکەوی وبراوەو باڵا بیت،

بۆ وێنە دەستەڵات بگرە دەستو دەوڵەمەندبە، با ٤بەهۆی خوێن ڕشتنو زوڵمو زۆرداریش بێت، کەلەئیسلامدابەشێوە یەکی ترەو پێویستە مەبەستو هۆکار هەردوکیان شەرعییو ڕەوا بێ.

لەدەستی ئەواندایەو لە دژی چینیکریکار بەکاری دێنن‌و هەڕەشەی پێ لەگەلانی جیهان دەکەن، دەرەنجام بەهۆی زولم‌و ستەمی بلۆکی کاپیتالیستی لەلایەکی ترەوە بەرگری کردنی ئۆردوگای ئیشتراکی (سۆشیالیزمی) لە چینی پرۆلیتار جەنگیك پەیدابوو کەنزیکەی نیو سەدەیخایاند بەناو جەنگی ساردەوە، جەنگێکیزۆر گەرم‌و سەختیان لەدژی یەکتری بەسەرمایەی گەلانی دونیا بەرپاکرد کەبووە مایەی لەبرسان کوشتنی ملیۆنان کەسی هەژارو نەدارو سیاسەتی برسیکردن (تجویع)یان بەسەر زۆر لەگەلانی دیناداسەپاند، بۆیە زانایەك لەبارەی یەکسانی خەلکی ژێر سایەی کۆمۆنیزم دەلێ: لە بلۆکی سۆشیالیزمیدا خەلك یەکسانە، ڕاستە بەلام لەبرسیەتی داخەلك یەکسانن!! جالەبەر ئەوەی ئەو بیردۆزەو ڕیبازە لەزۆر ڕووەوە پێچەوانەی سروشتی ئینسان بوو، خەلك بەرگەی نەگرت‌و ، سەرەنجام ئاژاوەو پەشێوی کەوتە نێو دەولەت‌و دام‌و دەزگاکانییەکێتیشۆڕەوی (سۆڤیەت)و پەشۆکاو لە بەرانبەری کاپیتالیستی خۆرئاوادا بەچۆکدا هاتوو هەرەسی هێنا، کەچی جارێ بلۆکی جیهانیسەرمایەداری (کاپیتالیزمی) هەروەك خۆیەتی‌و لەجاران بەهێز ترە، وە کاپیتالیزم ئابووری ئەوروپاو خۆرئاواو جیهانیبۆ خۆی بەکارهێنا لە دژی گەلانی چەوساوەو ڕەش‌و ڕووت‌و ژێر دەستە، بۆ ئەوەی زیاتر کۆنترۆلێو داگیریان بکات‌و، چاکتر خێرو بێری جیهان بخوات وەهەرچی زیاتر بۆ خۆی ئامێرو چەکی کوشندەو کۆکوژ لەکارگەکاندا ساز دەکات بەسەرمایەو خێرو بێری براوو داگیرکراوی ولاتانی چەوساوەی جیهان، بۆ خۆ پۆلاکردن، وە لەوەش هەندێکی دەداتە ئەو ولاتە نەزانانە تابەو چەکە یەکتری قڕوبڕ بکەن، هەروەك زۆر لەو ولاتانەی کە موعارەزەو ئاژاوەیان تێدابوو کردیان، بۆ ئەوەی کارگەکانیان لەکار نەکەون‌و هەمیشە بەرهەمداربن، ئیدی خەلك لەنێو دەچێت قەیناکات، ئا بەم شێوەیە سەرمایەدارە بێ دینەکان برەویان بەخۆداو تۆوی ئاژاوەو

دووبەرەکـیان لـە نێو گەلاندا چاندو دەستیان بەسەر دونیادا گرت و داگیریان کرد.

ئەمـڕۆ شـتێکی زۆر سـەیرو سەرنجڕاکێش هەیە لەم سەرەدەمی ئێمەدا ئـەویش ئەوەیـە کەلەڕووداوەکەی (١١)ی (سبتمبر) ئەگەر (٣) هەزار کەس لەهەردووباڵەخانـەی سـەنتەری بازرگـانی جـیهانی نـیویۆرك‌و پەنـتاگۆن لە (واشـنتۆن) کـوژرانو لەنـێو چـوون، بەڵام لەڕاپۆرتی ئەو دواییەی کۆنگرەی زەمـین، گووتـرا ڕۆژانـە (٣٠) هـەزار کـەس بـەس بـەهۆی ئاویپیسەوە لە جـیهاندا دەمرن، واتە ڕۆژانە (١٠) هێندەی کوژرانی ڕووداوەکەی (سبتمبر) لەنێودەچـن تەنهابـەهۆی‌ئاوی پیسـەوە!!، وەبەگشـتی لەجیهاندا (٢) ملیار مرۆڤ لەبرسێتی‌دا ژیان بەسەردەبەن[٥٣]، هەروەها ڕۆژانە چەندهەزار مرۆڤ لە برسـان دەمـرن، وە بە هەزاران کەس بە نەخۆشیەکان دەمرن، چونکە دەردو بـەڵای کوشـندە لەجیهاندا زۆرن، کەچی کەس باسیان ناکا، بۆچی؟! چونکە هـەموو ئەو شتانە ئەوان لێی بەرپرسیارن‌و ئەوان هۆکاری ڕوودانیانن، بەڵام بـەلای ئەوانـەوە پیاوی ڕەش‌و زەرد هەرچی لێی بێت قەیناکات تەنهاخۆیان (بابای سپی پێستی ڕۆژئاوایی)سەلامەت بێت!!

ئـا ئەوەیـە بەرهـەمی شـوومی سـەرمایەداریی بـە ئـاوی پیسـی بـێ دیـنایەتی‌و دنیاپەرسـتی ئـاودراو!! هەر لەو بارەیەوە دیاردەیەکی زۆر زەقی دڕندایەتی کاپیتیالیزم بریتیە لە : هەردوو مەسەلەی سوودو قۆرخکردن (الربا والاحـتکار) کـە ئێسـتا هەن‌و لەلایەن وڵاتە سەرمایەدارەکان زۆر بێڕەحمانە لـەدژی گـەلانی هـەژارو نـەدارو بـێ دەرامـەت بەکاردێـت، کەچۆن خوێنی

---

٥٣) بەڵی بیکوسن ئەمڕۆ لەدونیادا لەسایەو بەرهەمی سیستەمی وڵاتانی کاپیتالیستی‌دا ...ملیۆن خەلکی لەبرسان دەمرن، لەبەر بەد خۆراکی‌و نەبوونی‌ژێوی، بەتایبەت لەوڵاتانی ...، بەتایبەتتر منداڵانی جیهان، کەزۆر بێ تاوانن و لە زۆر جێ لەبرسان لە ناویلکەی ...

خەڵکـیان پـێ دەمژن، وردە وردە بەشێوەیەکیهەندەسیو هەڕەمی کۆشکی زۆرداری پـێ دادەڕێـژن بـۆ لەنێو بردنی گەلانی هەژار، وەکردوویانن بەتاکە چـەكو کـارتی بازرگـانیو خـۆ دەوڵەمەندکـردنو فشـار خسـتنە سـەر بەرانبەریانو هەژارو نەدار کردنیان و ئیفلاس پێ کردنیان.

لـێرەدا بەپێویسـتی دەزانم ئامـاژە بـۆ ئـەوە بکـەم کـەکاتی خـۆی لە کاردانـەوەی زوڵـمو سـتەمیکاپیتالیزمو لیـبڕالیزمو بـێڕەحمیو بێ ویژدانی سیسـتەمە ئیمپریالیسـتەکانی رۆژئـاوادا، بلووکـی رۆژهـەڵاتو سیستەمە سۆسیالیسـتەکان سـەریان هـەڵدا، بۆ لەسەر کردنەوەی چینی هەژارو نەدارو چەوسـاوەو دروسـتکردنیلەمپەرو ئاسـتەنگ لەبـەردەم تـەوژمو لێشـاوی سـەرمایەدارانی داو، فـیعلەن سۆسـیالیزمو بلۆکـی رۆژهـەڵات کـەمو زۆر کاریگـەری لەسەر تەوژمو لێشاوی سەرمایەداری هەبوو و ناچاری کرد کە لە زۆر ڕووەوە بـەخۆیدا بچـێتەوەو بەخۆداچوونەوەکەیشـی بـەقازانجی چـینی کرێکارو چەوساوە تەواو بوو!

بەڵام سەیر ئەوەیە کە ئێستا پاش هەرەس هێنانی بلۆکی سۆسیالیزم ئەو بـرادەرانەیکەهەتا دوێـنی مارکسیستوکۆمۆنیسـتیتۆخ بـوون ئێستا زات ناکـەن تەنانـەت هەر ئاماژەش بکەن بۆ لایەنە چاکەکانی سۆسیالیزم! دیارە ئەوەش هەمووی لە ژێر فشاری سەرمایەدارییدا نەوەك کوێخاکانی رۆژئاوا بەتایبەت ئەمەریکا لێیان نیگەرانو تووڕە بن!

مـن پـێم وایـە ئـەو هەڵوێستە وێڕای بێ جورئەتی جۆرێکێشە لەبێوەفایی ئەوبـرادەرانەو تەسـلیم بوونـیان لەبەرانـبەر ئـەو ئەمـەریکاو جـیهانی کاپیتالیسـتەدا کەهـەتا دوێـنێ هەرکەسێك هەر تۆزێك بۆنی ئەو جیهانەی لێکرابایە نەفرینی لیدەکراو زەربی بەسەردا دەهێنرا.

وە لـەڕووی کۆمەڵایەتییـەوە زۆربـەی یـان سـەرجەم کۆمـەڵگاکانی رۆژئـاوا، لەسـایەی سیکۆلاریزمدا کەهیچ حسابێك بۆخواو بۆ ئایینو دوارۆژ

ناكرێت، خێزانو كۆمەڵگا لێك هەڵوەشاوەو، ئەخلاق و غیرەتو نامووس روخاوەو حەیاو شەرەفو پەردەنەماوە، بۆیە چەندان پەتاو نەخۆشی ئەقڵیو سایكۆلۆژی كۆمەڵایەتی سەریان هەڵداوەو پەرەیان سەندووە،بەڵێ زۆرێك لەخەڵكی ئەورووپا نەخۆشی نەفسیو ئەقڵییان هەیەو، پزیشكی تایبەتیان هەیە كە ماوە ماوە خۆیانی پیشان دەدەن، لەئەنجامی ئەو پەشۆكانە دەروونیو ڕوحیەیكەتێیدا دەژین، لەبەر نەمانی دین لەنێویاندا، ئینجانەخۆشییە جەستەییەكانی وەك ئیدزو زوهریو ..هتدیش سەربارە!

وە لەڕووی زانستییەوە، بێگومان زانست زۆر بەرەو بەرزاییو پێشەوە چووە، وە ئێستا رەنگە مرۆڤایەتی لەترۆپكو چڵەپۆپەی پێشكەوتنی زانستدا بێت، نازانم ئایا چی دیكە زانست بەرەو بەرزبوونەوەو گەشەكردن هەڵدەچێ یان بەرەو خوارەوە لێژ دەبێتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئاخۆ بەرهەمی زانست لەسەردەمی سیكۆلاریزمو لەسایەی بێ دینایەتیدا لە خزمەتی مرۆڤدایە یا لە دژایەتیو لەقەلاچۆكردنی مرۆڤدایە؟!، ئەگەر بڕوانین دەبینین كەكارگە پیشەسازییەكانی ئەورووپاو ئەمریكا چی بەرهەم دێنن، بۆ وێنە چەند جارە داوا لە ئەمریكا دەكەن كە هەندێك لەبەرهەمی بەتایبەت چەكو تەقەمەنی لەكارگەو كارخانە بەرهەمهێنەردكانیخۆی كەم بكاتەوە، چونكە پسپۆڕانی ژینگە دەڵێن: ٣٣٪ یان ٣٦٪ی ژینگەو هەوای دنیا ئەمەریكا پیسو پۆخڵی كردوە كە ئەوەش كاری خراپ لە باری كۆمەڵایەتی دەكات، كەچی ئەمریكا ناچێتە ژێر باری بەجێهێنانی ئەو داوایە، لەكاتێكداكە زۆربەی بەرهەمی كارگەكانی بەرهەمی شەڕو شۆڕو چەكو تەقەمەنی جەنگیین، لەبەر ئەوەش كەمیان ناكاتەوە چونكە لەبەرژەوەندیخۆیاندایەو بۆ خۆی قازانجە، جا دونیا تێكدەچێ، یان پیسو

پۆخـڵ دەبـێ، یـان چینی (ئۆزۆن)[٥٤] کون دەبێت دوایی قوتبی بەستەڵەکی سـەروو خـواروو دەتوێـتەوەو لافـاو هەڵدەستێو هەرچیەك ڕوودەدات، ئەوە هیچـی گرفتو گرنگە نیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئەمەریکاپارەی زۆربێو تـاك دەستەڵاتدار بێت، ئا ئەوەیە بەرهەمی زانست لەسایەی سیکۆلاریزمدا کەهەرگـیز گوێ نادرێ بەبەرژەوەندییەکانی مرۆڤایەتیو، گوێ نادرێ بەئاوو هـەواو ژینگەو حەیوانات کەلە وشەکانیو لەدەریاکاندا هەراسانو قڕ دەبن، بۆیە هەندێك لەزاناکانی زیندەوەرناسی ژینگە تینیان بۆ هاتوەو دەڵێن: وەك کاتیخۆی دەیناسۆرەکان لە نێو چوونو بڕانەوە، با دونیا هێندە پیسو پۆخڵ نـەبێ نـەك ئـێمەش وەك وان لەنـێو بچـین، بـاتۆزێك پـاکژی رابگـرینو هێندەپیسو ئالوو دەگی لەدنیادا نەکەین بەڵام کەس لەوانە کەبە بەرهەمی کارگە پیشەسازییەکانیان دنیا پیس دەکەن گوێیان پێ نادەن.

---

٥٤) چینی ئۆزۆن (طبقة أوزون) چینێکی هەوایییە کەوەك چەترو قەڵغان دانیشتووانی سەرزەوی لەگەڵێك جۆرە تیشکی زیانبەخشو بکوژ دەپارێزێ.

## خاڵی چوارەم

### ئایا بوونی سیکۆلاریزم لە نێو میللەتی مسوڵماندا، پاساوی هەیە؟

وەك باسمـــان کـــرد بـــێ دیـــنایەتی یـــان دونیاگەرێـــتی (عەلمانـــیەت) هەڵقوڵاوی جیهانی رۆژئاوایەو، وەك کێمو زووخاوێك دەرهاویشتەی جەستەو لاشـەی خەڵکـێکی بـێ دینو نەخۆشو دەردەدارە، لەلای غەیری مسوڵمان ســیکۆلاریزم دەرمـانی دەردو زامەکانـە بەڵام لەڕاستیدا سیکۆلاریزم کەفی بێ هودەی سەر دەریای ئەندێشەیخەیاڵ پڵاو وپووشو پەڵاشی دەستی بابای بەئاوداچووە کەلە بەر خنکانیی دەستی بۆ بردوە، هەرچەندە دادیشینادات، بۆیـە هـیچ پەیوەندیەکی بەئێمەی مسوڵمانەوە نییە، بەڵام وەك باسمان کرد ئەورووپـیەکان ناچـار بوون کە سیکۆلاریزم دروست بکەنو بەدواشی بکەون، لەبـەر گـۆڕانو شـێواندنیدینو پەیدابوونی چینی کەهەنووت (پیاوانی دین) کـە ئەوپـەڕی بـیدعەتو خورافـات وخراپەکاریـیان پەیداکـرد، بۆیە خەڵك بەناچاری لەئایینی مەسیحیەت لایدا،بەڵام لەئیسلامدا بەهیچ رەنگێك ئەو بـیانوو و ئـەو پاسـاوە نییـە کەخـەڵکی بـەرەو بێ دینایەتی بچنو لە دین لابـدەن و سـیکۆلاریزم هەڵـبژێرن چونکە ئێمە وەك خودی دین و، دەقەکانی بەرنامـەو ئاییـنەکەمان هـیچ کێشـەو گرفتێکمان لەو بارەوە نییە، ئێمەی مســوڵمان قورئانـێکمان هەیە، کەخوایپەروەردگارمان زەمانەتی بۆ کردوین کەئـەو پەیامو بەرنامە (قورئانە)مان بۆ دەپارێزێت، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْـــنُ نَزَّلْـــنَا الذِّكْـــرَ وَإِنَّـــا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر:٩) ، واتە: ئیمە ئەو قورئانەمان بۆ ئێوە دابەزاندووە، وەهەر خۆشمان دەیپاریزین لەهەموو گۆڕانو شـێواندنو دەسـت تێوەردانـێکیخراپ، وەدەبـێ تـا دونـیا تـێك دەچـێ پارێـزراوبێو بەرنامـەی ژیـان بـێو کـاری پێ بکرێت. وەزانایانی جیهانی

ئیسلامیو غەیری جیهانی ئیسلامیش دەڵێن: تەنها پیتێك لەقورئانیٚ زیادو کەم نەکراوەو، خوا ئەو قورئانەی بۆ هەموو مرۆڤایەتی ناردوە، وەهەتا مرۆڤایەتی لەسەر زەوی بێت بێگومان پێویستیبەڕێنمایی (هیدایەت)ی خوای بەرزو مەزن هەیە، جادیارە ئەو قورئانەش هیدایەتە بۆ مرۆڤایەتیو دەبیٚ بەسەلامەتیو بەبیٚ دەست لێدان بمێنێتەوەو بپارێزرێت، کەواتە ئێمەیمسوڵمان قورئانێکمان هەیە کەهەرگیز دەستکاری نەکراوە، وەسوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ هەیە کەلەسەرەتادا ویسترا بشێوندرێتو، شت بەزاری پێشەوامانەوە ﷺ هەڵبەسترا، بەڵام سوپاس بۆ خوا کەزانا زرنگو بلیمەتەکانی ئیسلام قۆڵیخۆیان لیٚ هەڵماڵیو وەخۆکەوتنو، سوننەتی پێغەمبەری خوایان ﷺ لەبێژینگ داو ڕاستو هەڵبەستراوەکانیان هەریەکە لەلایەك داناو وەك کاودان لێکیان جیاکردنەوە، جائێمەی مسوڵمان چ ئەوەی کەخوایبیٚ وێنە فەرموویەتی چ ئەوەی کەپێغەبەرەکەمان ﷺ کردویەتیو فەرموویەتی، هەر هەمووی زۆر بەرێكو پێکیو بە پوختەو بە پارێزراوی لەبەردەستمان دایە و باسی لە هەموو لایەنەکانی ژیان دەکاو بەرژەوەندی دنیاو دوارۆژی مرۆڤەکانی دەویٚ ، کەوەك دین زۆر جیایە لەو (ئینجیل)ەی ئەمرۆ بۆ عیسا (علە السلام) هاتووە چونکە ئەمرۆ (ئینجیل) هیچ سەرو بەرو کە بۆتە (٧٠) دانەو لەوانەش بەئارەزووی خۆیان (٤) یان لێهەڵبژاردوون، بەڵام قورئانی ئێمە تەنهایەك قورئانەو پارزراوەو هەرگیز دەستکاری ناکرێت، بەڵام لەو (ئینجیل)ە ئایا چەندەی خوا فەرموویەتی، وە چەندەی عیسا (علیە السلام) فەرموویەتی، وە چەندەش درۆو هەڵبەستراوە؟!. ئەگەر چی زۆ دوورە کە فەرموودەی خوای گەورەی هەر تێدابێت.

وە لەڕووی بیرو باوەڕ (عقیدە)و شەریعەتەوە ئەو دینەی ئێمە نەگۆڕدراوە، وە خودی دینەکە پارێزراوەو هەروەك خۆیەتی،بۆ وێنە قورئانو

سـوننەت پارێـزراون، عەقـیدەو شـەریعەتو پێشـەوایانی ڕەسەنو زانایانی ڕاسـتەقینەی ئیسـلام پارێـزراونو ناپـاكو لادەر نـین، بۆیـە هەركەسـێك كەبیەوێـت، دینـێكی ڕاستو دروستو پوختەو پاڵاوتەی لەبەر دەستان بێو كـاری پێبكـات، ئـەوە قورئـانو سـوننەت هـەن، كەپارێـزراون، دەسـت لێـنەدراونو، هـیچ خڵـتەو خـۆڵو تـۆزو گـەردیان پـێوە نیـیە، هەرچەندە بەداخـەوە لـە ڕۆشـنبیرانو خوێندەوارانی خۆشمان هەر بەچاویلكەی بابایەكی ئـەوروپی سەیری قورئانو سوننەت دەكەن، وەك ئەو چۆن سەیری (ئینجیل و تـەوڕات) دەكـات كەپـڕن لەبیدعەتو خوڕافاتو شتی پڕوپووچو بێ هودەو ناژیـرانە و دژ بـە سروشـتی ژیـانو مرۆڤ، هەندێك لەو خەڵكانە لە (كوردو عـەرەبو.هـتد) هـەر بـەو چـاوە سـەیری ئەو قورئانو سوننەتە دەكەن كە پـڕن لە: زانستو هەواڵی ڕووداو وڕاستی سەرسووڕهێنەرو، پڕن لە چیرۆكو سەرگوزشـتەی مـێژوویی گـرنگو پـڕن لـە پـەندو وەك دەریایـەك پـڕن لەگەورهـەرو مـرواری، پڕن لەچەندان جۆر زانستی بەنرخ كە لەئامار نایەن، ئـەو قورئـانو سوننەتەی كەیاساو بەرنامەی ژیانیمرۆڤایەتیە، كەچی ئەو جـۆرە كەسـانە ئـەو حوكمـە پـڕو پـووچو كوێـرانەیان بەسـەر دوایین ئایینو شـەریعەتی تـێرو تەواوی خوادا باو دەدەن، بێئەوەی لێی وردبنەوەو هەزمی بكـەنو تـێی بگـەنو، بـێ ئـەوەی دیراسـەیەكی وردو فـراوانی عەقڵانـەو زانستیانەی بكەن، كەئەوكاتە بەڕوونی بۆیان دەردەكەوێ كەهەرگیز قورئانو سـوننەت لەگـەڵ (ئینجـیلو تـەوڕات)ی گـۆڕاوو هـیچ پـەیامو بیروبـاوەڕو بیردۆزەیـەكی تـری خودایـی گـۆڕاو یـان مرۆڤكـرددا بەراورد ناكرێ بەڵكو ئاسمانو ڕیسمان بەبینیان هەیە.

لەئیسـلامدا (عەقـیدەو تەوحـید) پارێـزراون، تـەنهاخوا دەپەرسـترێ، (محمـد)ﷺ بەبـەندەی خـواو پەیامـبەرو رەوانەكراوی ئەو دەزانن‌و ناپەرستن، مسـوڵمانان لـە نوێژەكانیاندا دەربارەی ئەو زاتە دەڵێن: (أشهد أن لا إله إلا

الله وان محمداً عـبده ورسـوله)يـان (وأشـهد أن محمـداً رسول الله) واته من گـەواهی و شایەتی ئەوە دەدەم کەجگە لەخوای تبارك‌و تعالی پەرستراوێکی تـر نی‌یـە، وگـەواهی ئەوەش دەدەم کەموحەممەد بەندەوپەیامبەری ئەوە، ئا ئـەوە بیروباوەڕی مسوڵمانانە لەئیسلامدا. وە پێغەمبەریشمان ﷺ بۆ خۆشی لـەکاتی بانگـەوازی دا زۆر جەخـت‌و دووپاتی ئەوەی دەکردەوەو دەیگووت: ئـەی خەڵکیـنە! مـن بـەندەی خـوام‌و بـۆ لای ئێوە هاتووم تاریگای راستی خواتـان پـێ پیشـان بـدەم، وەك مەسیحیەکان مەبن کەبەناوی ڕێزلێنانەوە زۆریان بەعیسا هەڵگوتو بۆ پلەو پایە (مقام)ی خوایەتی بەرزیانکردەوە[٥٥]، (**لا تطـروني كما أطرت النصارى إبن مريم انما انا عبدالله ورسوله**) رواه البخاري.

وە دەربـارەی بەگـرنگ زانـین‌و ڕێزگـرتن لەعـەقڵ‌و عیلم، ئێمە هیچ کێشـەو گومانـێکمان لـەو بـارەوە نی‌یـە، عەقڵ‌و علیم بەگرنگ دەزانین‌و لـەلامان خۆشەویسـت‌وڕێزدارن، بـەڵکو کێشـەمان لەگەڵ نەفامی (جهل)و نـەزانی‌دا هەیـە وە وەك راسـتی‌یەك ئیسـلام زۆر هانمـان دەدات لەسـەر پێشـکەوتن‌و وە دەست خستنی زانیاری‌و بەرەو پێش چوونی ئەقڵ‌و زانست، هـەروەك خـوای زانـا قورئانی خۆی بۆ (محمد)ی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار (أمـی) ناردۆتـە خـوار، بـەلآم هـەر سـەرەتا بەوشـەی بخوێـنەوە(إقـرأ) دەسـتی‌پێ‌کردووە، قورئـان بـە ﴿**اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ**﴾ (العلق: ١)،

---

٥٥) دیارە هەم عیساو هەم هەمووپێغەمبەران (سەلامی) خوایان لێ بێ) هەرنەوە بانگەوازیان بووە گووتویانە: ئەی گەلەکەمان، ئێمە بەندەی خواین‌و بۆ لای ئێوە رەوانەکراوین تاکو رێی راستتان پیشان بدەین، دەجا وەرن بەدوامان بکەون کەرێبازی خوایە تاخواتان لێ رازی ببێ‌و لە دۆزەخ رزگارتان ببێت، بۆ وێنە پێغەمبەری ئێمە ﷺ دەیفەرموو(إنما انا بشر مثلكم يوحى إلي) ئەی خەڵکینە بەراستی منیش بەکێکم وەك ئێوە ئادەمیزادم، تەنها نیگای پەروەردگارم بۆ دێ.

بەناوی خوا دەستی پێ کردوەو بەخەڵك کۆتایی پێی هاتووە، هەروەك دوایین ئایەتو وشەی (من الجنة والناس) بەباسی جندو خەڵك کۆتایی هاتوە، چونکە ئەو قورئانە بۆ سەرجەم خەڵکی سەر زەوی‌هاتوە، تاتێی بگەن، تا بیکەنە بەرنامەی ژیانیان و کاری پێ بکەن، قورئان بەناوی خوا، بە(بسم لله) دەستی پێ‌کردووە، چونکەلەلایەن خواوە هاتوە، وەبەناوی خواوە هاتوە، وەئەگەر قورئان لەنێو خەڵکی‌داپیادە نەکرێ ناڕەوایە، چونکە لەخواوە بۆ خەڵکی هاتوە.

جا لەبەر گرنگی زانست، وشەی (علم) لەقورئانی پیرۆزدا زیاتر لە(٧٥٠)[٥٦] جار دووبارە بۆتەوەو، وشەی عەقڵو فکر زیاتر لە (٥٠) کەڕەت دووپات بۆتەوە، وخوای زانا کتێبی خۆی زیاتر تایبەت کردوە بەعەقڵمەندان، وەك دەفەرموێت: ﴿كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ (صٓ:٢٩) واتە: ئەم قورئانە کتێبێکی بەپێزەو بۆ تۆمان دابەزاندوە (ئەی محمد) بۆ ئەوەی ئایەتەکانی لێك بدەنەوەو بیری لێبکەنەوەو خاوەن بیرو هۆشەکان پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرن، جالەئیسلامدا نەك هەر هیچ کۆسپو تەگەرەو ڕێگرو ئاستەنگێك لەبەردەم پێشکەوتنی زانیاری دانەنراوە، بەڵکو ئیسلام ئینسان زۆ هاندەدا کە لەرووی زانیارییەوە پێشبکەوێت، بۆ وێنە ئەوەتا خوای کاربەجێ دەفەرموێت: ﴿فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ﴾ (عبس:٢٤). با ئادەمیزاد سەیری خواردنو خۆراکەکەی بکات! ئاخۆ چۆنەو لەچی دروست بووەو چەند گرنگو بەهرەدارە، وە دەفەرموێ: ﴿فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾ (الطارق:٥).

---

٥٦) وشەی (علم) ٨٤ جار لە قورئاندا هاتوە، وە بەموشتەقاتیەوە (٧٨٢) جار دووپات بۆتەوە، وشەی (معرفة)یش (٢٩)جار هاتوە کەواتەبەهەردووکیان (٨١١) جارهاتوون، وە وشەی ئیمانیش (٨١١) جار هاتووە.

واتــە: دەبــا ئینسـان سـەیرێکی خـۆی بکات ئاخۆ لەچی دروست بووە، یان دەفەرمویـت: ﴿أَوَلَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾(لأعراف: من الآية١٨٥) واتە: ئایا بۆ تەماشای ئەو هەموو موڵكو دەسەڵاتە گەورەو فـراوانەی خوایـان نەکـردوە کە لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە، وە دەفەرموێت ﴿قُـــلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ﴾(العنكبوت: من الآية ٢٠) واتــە: دەبــەکونو کەلەبــەرەکانیزەویدا بــڕۆنو بگەڕێن، سەرنج بدەنو بــاش تەماشــای بکــەن، ئــاخۆ خــوا چـۆن ئـەو زەویو بوونەوەرەی دروست کردوە!!

پاشان دەڵێین: ئەورووپاییەکان هەر کە وازیان لەخوڕافاتو ئەفسانەکانی کڵێسا هێنا کەناویان لێ نابوو ئایینیمەسیح، لەو جەهلو نەزانینە کەتێیدا نقــووم بــبون، قووتاریــان بــوو وە بــەدیداری زانســتو پێشــکەوتنو عــەقڵ شــادبوون، بــەڵام مســوڵمانان ئەوکاتــە بــەدیداری زانســت شادبوون کەچاك پابــەندبوون بــەقورئانو ســوننەتەوە، وە ئەوکاتــەش کەلە قورئانو سوننەتی پێشــەوا ﷺ دوورکەوتــنەوەو ڕوویانکــردە خوڕافــاتو ئەفسانە دواکەوتن، وە ئــێمە لــە ئیســلامدا پــیاوانی دینــیمان نیـیــە، بەڵکو زانایانیئایینی یان زانایــانی ئیســلامی یــان پێشــەوایانی ئیســلامان هــەن، بــەڵام زانایان هیچ ئیمتــیازو تایبەتمەندییەکــیان نیـیــە لەنــێوان ڕەگــەزو ڕەنگەکانداو، لەنێوان گــەلو تــیرەو هــۆزو مرۆڤەکاندا، بەڵکو هەموویان بۆ بەندایەتیخوا دروست کــراون وەکــو خــوای گــەورە دەفەرموویــت ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْأِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُون ﴾ (الذاريات:٥٦)

واتــە: وە جــندو ئادەمــیزادمان تــەنها بــۆ ئــەوە دروســتکردوون کــە بمپەرســتن، بۆیــە لەئیســلامدا لــەرووی سیاســیو کۆمەڵایــەتیو فــیکریو ئــابووریو..هــتدەوە هــیچ مەلاو زاناو پێشەوایەك بۆی نییە کار بەئایەتو حەدیســێك نــەکات، یــان بڵــێ ئــەو فەرموودەیــە مــن ناگرێــتەوە، یــان

دەستکاریەکی بکات،یان هەر شتێکی تر بکا کە پێچەوانەی قورئانو سوونەتە، چونکە لەئیسلامدا ئەو مەسەلەیە بڕاوەتەوەوکەس نابێ دەستکاری دەقەکان (نصوص) بکات، بەلاّم پیاوانی کەنیسە بەئارەزووی‌خۆیان ئەوشتانەیان دەکرد، بەلاّم لەئیسلامدا هەرکەسێك ئەوە بکات بەکوفر لەقەلّەم دەدرێت، چونکە ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلاً﴾(النساء: من الآية١٢٢) قسەی کێ لەهی خوا راستڕو رێك ترە؟! بەلّکو لەئیسلامدا کێ لەهەموو کەس زاناترە دەبێ لەهەموو کەسیش پابەندتر بێت بەبنەماو یاساو دەقەکانی قورئانو سوننەتەوەو هیچکەس لەسەرووی دینو یاسای خواوە نیە! ئینجا شەریعەتی ئیسلام وەك ئایینی شێوێنراوی مەسیحیەت نیە کەژیانی پێوە بەڕێ نەچێ، بەلّکو بەرنامەی تێرو تەسلی خوایە بۆ تێکرای لایەنەکان، وە لەڕاستی دا ئەوروپیەکان لەبورای ژیان بەڕێوەبردندا زۆر ئاتاجی پەیامو بەرنامەیەکی راستەقینەی ژیان بوون، چونکە (ئینجیل) بەشێوەیەك دەستکاری کراوبوو پڕ بوو لەئەفسانەو خورافات، بۆیە هەرگیز لایەنەکانی ژیانی پێ بەڕێوە ناچن، بۆ نموونە کێشەکانی سیاسیو کۆمەلاّیەتیو ئابوریو هتدی پێ حەل ناکرێو لەو ڕووەوە هیچی تێدا نیە، وە لەڕووی نەتەوایەتی‌یەوە هیچی تێدانیە، وە لەڕووی ئەخلاقەوە هەرچەندە هەندێك شتی باشی‌تێدایە، بەلاّم لەلایەکی دیکەشەوە برەو بەئیباحیەتو خراپەکاری دەدات، چونکە ئەوەی کەعیساوموسا هێنابوویان (علیهما السلام)، جوولەکەو نەصرانییەکان گۆڕیان و شتی زۆر ئەفسانەو پڕوپووچیان ڕەگەلّ خستو دەستکارییان کرد، عیسا بۆ (تصدیق)ی رێبازی موسا هاتبوو، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێت: ﴿وَمُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾(آل عمران: من الآية ٥٠)، چونکە (ئینجیلو تەورات) تەواوکەری یەکنو، کاتی خۆی ژیانیان پێ بەڕێوە دەچوو، بەلاّم دوایی گۆڕدرانو دەستکاری نێوەڕۆکیان کرا،

بەتایبەت ئینجیل کە تەنها ئامۆژگاری کۆمەڵایەتیو ڕووحیو ئەخلاقی تێداتۆمار کران، کەدیارە ئەوەش بەتەنها ژیانیمرۆڤایەتی پێ بەڕێوە ناچێتو پێی تەریبو تەنزیم ناکرێت، چونکە پەیامو کتێبەکانی خوای مەزن کە دێن بۆ ڕێکخستنی کاروباری ژیانیکۆمەڵگای مرۆڤایەتی دێن لەهەموو ڕوویەکەوە بۆیە ئێمە وەك مسوڵمان ئەو کێشەیەمان نییە، چونکە قورئانی بەرنامەمان لە بچووکترین شتەوە بگرە هەر لەدەست نوێژ تا دەگاتە جەنگو ئاشتیو سیاسەتو ئابووریو گرێدانیپەیوەندی نێوان گەلو وڵاتانو نێوان سەرکردایەتیو میللەت (راعي و رعية) ومامەڵەکردنی ئینسان لەگەڵ تاكو کۆمەڵ، لەگەڵ خزمو خێزان، لەگەڵ دەرەوەو نێوەوە، لەگەڵ دۆستو دوژمن، لەگەڵ چاكو خراپ، کتێبی تێرو تەواوی بێ هەڵەو پەڵەی خوا، هەموو ئەو شتانەی بەکورتیو بەپوختی ڕوونکردونەوە، وەسوننەتی پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی بەکردار بۆ بەرجەستە کردووین، جائەوەی کەدەیزانێ ئەوە شتێکی چاکە، وە ئەوەی نایزانێ ئەوا خەتای خۆیەتیو خۆی کەمتەرخەمو تاوانبارە، کەواتە کەسێك کە دەڵێت: دین سیاسەتو حوکمیتێدا نییە، یان باسی ئابووریو زۆر شتی تێدا نییە دیارە ئەو کەسە یان لەقورئان تێ نەگیشتوەو نایزانێو نەفامە یان هەر دژیەتیو تانەو تەشەر لەئیسلام دەدات، دەنا هەرکەسێك تەواو دیراسەی قورئانو سوننەت بکات باش دڵنیا دەبێ کەئەو جۆرە قسانە جگە لەتۆمەت چی دیکە نین! ئینجا ئەوە شتێکی مانادارو جێگای سەرنجە کەدەبینین ئەو دەوڵەتەی کەلەسەر ئەساسی شەریعەتو قورئان بنیات نرا، لەو ڕۆژەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەشاری مەدینە بەردی بناغەی بۆ دانا تا ئەو ڕۆژەی کە بەپیلانی ئیمپریالیزمی جیهانی لەسەر دەستی (کەمال ئەتاتورك)[٥٧]ی عەلمانی

٥٧) ئەتاتورك: بەتورکی واتە باوکی تورکان، لە١٨٨١لە (سالونیك) لەدایك بووە، لە ١٩٢٤

لەساڵێ ١٩٢٤دا کۆتـایی پێهات، (١٣) سەدەیخایاند، ئایا چ دەوڵەتێك لەمـێژوودا (١٣) سـەدەی خایـاندوەو توانـیویەتی بەرگەی ئەو هەموو گێرو گرفـتانە بگرێـتو، بەرگـەی ئـەو هـەموو گێروگرفـتانە بگرێـتو، بەرگەی ئەوهـەموو نـەیارو دوژمـنو پـیلانانە بگرێـت؟ دوژمـنانی وەك جوولەکەو تەتـەرو مەغۆلو مونافیقانی نێو خۆ؟!، بەڵێ ئیسلام ئاوایەو، کارو بناغەی هێـندە مەحکـەمو قایمـە کەبتوانێ دەوڵەتێك(١٣) سەدە لەسەر شانی خۆی ڕابگـرێ لەنێو ئەو هەموو گرفتو کێشەو جەنجاڵەی ژیاندا، هەرچەندە کەمو کـوڕیو هەڵـەو لادان هـەبووە، بـەڵام دیسـان ئـەو هەموو خۆڕاگرییە هەر گرنگە، بۆیە ئێمە دەڵێین کەشەریعەتی خوا (ئیسلام) دەتوانێ هەموو کێشە (کۆمەڵایـەتیو سیاسـیو ئـابووریو فەرهـەنگیو نەتەوایـەتیو سـەربازیو .هـتد..)ە کانمـان بـۆ چارەسـەر بکـات، بـەڵام بەمەرجـێك ئێمەش بەچاکی کـار بـە قورئـانو سـوننەت بکـەینو لێـیان لانەدەین، چونکە ئەو دوو تا تـەرازووە دەرمـانو چارەسـەریهەموو دەردێکـی ژیانـیان پێـیـە، دیـارە شـەریعەتێك کـە هـەڵقوڵاوی ڕەحمـەتو حیکمەتو زانیاری بێکۆتایی خوا بێـت، بەتەئکـید دەتوانێت هەموو هەڵەو کەمو کووڕییەکانی ژیان چارەسەر بکـاتو کۆسـپو تەگـەرەو ڕێگـرەکانی بـەردەم ژیـان لابـبات، چونکە ئەو شـەریعەتە بۆ ئەوە هاتوە کە لە ژیاندابەیڕەوی لێ بکرێو بکرێتـە دەستورو بەرنامەی ژیان لەهەموو ڕووێکەوە، کەچی هی وا هەیە وادەزانێ ئەگەر ڕوو لـەدین و مسـوڵمانەتیو دیـنداریی بکـات، ژیـان رادەوەسـتێو گـوزەران نامێـنێو خـەڵك بـەرەو دواوە دەچێتو تەکنۆلۆژیا هەرەس دێنێت!!، بەڵام وانیـیەو ئـەو بیروبۆچوونە زۆر هەڵەو بێ بناغەیە، بەڵێ مسوڵمانان لەچەند

---

لەسەر دەستی ئەو بەپلانی زلهێزان خەلافەتی ئیسلامی هەڵوەشایەوەو، دەوڵەتی عەلمانی نوێ لە تورکیادا دامەزراو، لە ١٩٣٠ سوپای یۆنانی بەدەرناون و لە١٩٣٨ دا مرد، پیاوێکی زۆر بێ ڕەوشتو خوانەناس بوو.

ڕوویەکــەوە (لــەڕووی زانســتو زانــیاریو تەکــنۆلۆژیای ســەردەم)ەوە دواکـەوتوون، ئـەوەش هۆیەکـەی ئەوەیـە کەلـە دیـندا دواکەوتوون، چونکە ئەگـەر پەیـڕەوی تـەواویان لـەئایین بکردایە ئەوە لەگەڵ ڕەوتی پێشکەوتنی زانسـتدا دەڕۆیشـتنو دەست بەرداری سازکردنو چنگ خستنی تەکنۆلۆژیای نـوێو تـازە نەدەبوون، بەڵام لەزۆر ڕووەوەش زۆر پێشکەوتەوون، پێشتریش ئەوکاتـەی کەمسوڵمانان باش بەدینەکەیانەوە پابەند بوون لەڕووی زانستیو پیشەسـازییەوە زۆر لـە پـێش ئەورووپاوە بوون وەك لەمێژووی شارستانیەتی ئیسـلامیو لەمۆزەخانەکانی جیهاندا ئەوە دەردەکەوێت، وەك دکتۆر عەلی شـەریعەتی دەڵێـت: کاتـێك بـوو ئەوروپیەکان کەشتێکیان دروست دەکرد مـۆری (اللە)یـان لـێی دەدا کە مۆری جیهانی ئیسلامی بوو، تاکو خەڵکی وابـزانن کەلەسـەر دەسـتی مسوڵمانان دروست کراوەو کەلو پەلەکەیان برەو (ڕەواج)ی هەبێـت!، دیـارە ئەوەش لەبەر ئەوە بووە کە پیشەسازی وڵاتانو جـیهانی ئیسـلامی پێشـکەوتوو بـووە، وەك چـۆن ئێسـتا پیشەسـازی ئەورووپـیەکان پێشـکەوتووەو کاتـێك کـە ئامـێرو شـتێك دروست دەکەن، هـێمای وڵاتەکـەیانی لێ دەدەن، یان خەڵکی دەڵێن: فلانە شتە ئەمریکیی یـان ئینگلـیزییەو شـتەکە زۆر چـاکە، ئیـنجا ڕەواجـی دەبێت، وە دەڵێن: جـارێك (هـارون الرشید) سەعاتێکی لمی بۆ یەکێك لەپاشاو ئیمپڕاتۆرەکانی رۆم نـارد کـە بـۆ خـۆی دەجولاو کاری دەکرد، جالەبەر ئەوەی کاتژمێرەکە بـەلای پادشـایەکەوە زۆر سـەیر بـوو، کۆمەڵـێك لەزاناو شارەزایانیخۆیان کۆکـردنەوە تـا تەماشـای سـەعاتەکە بکەنو لێی بکۆڵنەوە ئاخۆ چۆن ئاوا لــەخۆوە کاردەکـات و پێیان شتێکی زۆر ناوازە و دەگمەن بوو، پاشان دوایین ڕایان ئەوەبوو کە گوتیان:

حەتمـەن (جـند)ێـك یان ڕوحێکی خراپەکار خراوەتە نێو ئەو سەعاتەوە ئەگەر نا چۆن لەخۆیەوە دەجوولێو کاردەکات!!

کەواتە: پوختەی قسەن ئەوەیە کە سیکۆلاریزم (بێ دینایەتی) هیچ جێپێیەکی لەجیهانی ئیسلامیدا نیەو بەهیچ جۆرێك هیچ بیانوو و پاساوێك نیە بۆ پەنا بردنی مسوڵمانان بۆ عەلمانییەت، چونکە مسوڵمانان لەسایەی قورئانو سوننەتو شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەو پارێزراوی خواوەو لەسایەی رێبازی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لەهەموو رێچکەو رێبازێك بێ نیازن، بەتایبەتیش بێ دینایەتی (سیکۆلاریزم) کەڕاست دژو پێچەوانەی ئایینەکەیانە.

## لەکۆتایی ئەم باسەش دا بەپێویستی دەزانم سێ ڕاستی ڕابگەیەنم

**یەکەم**/ وەرگرتنی عادەتو نەریتو خوو، وەرگرتنی جلو بەرگو پۆشاكو سیماو دیاردە لەهەر میللەتێکەوە لەسەر بنچینەی لاسایی کردنەوە، بەبێ ئەوەی کەکەڵكو حیکمەتو فەلسەفەکەی بزاندرێت ئەوپەڕی دواکەوتنە، بۆ وێنە: یەکێك کە (کابۆ) لەبەر دەکات یان خەنافیز بەردەداتەوەو یان بەجۆرێکی سەیر سەری دەتاشێ یا هەر کارێکی تری نامۆو سەیر دەکات کە لە عادەتو نەریتی میللەتی ئێمەدا نییە، ڕەنگە لەجێی خۆی فەلسەفەیەکی هەبێ، یان لەبەرهۆیەك یان بەبیانووێکەوە بکرێتو شتێکی تێوە پێچرابێت، بەڵام لێرە کە لە خۆڕا لاسایی دەکرێتەوە بەبێ ئەوەی کەهیچی لێ بزانرێت، ئەوە دواکەوتنو نەزانینە، جا پیاو بیکاتو یان ئافرەتو، خوێندەوار بیکات یان نەخوێندەوار ، چونکە ئێمە میللەتێکین دەڵێین قەوارەو ناسنامەی نەتەوەییمان نییەو دان بەکیانی سیاسیمان دانانێن، ئەدی بۆچی بۆ خۆشمان خەریکە بەو تەقلیدە کوێرانەیە ناسنامەو مۆرکی نەتەوایەتیمان کوم دەکەینو لەخۆمانی دادەماڵین؟! ئەوەتا هەر لەجلو بەرگو کەشتوگوزارو مامەڵەو تێکڕای عادەتو

نەریــتەکانی تــری کۆمەڵایەتــیمان تــا دەگاتــە بــوونو قــەوارەی سیاســیو نەتەوایەتــیمان لاســایی دەرەوە دەکەینەوەو خۆمان بەخاوەنی هیچی خۆمان نــازانین، هــەروەك زۆر جــار کەباســی کیانو دەوڵەتیش دەکرێ ئێمە ناوێرین باســی لــێوە بکــەین لەترســی گلــەیی ئەورووپاو ئەمەریکا، بەڵکو حاشای لــێدەکەین وە دەڵێین، ئێمە قەت باسی کیانو دەوڵەتمان نەکردوە!، ئاخر ئەوە پاکانەیــە بــۆ چــی؟ خۆ بڤەو بوهتانو تۆمەت نییە تاباسی نەکەین، بەڵکو مافــێکی هەق وشەرعییەو خوای دادگەر بەهەموو میللەتو ئادەمیزادێکی داوە لەســەر ئەم زەوییە، هەقی خۆیەتی کەلەسەر خاكو وڵاتی خۆی بژیتو، خــاوەن کــیانو دەســتەڵاتــی تایــبەتی خــۆی بێــت، تــۆ بۆچــی بــۆ رازی کــردنیئەمەریکاو ئەورووپا لەو هەقە لادەدەیو تەنازولی لێدەکەیت؟، بەڵێ هــەندێك کــەس لەســۆنگەی ئەوەوە کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەرییو رکێفی فەرهــەنگو سیاســەتی بــێگانەو بــۆ رازی کــردنی ئەوان ئایینو بەرژەوەندی خۆیان وەلادەنێن، جائەگەر لاسایی کردنەوە لە بواری عادەتو نەریتدا هەڵە بێــت، بــێگومان وەرگرتــنی فــیکرەو فەرهــەنگو بیروبۆچــوونو بــیردۆزە مرۆڤکردەکانی ئەوان کە لە دژی ئایینو نەریتو سروشتی ئێمەن، بەتەئکید ئــەوە هــەر زۆر هەڵــەو خەتــەر ترە، چونکە بریتیە لەلادان لەرێبازی خوای دادگــەرو کاربــەجێ، کــە ئەوەش زلترین گوناهە وەك خوا دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْــنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ ﴾ (الجاثــــــية:١٨)، واتە: ئەی (محمد) تۆمان خستۆتە سەر راستە شەقامێك، جاشــوێنی بکــەوەو هەرگــیز پەیــڕەوی لەئارەزووی ئەوانە مەکە کە (ڕێگای ڕاســت) نــازانن، پێشــتریش لــەبارەی ئەورووپــیەکانەوە گوتمــان کــە: چونکە دینێکیڕاســتو دروســتیان لەبــەر دەســتدا نــەبووە کــە پەیڕەوی لێ بکەنو زامــەکانی ژیانــیانی پــێ ســاڕێژ بکــەن، بۆیــە بە ئاودا چوونەو ئەوانیش بۆ رزگــار بوونــیان لەخــنکان دەســتیان بــۆ هەموو زلەگیاو پووشو پەڵاشێك

بـردوه، تـا دەرنجـام (سـيكولاريزم)يـان دەسـكەوتوەو، دەستی خۆيانيان تێ گـرتوه بۆ ئەوەی لە كولەمەرگی مەسيحيەتی شێوێنراو قوتاريان ببێ، بەڵام كە لەو نەجاتيان بوو كەوتنە چاڵێكی رەشی دیكەوە كە سيكۆلاريزمە.

بـەڵام مـيللەتانی (مسـوڵمان) بەئاودانەچـوونو، دينـێكی راسـتو دروسـتيان لەبەر دەست دايەو ئەگەر بەدوای بكەون سەرفەرزای دنياو دوارۆژ دەبن و لە هيچ روێكەوە سەرگەردان نابن.

## دووەم/ با پـەند لەغەيـری خۆمـان -عـەرەبو تـورك و فـارس- وەربگرين.

عەرەب تا بەئيسلامەوە پابەندبوونو بۆ ئيسلام دەژيان، زۆر عەزيزو زاڵو دەسەڵاتدارو بەسامو بەناو.. بوون، كەرووويان لە ئيسلام وەرگێڕاو دەست بەرداری بوون بەچ دەردو پەندێك چوون؟! وە تورك پێشتر خەلافەتی ئيسلامیيان هەبوو، نەوپەڕی دەستەڵاتيان لەدەست بوو، گەلانی دونيا موحتاجی ئەوان بوون، وە زۆر جار بوێرانە بەرگريان لە ئيسلام دەكرد، بەڵام كە بەدوای رێبازی كەماليزم (كمال ئەتاتۆرك) كەوتن، و بەدوای عەلمانييەت كەوتن بەو حاڵە گەيشتن كە ئێستا تيايدادەژين!!، لەساڵی (١٩٩٦)دا چووم بۆ ئەستەنبوڵ، چاوپێكەوتنێكی رۆژنامەگەرييم لەگەڵ كۆمەڵێك لەرۆژنامەنووسانی توورکیدا كرد، لەيەكێك لە پرسيارەكانياندا گوتيان: چوويت بۆ (طوب قاپی) شوێنەواری خەليفەو سوڵتانەكانی عوسمانی؟! گوتم: بەڵێ، سەرنجێكی سەرسوڕهێنەرم بۆ دروست بوو، بەراوردێكم بۆ دروست بوو لەنێوان توركيای تازە لەسايەی دەوڵەتی عەلمانييەتدا و توركيای پێشوو لەسايەی خەلافەتی ئيسـلامیدا، گوتيان چۆن هەستت چیيە؟!، گوتم: توركيای ئێستا بۆتە پاشكۆی بێگانەو بەلكوخەڵك بەپاشكۆشی قەبووڵ ناكەنو بەهەزار تكاو ڕەجا وا لە بازاڕی

هاوبەشــی ئــەورووپی وەرتــان ناگــرن، کەچــی ئەوســا پادشــاو قەیســەرو دەســەڵاتدارانی ئەوروپا مەمنون بون ڕێگەیان پێ بدرێ کەتەنها بێنە دیدارو خـزمەت ســولتانەکانی عوسـمـانی، چـونکە لـە ژێـر ســایەی خـیلافەتی ئیســلامی‌دا (تورکـیا) ســەر قافڵەو براگەورەو کاربەدست بوو، وەسەری لە کەهەکەشــانی ئاسـمـان بـوو، کەچـی ئێسـتا لەگەڵ زەوی تەخت کراوەو هیچ حســابێکی بـۆ ناکرێـت، لەدووایـیدا گوتـیان: ئـێمە نـاتوانین ئـەوە بـڵاو بکەیــنەوە، گــوتم: بەهــەر حاڵ ئەوە ڕاو سەرنجی منە سەبارەت بەتورکیا کە حەقیقەتەو ئێوەش کەیفی خۆتانە بڵاوی دەکەنەوە یان نا!!.

هــەروەها ئێرانیــیەکان لەسەردەمی ڕەزا شاو موحەممەدی کوڕی‌دا چۆن بــوون، بــەڵام دواتــر کــە شۆرشێکی (ثورة) یەکی ئیسلامییان کرد، بارەکە ســەدو هەشــتا پلــە وەرچەرخاو گۆرانکارییەکی گەورە لەهەموو لایەنەکانی ژیانــیاندا ڕوویــدا، هەرچــەندە بــرادەرانی کۆمــاری ئیســلامی ئێرانــیش بۆ خۆشیان دەڵێن: زۆر لەوەزعی خۆمان رازی نین کەنەمان توانیوە ئیسلام باش پــیادە بکــەین، بــەڵام خــۆ جــیاوازی لەنــێوان ئــێرانی کــۆنو ئێرانی تازەدا لەســایەی ئــەو وەرچــەرخانەوە ئاسـمــانو رێســمانە؛ ئێســتا ئــێران خـاوەنی سیاسەتو هەڵوێستی خۆیەتی، خاوەنی چەندان شتی گەورەو گرنگی ژیاریو ژیانیخۆیــەتی، بۆیــە دەتوانێ بەگەورەترین هێزی جیهانی بڵێ: نەء کەچی کــاتی خــۆی ناویــان لــە شــا نابوو پۆلیسی ئەمەریکا، وەك چۆن ئێستا بە (تۆنــی بلــیر)ی ســەرۆکی وەزیرانیبەریتانــیا دەڵــێن: وەزیــری دەرەوەی ئەمــەریکا، هــەروەها بــڕوانن عــەرەب لــە (٢٢) دەوڵەت بە زیاتر (٢٠٠) ملــیۆن کەســەوە چــۆن زەلــیلو زەبوونی بەردەستی بێگانەن؛ بۆیە هەر لەم شــەوانەدا وەزیــری دەرەوەی یەکــێك لــەوڵاتانی عەرەبی گوتی: ئەمڕۆ ئێمە دەستەپاچــەو بــێ دەسەڵاتین، بۆیە هەر هێندەمان لەدەست دێ کە بڵێین، (لا حول ولا قوه إلا بالله) وهیچی ترمان پێ ناکرێو لەدەست نایەت!!.

دیـاره ئـەوەش ئەوپـەڕی زەلیـلـیو زەبوونـیو چەوساوەیی‌یە لەسایەی قەومیـــیەتو عەلمانـیەتو رەگەزپەرسـتایەتی‌دا، مەبەسـتم قەومیـــیەتو رەگەزپەرسـتییەکە کـە عەرەبـەکان دەیکـەن، چـونکە عارەبـەکان گرفـتی نەتـەوەییو مـافی چارەنووسیان نیە وەك گوتمان (٢٢) دەوڵەتۆکەیان هەن! دەنـا خۆ ئەگەر کوردێکی چەوساوە باسی (قەومییەت)ەکەی بکاتو بڵێ با منـیش هـەبمو چـی دیکـە سـتەمم لێ نەکـرێو بەمافـە ئینسـانیو ئایینـی‌یەکانی خـۆم بگـەم، ئـەوە هەقی خۆیەتیو زۆر فەرقی هەیە لەگەڵ عەرەبێك کەکیانو دەوڵەتی هەیە بەڵام هەمیشە باسی (قەومییەت) دەکات نـەك باسی ئیسلام، بە واتایەکی تر ئەگەر تۆ شتێکت نەبێ هەقتە کەباسی بکەی، وەك کەسێکی برسیو بێ جێکە ئەگەر داوای نانو جێگای تێربوونو حەوانـەوەی خـۆی بکـات هـەقی شەرعی خۆیەتی بۆ ئەوەی بژیو نەمرێ، بـەڵام بۆ کەسێك کەنازانێ لەکوێ دابنیشێ لەبەر کۆشكو تەلارەکانیو زگی لەتێریان دێشێت، چۆن ڕووی دێو ڕێی هەیە کە داوای نانو جێگا بکات؟!

سـێیەم: ئەوەیـە کەئـێمە لـێرەدابێ پـەرواو زۆر بەڕاشکاویی دەڵێین: عەلمانیـیەت، واتـە: بێ دینایەتیو بەهیچ رەنگێك لەشەرعدا جێی‌نابێتەوە، بـەڵکو هـەر ئـەوەش بـێ دیـنی‌یە کە بگوترێ (عەلمانیەت لەدیندا جێگای دەبێـتەوە یـان لەگـەڵ دیندا دەگونجێ) چونکە وەك خستمانەڕوو عەلمانییەت هـیچ حیسـاب بـۆ خـواو پێغەمـبەرو دینو دوارۆژو بەهەشتو جەهەننەمو حەشـرو حیسـابو زیـندووبونەوە ناکـات، کەبێگومان هەموو ئەو شتانەش لەدیـندا جـێو پلەو پایەی تایبەتی خۆیان هەیەو، دین بریتیە لەوشتانە! وە بۆیەش لەم توێژینەوەیەماندا ئەو راستی‌یە بەڕوونیو راشکاویی دەخەینەڕوو بێ ئەوەی شەرم لەکەس بکەین، چونکە ئێمە فێڵ لەمیللەتی‌خۆمان ناکەین، چەواشـەی ناکەین، کێ پێی خۆشە یان پێی ناخۆشە، کەیفی خۆیەتی، ئێمە

راستیمان گوتوەو، هەقمان خستۆتەڕوو، نایشارینەوە ڕاستی بۆ خەڵکی خۆمان ڕوون دەکەینەوەو دەڵێین عەلمانیەت لەڕوانگەی ئیسلامەوە، واتە: بێ دینایەتی، وەناشڵێین هەرچی عەلمانی‌یە یان هەرچی ناوی عەلمانی لەخۆی ناوە لەدین دەرچوە، چونکە ئەوانەی کەناوی عەلمانیەت لەخۆ دەنێن دووبەشن، بەشێکیان ئەوەن کەلە عەلمانیەت گەیشتوونو وەك مەبدەئو ئایدیۆلۆژیا هەزمیان کردوەو، دەزانن کەعەلمانیەت چی‌یەو چی دەڵێ‌و چی دەوێ‌و بۆیە بەدوای‌کەوتوون، کەدیارە ئەوە بێ دینایەتی‌یەو بابای وا هیچ پەیوەندی بەدینەوە نەماوە، وە بەشێکیان ئەوانەن کەهەروا بەتەقلیدو کوێرانەو بەبێ دیراسەو تێگەیشتن بەدوا عەلمانیەت کەوتوون، وەك چۆن بەتەقلید بەرگەکەی لەبەردەکاتو بەتەقلید پەیڕەوی لەعادەتەکانی ئەورووپا دەکات بەبێ ئەوەی‌کە لەفەلسەفەکەی تێ‌بگات، هەربەو شێوەیەش لەڕووی فیکرییەوە بەتەقلید دەڵێت: عەلمانیەت باشە یان (عەولەمە) شتێکی زۆر چاکەو بەس خێرو بەرەکەتە، بە بێ ئەوەی کەبزانێ ئاخۆ خێرو بەرەکەتەکەی چی‌یەو لە کوێ دیارەو چۆنە. کەدیارە ئەو جۆرە کەسانە حوکمیان جیاوازەو هەتا بەڵگەیان لەسە تەواو دەکرێ‌و بیانووبڕ دەکرێن تا ڕاددەیەك چاوپۆشی‌یان لەگەڵ بەکار دەهێنرێ، چونکە زاناو پێشەوایانی‌ئیسلام بۆ حوکمی کوفرو بێ دینی‌بەسەر خەڵکی مسوڵمان یان بەڕواڵەت مسوڵماندا لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە دەبێ بنچینەی چەسپانی مەرجەکانو لاچوونی پەرچەکان (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) یان لەگەڵ بەکار بێت، هەربۆیەش گوتوویانە، (قد يكون قولُ الرجل وفعله كفراً ولا يكون هو به كافراً).

جالەو بارەوە کە گوتمان: مەرج نی‌یە هەرکەسێك عەلمانی بێت یەك حوکمی‌شەرعی هەڵبگرێت، ئەم بەسەرهاتەتان بۆ دەگێڕمەوە کەلەسەرەتای ڕاپەڕینی گەلی کورد لەئازاری (١٩٩١)دابرایەکی‌خۆمان بۆی گێڕامەوەو گووتی: دوای ڕاپەڕین گەیشتمە برایەکی مسوڵمان کەخزمم بوو لەگەڵ

حیزبی شیوعیدا بوو، پێم گوت فلانەکەس ئەوە ئێستا لەکوێو چی دەکەیت بـۆ دیار نیت؟!، ئەویش گوتی: وەڵڵا ئەگەر خوا قەبوولی بکات ئەوە لەگەڵ حیزبی شیوعی دام!!، بۆیە کەسێك وەك ئەوپیاوە لەعەلمانیەت حاڵی بووبێ، حوکمـێکی تری هەیەو دەبێ بەرچاوی ڕوون بکرێتەوەو حاڵی بکرێت کەنابێ بەهـیچ جۆرێـك بەتـەما بـێ خـوا بێ دینایەتییت بە دینداریی بۆ حیساب بکـات! ئاخر چۆن دەگونجێ کە ئینسان بێ دین بێتو لەگەڵ خەڵکی بێ دین دابێـت، کەچی خواش بەدینو عیبادەت بۆت حیساب بکات! بێگومان ئەوە ئەسـتەمە (محال)ە وهیچ بیردۆزەو فیکرەیەکی بەشەریش ئەوە قبووڵ ناکاتو پـێی رازی نـیە، چ جـای ئـاینو بەرنامـەی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی بوونەوەرو کائینات!!.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى أله وصحبه وسلم

## ئاڵقەی (٢)

# مافەكانی مرۆڤ لەنێوان ئیسلامو رۆژئاوادا

پێشەكی:

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه،

بەخێر هاتنی گەرمی هەموو لایەك دەكەمو خۆشحاڵم بەبەشداری هەموو بەڕێزان خوشكانو برایان.

بەڕێزان: بێگومان بەرێزترین دروستكراو لە ڕوانگەی ئیسلامەوە كە لەم سەر زەوییە هەبێت و، ناوازەترین وە پایەدارترین دروستكراو كەلە بوونەوەردا هەبێتو خوای پەروەردگار بەكۆمەڵێك تایبەتمەندییەوە خولقاندبێتیێ، كەلەهیچ كام لە دروستكراوەكانی دیكەدا نین، مرۆڤە.

جا لەم سەردەمو رۆژگارەیئێمەدا كە ئینسانییەت زۆر هۆشیار بۆتەوە، وە لەزۆر لایەنو بواری ژیانو ژیاردا بەرەو پێشەوە چووە، یەكێك لەو بابەتانەی كەهەموو لایەك لەسەری یەك دەنگنو جەختیلەسەر دەكەن، بریتییە لە دابینكردنی مافەكانیئینسان،بەڵام بەداخەوە كە لەبەرانبەر تێروانینیئیسلامو هەڵوێستی ئیسلامدابۆ مافەكای مرۆڤ لێڵیو تارمایی بەرچاوی خەڵكێكی زۆری گرتوە، تەنانەت كەسانێك هەن كە تۆمەتی ئەوە دەدەنە پاڵ ئیسلام، كە رێز لە ئینسان ناگرێ، وەگوێ بەمافەكانیشی نادات!!، بەڵام وەك ڕوونی دەكەینەوە ئەو ڕێزو پایەو مەقامە بەرزەی كە ئیسلام بۆ ئینسانی داناوە، وە ئەو مافانە كەهەوڵ دەدات بۆ ئینسانەكانیان دابین بكات، بەهەموو دینو فیكرەو بەهەموو شێوەو ڕەنگو

زمانەکانـیانەوە، ئـا ئـەو ڕێـزو پایـەو مەقامەو، ئەو مافە بەرزو ناوازانە، لەڕاستیدا لە ژێر سایەی هیچ بەرنامەیەکی دیکەدا چنگ ئینسان ناکەون.

ئیـنجا شـتێکی نکـوولیٚ لیٚ نەکـراوە بـۆ هەرکەسـێك کە ویژدانێکی سـاغو عـەقڵێکی سەلیمی هەبیٚ، کەڕێز لەئینسان گرتن، وە دابینکردنی ئەو مافانـەی کـە بـەبیٚ ئـەوان ناتوانـیٚ ژیانێکی ئینسانانە بەسەر بەریٚ، ئەوە سـەنگیمەحەکە بۆ هەلسەنگاندنی هەر بەرنامەیەكو هەر بیرو باوەڕێك، وە هـەر بەرنامەیـەك و هەر سیستەمێك بەئەندازەی ئەوە سەرکەوتوو دەبیٚ بۆ بەخـتەوەر کـردنی ئینسـان، وە بـەرەو پـێش بـردنی ژیان، کەڕێز لەئینسان دەگریٚ.

شـایانی باسیشـە کەئـێمە ئەم بابەتەمان لەدوو بەشی سەرەکیدا پێشکەش دەکەین:

لەبەشـی یەکەم و لەخاڵیٚیەکەمدا دەمانەویٚ بزانین کە سەرەتا ڕۆژئاواو ئـەورووپا، چۆن جموجۆڵی داواکردنیمافەکانیمرۆڤی دەست پێکردو، بەچەند قۆنـاغدا تێـپەڕی، وە پاشـان لـەخاڵی دووەمـدا چەند تێبینییەكو چەند سـەرنجێکی خۆمـان لەسـەر تێڕوانیـنی ڕۆژ ئاواییانـە بـۆ مـافی مـرۆڤ دەخەینەڕوو، لەبەشی دوومیشیدا دێینەسەر : هەڵوێستی ئیسلام لەبەرانبەر مافـەکانی مـرۆڤدا، لەخاڵیٚیەکـەمدا ڕوونـی دەکەیـنەوە داخـۆ بنەماکانی شـەریعەت لـە تێڕڕوانیـنی بۆ مافی مرۆڤ چین؟!، وەپاشان لەخاڵی دووەمدا مافەکانیمرۆڤ لەسایەی شەریعەتدا دەخەینە ڕوو وەچۆن دابین دەکرێن؟

# بەشی یەکەم: مافەکانیمرۆڤ لەڕوانگەی رۆژئاواوە

## یەکەم: سەرنجێکی مێژوویی لەبارەی جوولانەوەی داواکردنی مافیمرۆڤەوە

باسەرنجێکی مێژوویی لەسەرهەڵدانی جوولانەوەی مافەکانی مرۆڤ لەرۆژئاوادا بدەین، ئایا رۆژئاوا لەکەیەوە توانی هەمووی یەك دەنگ بێ لەسەر ئەوە کەمافەکانیمرۆڤ دابین بکرێن؟ ئایا هەر لەسەرەتاوە ئەو فیکرەو بۆچوونەی هەبوو، یان دوای کۆمەڵێك هەوڵو تەقەللاو شۆرشو زەحمەتکێشان بەوە گەیشتن؟!!.

گەلانی رۆژئاوا لەسەدەکانی نێوەڕاستداوەك میللەتو جەماوەر خاوەنیهیچ هەقو مافێك نەبوون لە بەرانبەر حوکمڕانەکاندا، ئەوە شتێکە لەهەموو کتێبەکانیمێژوودا ڕوونو ئاشکرایە، لە بەر ئەوە کەئیمپراتۆریەکان وەقەیسەرو پادشایەکانی ڕۆم-واتە هەموو ولاتانی رۆژئاوا، بەئەمەریکاشەوە- لەسەر بناغەی مافیخوایی-الحق الألهي) حوکمڕانییان دەکرد.

مەسەلەی (ثیوکراسی/ الثيوقراطية) کەلەبەرانبەری (دیموکراسی) دایە، (دیموکراسی): واتە: حوکمی گەل، (ثیوکراسی) واتە: حکمی خوا، لەراستیدا هەڵقولاوی رۆژئاوایە، وە لەسەدەکانی نێوەڕاستدا پادشاو دەستەلاتدارانی رۆژئاوا هەموویان بەبێ جیاوازی لەسەر ئەو بناغەیە حوکمیان دەکرد بەسەر میللەتو خەڵكو جەماوەریاندا، بەوەی کە هەرکام لە پاپاو ئیمپراتۆرەکان خۆیان بەسێبەرو نوێنەری خوا دەزانی لەسەر زەوی بەوەی کە میللەت هەقی هەڵبژاردن و ڕەخنەی نیە، جائەوەی کەماڵی میللەتی زیاتر وێران کردبوو، وە قورەکەی زیاتر بۆ خەست کردبوو، ئەوەبوو

کـەدامو دەزگـای کڵێسـا، کەچـینی ئـەکلیروس (طـبقة الأكلـيروس) یان پێ دەگوتـن، واتـە پـیاوانی دیـنی (رجـال الدين) کە وەك جارانی تریش باسمان کـردوە زاراوەی پـیاوانی دینی هیچ پەیوەندییەکی بەئیسلامەوەنیە، چونکە لەئیسـلامدا هـەموو پـیاوان دەبـێ پـیاوانی دیـنی بن‌و هەر کەسێك بڕوای بـەدین هەیـە دەبێ پیاوی دین بێ وە زانایانی دینی کۆمـەڵێکی دیاریکراوو تایـبەت نـین لەنێو  مسوڵمانانـدا، بەڵێ جا ئەوەی قورەکەی خەستتر کردبوو ئـەوە بـوو کەپـیاوانی کڵێسا لەو مەسەلەیەدا کە حوکمڕانەکانی بەحەقێکی خوایـی حوکم بەسەر میللەتدا دەکەن‌و میللەت هیچ حەقی هەڵبژاردنی نیە، وە حـەقی ڕەخـنە گرتنی نیە، وەتەنانەت حەقی ئامۆژگاری کردن‌و تێبینی‌و پێشـنیار خستنەڕووشـی نـیە، (پـیاوانی دینی)ش لەگەڵ پیاوانی دنیایی‌دا، پـیاوانی کڵێسـالەگەڵ قەیسەرو پادشاو دەستەڵاتدارەکاندا لەوەدا هاوفیکرو هاودەست بوون، بەواتایەکی دی: شەریکە دز بوون بەیەکەوە!!

وەهەردووکـیان بـۆ میللەت‌و جەماوەر بوبوونە ملۆزم، یەکیان بەناوی سیاسـەت‌و حوکمەوە، یەکیشیان بەناوی دین‌و دینداریی کڵێساوە میللەتیان لـە تـەنگژە نابوو، تەنگیان بەخەڵك هەڵچنیبوو، پشوویان پێ سوارکردبوو، وەهـیچ کەسـێك مـافی نـەبوو کـە ڕەخنە لەسیستەمی حوکم بگرێ، دیارە سیسـتەمەکانی حوکمـڕانی ئەوکاتـەش تـێکڕا سیسـتەمی تاکـڕەوانەو دیکتاتۆری بوون!

ئا لەبارودۆخ‌و کەش‌و هەوایەکی ئاوادا[٥٨] خەڵك‌و جەماوەر وردە وردە جموجۆڵـیان تـێکەوت، چونکە خوای بەدیهێنەر ئیسنانەکانی وا خوڵقاندوون بـەفیطرەت، وە بەویژدانی ساغیان، وە بەعەقڵی فیطرییان، هەست دەکەن بەحـەق‌و ناحەق، هەست دەکەن بەزوڵم‌و عەدل، هەست دەکەن بەڕەش‌وسپی،

---

٥٨) وەك لەکۆڕێکی پێشتر لەباسی (سیکولاریزم-علمانیة) داباسمان کرد.

جاخـەڵكو جـەماوەر وردەوردە دەستیان كرد بە بێزاریو نارەزایی دەربڕین، وە فەیلەسـووفو حەكـیمەكانو نووسـەرو بلـیمەتەكان بوونـە پێشـڕەوو سـەرقافڵەی خـەڵكو مـیللەت، هـەتا ئەوە بوو كەچەند شۆڕشێك ڕوویاندا- هەرچـەند ئێسـتادەرفەتمان نیە بەدرێژی باسیان بكەین-، لەساڵی (١٧٧٦)ز لەئەمـەریكا شۆرشـێك ڕوویـدا بۆ سەربەخۆیی وەدەستهێنان بۆ ئەمەریكا، كەئەوكاتـە ئەمەریكا (مستعمرة)ی ئینگلیزەكان بوو، جا ئەوەبوو شۆرشیان كـردو داوای سەربەخۆیی یان كرد كەچیتر لە ژێر نیری ئیمپراتۆری بەریتانی (الأمـبراطورية الـبريطانية)دا نەمێنـنەوە، وە هاوكات لەگەڵ ئەوە شۆرشیان كـرد دژی جـیاوازی رەگەزی، جیاوازی رەنگ، چونكەكۆمەڵگای ئەمـەریكی ئەوكاتـە زۆری رەش پێست بوو، یاخود رەنگیتری هەبوو، دیارە بەشێكیشی سپی پێست بوو.

وەپاشـان لـە سـاڵێ (١٧٨٩ز) شۆرشـی نـاوداری فەرەنسـا ڕوویدا كە یەكـێك لـە دروشمەكانیان ئەوەبوو دەیانگوت: بەریخۆڵەی دوایین قەشە دوایین پادشای ستەمكار لەسێدارە بدەن،واتە هەردووكیان بەیەكەوە لەگۆڕ بنین.

ئاشكراشـە خەڵكێكی ژێر چەپۆكو چەوسێندراوە دوای ئەوەی لەزیندان (سـجن) رزگـاری دەبـێ یەكـەمین شـتێك كـەبیری لـێدەكاتەوە بریـتی‌یە لـەئازادی، وەك لەكوردەواریی خۆماندا گوتراوە: (ئەگەر لەبرسی بپرسی: (٢ +٢) چـەند دەكـات؟ دەڵـێ: دەكاتـە چوار كولێرە)، یان عارەب گوتوویانە: (صـاحب الحاجـة أعمـى إلا عن حاجته) واتە: ئەوەی پێویستی‌یەكی هەبێت تەنیا پێویستی‌یەكەی خۆی دەبینێ، ئاگای لەهیچی دیكە نیە.

خـەڵكی رۆژئـاوا كـە لە ژێر نیری هەردووك تاغووتی بەناو دینیو دونیایی، ئیمـپراتۆرەكانو پاپایەكان، رزگاریانبوو، یەكەمین هاوار كە لێیان بەرز بۆوە ئـەوەبوو كـە داوای ئازادیان كـرد، ئـازادیی چی؟! ئازادیی بیركردنەوەو

دەربڕین، ئازادیی عەقیدە، ئازادی شەخسی، ئازادی کۆمەڵایەتی، ئازادیی ئابووری، ئازادیی سیاسی، تا کۆتایی.

جائەگەر تەماشای ڕەوتی جووڵانەوەی مافی مرۆڤ بکەین لەرۆژئاوا، دەتوانین لەم چەند بڕگەیەدا بەکورتی پوختی بکەینەوە:

أ- پێشتر باسمان کرد کە لەساڵی (١٧٧٦ز) لە ئەمەریکا شۆڕشی سەربەخۆیی لە دژی دەستەڵاتی بەریتانی راگەیەندار، وە شۆڕشەکە سەری گرت، ئەمەریکییەکان سەربەخۆییان وەدەست هێنا، پیاوێك بەناوی (تۆما جیفرسۆن) وەسیقەیەکی نووسی بەناوی (ڕاگەیاندنی مافەکانیمرۆڤ (إعلان حقوق الانسان)، وە ئەو وەسیقەیە دوایی ڕەسمیەتی پێدراو ڕأگەیەندرا، کەهەم مەسەلەی سەربەخۆیی سیاسی گرتبۆخۆی، هەم ئازادیی کۆمەڵایەتیو یەکسانیی کۆمەڵایەتی.

ب- وەلەساڵی (١٧٩١ز) کەفەڕەنسا شۆڕشی کردو یەکێك لە شیعارەکانی بریتی بوو لە داواکردنی مافەکانی مرۆڤو دواتر دەستووری بۆ وڵاتەکەی خستەڕوو، چونکەهیچ وڵاتێك بەبێ ڕێسا (دەستور)ێك بەڕێوەناچێ، ئەگەرنا هەرکەسە لەخۆیەوە بە ئارەزوو و میزاجی خۆی قانوون دادەنێ، بۆیە دەبێ دەستوورێك هەبێ، واتە قانوونێکیئەساسی هەبێ پشتی پێ ببەسترێ بۆ هەڵهێنجرانی یاسایەکانی، ئەوکاتە ئەو وەثیقەیەی کە دەربارەی مافەکایمرۆڤ زانای فەڕنسی (ئەمانۆئێل جوزیف) نووسیبووی، ئەویش لەگەڵ دەستووری فەڕەنسیدا، ڕەسمیەتی پێدراو ئیعلان کرا.

ج- وەلەسەدەینۆزدەهەمدا زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتانی رۆژئاوا دانیان بەمافەکانی مرۆڤداهێنا، بەڵام هەتا ئەوکاتە مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ تەنها کاروبارێکی نێو خۆیی بوو، نەبوو بوو بەشتێکی نێو دەوڵەتی.

د- جەنگی جیهانی یەکەم کە لە ١٩١٤ تا ١٩١٨ ڕوویدا هەر لەنێو دەوڵەتانی رۆژئاوادا خۆیان بوو، بەڵام پڕیشکی ئاگرەکە وڵاتانی

ئیسلامیشی گرتەوە، پاشان جەنگی جیهانی دووەم ڕوویداو لە (١٩٣٩ز) تا (١٩٤٦ز) درێژەی کێشا، زیاتر لەپەنجا ملیۆن (٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کەس کوژران، ئەوە مەینەتی‌یەکی گەورە بوو بەسەر مرۆڤایەتی هات، بۆیە کۆمەڵێك خەڵکی‌زاناو بیر تیژو خێرخواز بۆ مرۆڤایەتی کۆبوونەوە، کەپێشتریش هەر قسەیان کردبوو لە (١٩٤٥) شتێکیان گەڵاڵە کردبوو، ئەوە بوو لە (١٠/١٢/١٩٤٨ز) دا ئەو (وثیقە) یەی کە دوایی بە (جاڕنامەی گەردوونی مافەی مرۆڤ / الاعلان العالمي عن حقوق الانسان) ناسراوە، ئیعلان کرا-کەدوایی تێبینی‌یەکانی خۆمانی لەسەر دەخەینەڕوو-کەلەڕاستی‌دا لەبواری دابین کردنو داواکردنی مافەکانی‌مرۆڤدا دەتوانین بڵێین: باشترین هەنگاو بوو، وە باشترین دەستکەوت بوو، ئەوە بو کەلەلایەن (ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان/ منظمة الامم المتحدة)، ڕاگەیاندرا، کەدیارە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئێستا میراتگری کۆمەڵەی گەلان (عصبة الأمم)ی کاتی خۆیەتی کەلە سۆنگەی ئەوە وە فەشەلی هێنا لەوەدا کە بتوانێت مەسەلەی جەنگو ئاشتیی نێو دەوڵەتان کۆنترۆڵ بکاتو کێشەکانیان چارەسەر بکات، هەڵوەشێنرایەوەو (ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان) دروست کراو جێی گرتەوە کەئەویش ئێستا خەریکن فەشەلی پێ بهێنن، هەندێك لە زلهێزەکان بەتایبەت ئەمەریکا هێندە زەختو فشاری دەخەنە سەر خەریکن لەنێوەڕۆك (محتوی)ی خۆی خاڵیی دەکەنەوە، ئەگەر بەکردەیی (فعلی)ش خاڵی نەکرابێتەوە لەنێوەڕۆکی خۆیو نەکرا بێت بەپەردە (غطاء)یەك بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری هەندێك لەزلهێزەکان بەتایبەتی‌ئەمەریکا، بەڵی جالەساڵی (١٩٤٨)دا بەڕەسمی (جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ) ڕاگەیەندرا.

هـ- وەلە (١٦/١٢/١٩٧٦ز) دا ئەوەبوو (نەتەوە یەکگرتووەکان) دوو (اتفاقیة)ی دیکەی کردن بەهاوپێچو وەك شەرحو تەفسیرو پاشکۆی ئەو

(جارنامــەی گــەردوونیمافی مــرۆڤ) بــەناوی (مافــە مەدەنیــەکانو سیاســییەکان/ الحقـوق المدنـية والسياسية)وە (مافە ئابووریو کۆمەڵایەتیو کلـتووریيەکان (الحقـوق الإقتصـادية والإجتماعية والثقافية) وە لە (١/١٣/ ١٩٧٧) وڵاتانی نێو ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕێککەوتن لەسەر ئەوە کـە ئـەو دوو (اتفاقـية) لەگـەڵ ئەسـڵی جاڕنامە گەردوونییەکەدا جێبەجێ بکرێن، وە دەبێ داوا لە دەوڵەتان بکرێ پێیانەوە پابەند بن.

و- وە لـەکۆتایی حەفتایەکان لەسەردەمی حوکمڕانی (جیمی کارتەر)داوڵاتە یەکگـرتووەکانی ئەمــەریکا دەسـتیکرد بــە جەخــتکردنی زیاتــر لەســەر مافــەکانی مـرۆڤ، دیـارە مافەکانیمـرۆڤ بەتێگەیشـتن (فهم)ی رۆژئاوا، وە داواکــــردنو جەخـــت لەســـەرکردنیمافەکانی مرۆڤـــیش بەمیکانــــیزمی ئەمــەریکی، کەئێســتا شـوێنەواری دەبیـــنین! کەلـە شـوێنێك بــە ڕقدابچن بـیانووی پــێ دەگـرن کەبۆچـی مافەکانیمرۆڤ جێبەجێناکات، شوێنێکیش کەلـێی رازی بــن چاوی لێدەپۆشن، وەك سیاسەتێکی باو، کە پێی دەگوترێ: (بانێکەو دووهەوا) یاخود (الکيل بمکيالين).

وەلەوکاتــەوە ئەمــەریکا دەســتیکرد بەدۆســیە (ملــف) کـردنەوە بــۆ دەوڵەتان، هەرکام لەدەوڵەتان ئەگەر بێتو مافەکانیمرۆڤ ڕەچاو نەکات، ڕێز لەمــرۆڤەکان نەگـرێو مافەکانـیان دابین نەکات، وەك گوتم ئەمەریکا بەپێی بــەرژەوەندی خــۆی بـیانووی پــێ دەگـرت ئەگەر بەرژەوەندیی تێدابا، یاخود چاوپۆشی لێدەکرد، ئەگەر بەرژەوەندی لەچاویۆشیکردندا بووایە.

ز- وە ســەرەنجام دوای هەرەســهێنانییەکیەتی سـۆڤیەتی پێشـوو لەساڵێ (١٩٩١ز)، وە هاتــنەکایەی دەســتەڵاتییەك جەمســەریی (سـلطة القطـب الواحـد) واتە ئەوەیکەپێی دەگوترێ: سیستەمی نوێی جیهان/ النظام العالمي الجديـد)، واتە بەتایبەتی دوای بەسترانیکۆنگرەی (ڕێکخراوە ناحکوومیەکان بـۆ مافەکایمـرۆڤ (المـنظمات غـير الحکومـية لحقـوق الانسان) لە (ڤینا) لە

سالّی (١٩٩٣)ز دا جاڕنامەیەکی تایبەت دەربارەی مافەکانی‌مرۆڤ دەرکرا، زیاتر لەژێر چاودێری‌و لە ژێر فشاری ئەمەریکا، کە ئەمەریکا خۆی سەپەرشتی دەکردو زیاتر داکۆکی‌یان کردووە لەسەر مافەکانی‌مرۆڤ (دیارە بەو چەمك‌و میکانیزمەی کە ئەمەریکا دیاری کردوون).

وە لەوکاتەوە ئەمەریکا بڕیاری‌دا کەهەرکەسێك ، وەهەر دەولّەتێك مافەکانی مرۆڤ ڕەچاو نەکات، تووشی سزا دەبێت، جا ئێستا کە ئەمەریکا سزای ئابووری‌و سزای بازرگانی‌و چی‌و چی بەسەر چەند دەولّەتێك داسەپاندووە بەحیساب لەبەر ئەوەیە کەمافەکانی مرۆڤ ڕەچاو ناکەن، بەلاّم بە لەبەرچاوگرتنی ئەو حەقیقەتە کە ڕەنگە خەلّکی ترو دەولّەتی تر هەبێ‌وەك جوولەکە (یهود)، یان شوێنی تر، مافەکانی‌مرۆڤی زۆر تێدا پێشێل بکرێن، بەلاّم لە بەر ئەوەی لەئەمەریکا نزیکن، یان ئەمەریکا بەرژەوەندیی لەوەدانیە کەفشاریان بخاتەسەر، ئەوە دیارە لەگولّ کالّتریان پێ‌ناگوترێ.

## دووەم : چەند تێبینی‌یەك لەسەر ڕەوتی جووڵانەوەی مافی‌مرۆڤ‌و جەوهەری مافەكانی مرۆڤ بەتێگەیشتنی ڕۆژئاوایی‌یانە

مـن وەك ئیسلامی‌یەك، كەتەماشای میژووی بەشەریەت دەكەم،پێم وایە كـە ئـەو جووڵانەوەی مافی مرۆڤ، وە ئەو (اتفاقـیە)یانەی كەكراون، وە ئەو (وپـیقە) و(اعلان)انە كەبلاو كراونەوە، هەمووی هەنگاوی باشن‌و لەخزمەتی مـرۆڤایەتی دابـوون بەگشـی، چاوپۆشـی لـەوە كە چ ئامانجێكی سیاسی‌و كۆلۆنیالـیزمی‌یان لەپشتەوە بووە، یان چ ئامانجێكی شۆڤینی (پاوانخوای)یان لەپشـتەوە بـووە، بـەلام گرنگ ئەوەیە بەگشتی هەركەسێك بلێ: با ئینسان ڕێـزی‌لێ بگیرێ‌و ستەمی لینەكرێ‌و نەچەوسێندرێتەوەو ئیهانەی پێ نەكرێ، ئـێمە دەبـێ سوپاسـی بكـەین‌و دەستخۆشـی لـێ بكەین، وە بەتەئكید ئەو جووڵانەوەیـەی داواكـردنی مافەكانی‌مـرۆڤ‌و دابین كردنی‌مافەكانی مرۆڤیش كـەم‌و زۆر كاریگـەریی بـوە لەسـەر سیاسـەتی زۆر لە دەوڵەتان، وە زۆر لە دەوڵـەتانی والـێكردووە كەلـە غـوروورو لەخۆبایی بوون‌و سەركێشیی خۆیان بگـرنەوە، لـە ژێر زەخت‌و فشاری ئەو ڕێكخراوانەی كەدوای مافەكانی مرۆڤ دەكـەن، وە ئـەو دەسـتەلاتانەی كـە بەهـەر حـاڵ ئەگـەر وەك (كراسـی عوسمان)یش بێ مافی مرۆڤیان كردووە بەدروشمێكی خۆیان بۆ زەخت‌و فشار خستنە سەر خەڵك.

وە (جارنامـەی گـەردوونی‌مافی مـرۆڤ)یـش كـە لەسـی (٣٠)بـڕگە پـێكهاتووە، ئەگەر ئینسان بە ویژدان (انصاف )ەوە سەرنجیان بدات جگە لە چـەند بـڕگەیەكی هـیچ كـام لەبـڕگەكانی لەگـەڵ شەریعەتی ئیسلامیی‌داو، لەگـەڵ بنچـینە شـەرعی‌یەكاندا دژایـەتی‌و نـاكۆكی یـان نـیە، دیارە چەند بـڕگەیەكی تـێدا هەیـە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیی ناگونجێن، ئەوەش وەك

دوایــی باســی دەکەین کە بۆ چی بەو شێوەیەیە، ئەگەر نا زۆربەی بڕگەکانی لەگــەڵ شــەریعەتدا کۆکــن بەتایــبەت ئــەوە کەکەس لەکەس گەورەتر نیەو، ئینســانەکان دەبــێ لەبەرانــبەر دادگــادا وەك یــەك بن‌و، هەموو ئینسانێك دەبــێ ڕێــزی لێ بگــیرێ‌و، نابــێ کەس بچەوسێندرێتەوەو، نابێ کەس بەبێ بەڵگــە بخرێــتە زیــندان (ســجن)ەوەو نارەحەت بکرێ‌و، نابێ کەس هێمنی‌و ئاسایشــی مــاڵ‌و حــاڵی بشــێوێندرێت‌و ، هــیچ ئینســانێك نابــێ ســتەمی چــینایەتی‌و ســتەمی نەتــەوەیی..هــتد لێ بکرێ، ئەوشتانە هەمووی شتی باشــن‌و وە شــەریعەتەکانی خــوای پــەوەردگاریش هەر بۆ چەسپاندنی ئەوانە وهێندێك شتی‌تر هاتوە.

بــەڵام ئەو چەند تێبینی‌یانەشمان هەیە لەسەر تێروانینی ڕۆژئاوایی‌یانە بۆ مافەکانی‌مرۆڤ:

١- هەرکاتــێك بــاس لەوشــەی ماف (حق) دەکرێت، یەکسەر ئەوە بەسەر زەیــن دا دێــت کەلەســەر چ بــناغەیەکەو بەڵگەو بناغەی ئەو مافە چی‌یە؟! هەرکەســێك گوتــی: حــەقم هەیــە، خەڵك پێی دەڵێن: بەڵگەت چی‌یە؟ هەر کەسێك داوای حەقی لەکەسێك کرد، پێی دەڵێن: لەسەر چ بناغەیەك؟

بەڵام (جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ) کەداواکردنی مافەکانی مرۆڤە بەتیگەیشــتنێکی ڕۆژئاوایی‌یانــەو ئەورووپی‌یانەیــەو هــیچ بــناغەیەکی دانــەناوەو، هــیچ بەڵگەیەکی نەهێناوەتەوە کەبۆچی ئینسان دەبێ مافەکانی پارێــزراو بــن؟ بۆچــی دەبــێ ئینســان حــەقی ژیــان‌و حــەقی ســەربەخۆیی‌و حەقی‌موڵکایــەتی‌و حــەقی‌ماڵ پــێکەوەنان‌و حەقی‌ڕێزلیــنان‌هــتدی هــەبێ؟

لەســەر چ بناغـەیەك؟ واتە: داواكە هیچ بەڵگەیەكی لەپشتەوە نیە! كە ئەمە خاڵێكی لاوازە لەو جۆرە تێگەیشتنەدا بۆ مافەكانیمرۆڤ .

٢- داواكـردنی خـەڵكی رۆژئـاوا بۆمافەكانیمـرۆڤ، كردار (فعل) نەبووە، بـەڵكو كاردانــەوە (رد فعـل) بووە وەئەگەر لە (جاڕنامەی گەردوونیمافی مــرۆڤ) وردبینەوە، لەپێشەكی (دیباجة)یەكەیدا زۆر بەزەقی هەست دەكەین كەئەوە قەناعـەتیخەڵكی رۆژئاوا نەبووە بەگەورەییو رێزو حورمـەتی ئینسان كـەداوای مــافی بـۆ بكـەن، بـەڵكو چەندشـتێكیدیكە بـووە!!، لەپێشەكی (جاڕنامــە)كـەدا هـاتوە، دەڵـێ: (لەبــەر ئەوەی دان پێداهێنانی كەرامـەتو مافیمــرۆڤ بــناغەی ئــازادییو ئاشــتیو دادگەرییــە، وە لەبــەر ئــەوەی گوێپێــنەدانی رێزگــرتن لەئینســان لەرابــردوودا بۆتە مایەی كێشەو ئاژاوەو گرفـتاریی، وە بۆ ئەوەی رێگە بگرین لە دووبارە بوونەوەی ئەو حاڵەتانە، وە بـۆ ئــەوەی دۆســتایەتی لەنــێوان دەوڵەتان دا بەرقەراربێ، پێویستە ئینسان رێزیلێ بگیرێو مافەكانی بۆ دابین بكرێت).

كەواتــە ئەگــەر لــێی وردبیــنەوە داواكـردنی (جاڕنامــەی گەردوونی بۆ مافیمـرۆڤ) هیچی پەیوەندیی بەوەوە نیە كەئینسان لەخودیخۆیدا خاوەنی رێـزەو خـاوەنی پایــەو حورمـەتــە، بۆیــە پێویســتەمافەكانیبۆ دابین بكەین، بــەڵكو دەڵــێ بـۆ ئــەوەی رێگـا لەئاشـووبو ئاژاوەبگیرێو بۆ ئەوەی شەڕو كوشـتار دروسـت نەبێــتەوە-كـە ئامــاژە دەكـات بەجەنگی جیهانی یەكەمو دووەم- بـۆ ئــەوەی كەدەوڵــەتان ئاشـتیو تەبایییان لەنێوان دا بەرقەراربێ، بۆیە پێویستە ئینسان رێزی لێ بگیرێو مافەكانی بۆ دابین بكرێن!!

واتــە: رێزگــرتن لــە ئینسانو دابین كردنی مافەكانی نەكراوە بەئامانجو بــەڵكو شــتێكی دیكــە ئامانجــەو رێزگرتن لە مرۆڤو دابین كردنی مافەكانی كــراوەتە وەســیلە كــە بــێگومان ئــەوە لەگــەڵ رێزو حورمـەتو لەگەڵ پایەو

مەقامـێك دا كەلە ئینسان دەوەشێتەوە، شایستە نیەو پێویستە دابین كردنی مافەكانو ڕێزگرتنیمرۆڤ ئامانج بن.

٣- لەجارنامەی گەردوونیمافی مرۆڤدا باسی مرۆڤە ماف پێشێكراوەكانو مـرۆڤە مـاف پێشـێل كـەرەكان نەكـراوەو لـێك جیانەكراونەوە، هەر دەڵێ: مـرۆڤەكان ئـاواو ئـاوابن..، بـەڵام دەبـێ ئەوانەیكەبـەدرێژایی مـێژوو مافیمرۆڤەكانی سەر زەوییان پێشێل كردووە، چ وەك تاك، چ وەك كۆمەڵ، چ لـەڕووی ئـابووریی یەوە مافیان پێشێل كردوون، چ لەڕووی سیاسیەوە، چ لـەڕووی نەتەوەییـەوە، چ لەڕووی ڕەنگو ڕەگەزو زمانەوە، دەبێ لەیەكیان جـیا بكەیـنەوە،كە لـە ئیسـلامدا زۆر بـەڕوونی ئەوانـە هـەموو نوختـەی تێداخراوەتە سەرپیت.

٤- هـیچ بـناغەو مەرجەعـێك دیـاری نەكراوە بۆ دیاری كردنیمافەكانی مـرۆڤ ئایـا كێ مافەكانیمرۆڤ دیاری دەكات؟ ئایا بەسەرنج دان لە سروشت (طبـیعة)ی مرۆڤ، یان بەسەرنج دان لەغەریزەكان، یان فەلسەفە یان دین یان جـەماوەر، یـان عـورفو عـادەتو بـەكام لـەو پـێوەرانە ئـەو مافانـە دیاریكـراون؟!، یـانی چ مەرجەعێكو چ بناغەو سەرچاوەیەك هەیە كە ئێمە مافەكانیمـرۆڤی لێوە هەڵبهێنجین؟! چونكە هەركاتێك خەڵكێك كۆببێتەوە بڵـێن ئـێمە داوای مافەكانیمرۆڤ دەكەین، پێیان دەگوترێ: كێ ئەو حەقەی پێداونو لەسەر چ بناغەیەك؟!

٥- زۆربـەی هەرەزۆری بڕگەكای (جارنامەكە)، وەك پێشتریش باسمان كرد، شـتی جـوانو دڵگـیرن، بەڵام میكانیزمی جێبەجێ كردنیان دیاری نەكراوە، هەربۆیـەش وڵاتـانی بلووكی ڕۆژهەڵات ووڵاتە سۆسیالیستییەكان، لە پێش هـەموویان یەكێـتی سۆڤیەتی پێشوو، زۆر (تحفـظ)یان دەكرد لە ئیمزاكردنی (جارنامـەی گەردوونیمافـەكانی مـرۆڤ)و ئـەو (وثیقة)انەی كەدوایی كرانە پاشـكۆی، قسەكەشـیان بـەجێ بـوو، دەیـانگوت: ڕۆژئـاوا-سیسـتەمی

کاپیتالیستی سەرمایەداری- داوا دەکات کە ئینسانەکان ڕێزیان لێ بگیرێو مافەکانیان دابین بکرێن، بەڵام سودی چیە (وثیقة)یەك بنووسرێو بڵاو بکرێتەوە کە دەبێ ڕێز لە ئینسان بگیرێ، بەڵام چینی سەرمایەدارو بورجواز دەست بنێنە قورقوڕاگەی خەڵکەوەو لەڕێی چەوساندنەوەی ئابووریو چەوساندنەوەی سیاسیو چەواشەکردنی ڕاگەیاندن (اعلامی)وە، کە چینایەتیو قڕیو پڕی هەبێ، چەوساندنەوە هەبێ؟! باهەر باسی مافی مرۆڤ بکرێ، چونکە بەتەئکید وەك کوردەواری خۆمان دەڵێن: (بەحەڵوا حەڵوا دەم شیرین نابێ).

٦- بڕگەکانی (جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ) ئاماجی باش باشی تێدانو دڵگیرن-جگە لە چەند دانەیەکیان-، بەڵام پشتیوان (ضمانة)یان بۆ دانەنراوەو سەنەدێکیان لەپشتەوە نیە، کەوایان لێبکات لەسەر دونیای واقیع بەرجەستە بنو پراکتیزە بن.

وە بەتایبەتیش دوای ئەوەی کەپێنج (٥) دەوڵەتی هەمیشە ئەندام لە ئەنجوومەنی ئاسایش (مجلس الامن)دا، واتە: ئەمەریکا، ڕوسیای ئێستا-یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو-، چین، فەڕەنسا، بەریتانیا، کەئەوانە چونکە (جەنگی جیهانیدووەم)یان بردبۆوە، ئەو مافەیان بەخۆیاندا کە لە (ئەنجوومەنی ئاسایش)دا ئەندامی هەمیشەیی بن، هەڵبەتە (ئەنجوومەنی ئاسایش) لەپانزە)١٥) ئەندام پێك دێت، غەیری ئەو (٥) ئەندامەی (١٠) یەکەی دیکە بەشێوەیەکی دەوری هەڵدەبژێردرێن، بەس ئەو پێنجە هەر لەشوێنیخۆیانن، وەمافی (ڤیتۆ)یشیان هەیە، (ڤیتۆ) واتە هەڵوەشاندنەوەی بڕیار، کە ئەمەریکا تا ئێستا حەفتاو پێنج (٧٥) جار زیاتریش مافی (ڤیتۆ) ی بەکارهێناوەو، هەر بڕیارێك عەقڵی نەیگرێ ڕەخنەی لێ دەگرێو، بڕیارەکە سەرناگرێ، بەتایبەتی ئەو بڕیارانەی کە زەرەریان هەیە بۆ جوولەکە (إسرائیل)، هەروەها هەر بڕیارێك کەزیانیهەبێ بۆ

بەرژەوەندی‌یەکانی ئەمەریکا، خۆتان ئاگادارن چەندبڕیار دران دەربارەی کەم کـردنەوەی چـەکی ڕۆکێـتی بالیسـتی‌و دەربارەی کەم کردنەوەی بەرهەمی ئەوکارگانـەی کـە دووکـەڵی زۆریان لێ بەرز دەبێتەوەو ژینگە پیس دەکەن‌و (طـەبەقـەی ئـۆزۆن) کـون دەکەن، ئەمەریکا بەو حەقەی پێی دراوە، یاخود بـەخۆیان داوە حـەقی (ڤیـتۆ)ی بەکارهێناوەو پابەندی هیچ کام لەو بڕیارانە نـەبووەو لەسـەر پیس کردنی ژینگەو لەسەر ئەو بڕیارانەی کەلە بەرژەوەندی خـۆی دایـە هـەر بـەردەوام بـووە، هـەروەها بەریتانـیاو ڕوسـیاو فەڕەنساو چینیش، هەرکامێکیان کەم‌و زۆر ئەو هەڵوێستەیان هەبووە.

٧- (جاڕنامــەی گـەردوونی مافەکانی مرۆڤ)، ناوەکەی زۆر گەورەیە، بەڵام ئـەو نیشـانەی پرسسیارەی دێتەسەر کەئایا ئەو (جاڕنامە)یە حەقی خۆیەتی ئەو ناوەگەورەیەی لێبنرێ؟! وە ئایا نوێنەرانی هەموو بەشەریەت، نوێنەرانی هــەموو جـیهان چـوون دابنیشـن‌و ئەو (وثیقة) سی(٣٠) بڕگەیی‌یەو ئەوانی دیکـەش ئـیمزا بکـەن؟! یـاخود هـەر ڕۆژئاوایی‌یەکان بوون؟! ئاشکرایە کە جـیهانی ئیسـلامیی مەگـەر ئـەوەی دوایی وەك پاشکۆیەك چووبێت‌و خۆی رەگـەڵ دابێت ئەگەر نا بێ ئاگا بوونەو هیچ حیسابیان بۆ نەکراوە! هەروەها بلووکی ڕۆژهەڵات بەگشتی (تحفظ)یان لە بارەیەوە کردووە.

کەواتە لەراستی‌دا اناوەکەی زۆر لەنێوەڕۆکەکەی گەورەترە، وەك یـەکێك لەنووسـەرە ئیسـلامی‌یەکان گوتوویـەتی‌و جوانیشـی گوتوە، دەڵێ: ئەگەر لەجـیاتی (جاڕنامـەی گـەردوونی مافەکانی‌مـرۆڤ/ الاعـلان العـالمی لحقوق الانسـان) نـاوی لێبـنرایە: (جاڕنامـەی ئـەوروپی بـۆ مـافی هـەندێك لـە مـرۆڤەکان/ الاعـلان الاوروبـی لحقـوق بعـض الناس) ئەوە بەڕاستی ناوەکە راستتر بوو، وە ناوەکە زیاتر لەگەڵ نێوەڕۆکەکەی‌دایەکی دەگرتەوە!

ئـەوە تێبینـی‌یەکانمان بـوون لەسـەر چـۆنیەتی تێڕوانیـنی ئەوروپا بۆ مافـەکانی مـرۆڤ، بۆیە من ئامۆژگاریی هەموو خوشك‌و برایەکی مسوڵمان

دەکـەم، کـە بەڕاسـتی هـەر لـەڕێوە نەکەویـنە ژێـر کاریگەریی ئەو دروشم (شـعار)انەی‌کە بریقەدارو جوانن‌و سەرنج ڕاکێشن‌و بەرز دەکرێنەوە، بۆ وێنە کـە باسـی جـیهانگیری (عولمـه)، یان دیموکراسی، دەکرێت، هەر یەکسەر با تەسـلیم نەبین، بەڵکو لێی وردبینەوە، خوای پەنهان بێ دەفەرموێ:﴿وَلا تَقْفُ مَـا لَـيْسَ لَـكَ بِـهِ عِلْـمٌ﴾(الاسـراء: مـن الآيـة٣٦)، واتـە: (شتێك زانیاریت دەرەبـارەی نـیە شـوێنی مەکـەوە)، وجـوان جـوان لێی وردبەوەو تێی بگە، جائەوجار بڕیاری خۆتی لەسەر بدە.

زانایـانی ئیسـلامیش (قـاعدة)یەکی جوانیان داناوە، کە دەڵێ: (الحكم عـلى الشيء فرع عن تصوره) واتە: حوکم دان بەسەر شتێکدا بەرهەمی لێ تێگەیشـتنیەتی، واتـە: ئەگـەر لـێی تێنەگەی‌و نەیناسی، بۆت نیە بڕیاری دەربارە بدەی، چونکە هەر بڕیارێك بدەی لەسەر بنچینەی جەهل‌و نائاشنایی دەیـدەی، بەتەئکـید بڕیارێکـیش لەسـەر بـناغەی ناشارەزایی بێت بەهەڵە دەردەچێت‌و بناغەی خوار هەر دیواری لاری لەسەر هەڵدەچنرێ!

## بەشی دووەم: مرۆڤو ئەرك و مافەكانی لەئیسلام دا

لەبەشـی یەكـەمدا باسمانكـرد كـە لەڕوانگـەی ڕۆژئـاواوە داواكـردنی مافەكانیمـرۆڤ چـۆن هـاتوە، وەتێبینـیو سەرنجەكانی خۆیشمان لەو بارەوە خستەڕوو، ئێستاش با بـزانین لەشـەریعەتی بـێ هەڵـەو پەڵـەی خـوای پـەروەردگاردا، مـرۆڤ چـۆن تەماشـایكراوە؟ وە ئـەركو مافەكانیشی چۆن دیاری كراون؟!

تێبینـی بكەن من وشەی (ئەرك)یشم زیاد كردووە، چونكە لەڕاستی دا لـە ئیسـلامدا هـەموو ئەوانـەی كەپێیان دەگوترێ مافەكان (الحقوق)، پێش ئەوەی ماف بن، ئەركن، وە ئەركیش پابەندی (التزام)ی تێدایە، بەڵام ماف (حـق) داواكردنیتـێدایە، ئاشكراشـە كـە (الـتزام) بەهـێزترە، چـونكە لەوحاڵەتـەدا دەبـێ شـتێك هـەبێ وا لەئینسـان بكات كە مافی خەڵكی تر دابـین بكـات، واتـە ئـەركی سەرشـانیەتی، وەئینسـانەكە خۆیشـی ئەركی سەرشـانیەتی ئـەو مافـە داوا بكات، وەك دوایی باسی دەكەین ئەم بەشەش لەدو خاڵ دا دەخەینەڕوو:

### یەكەم:- بنەماكانی ئەرك و مافەكانی مرۆڤ لەئیسلام

وەك باسمـان كـرد یەكـێك لـە كەموكوڕیـیەكانی تێڕوانیـنی ئـەوروپیو ڕۆژئاواییـیەكان بـۆ مافەكانیمـرۆڤ ئەوەیـە كەهـیچ بناغەیەكی فەلسەفی ڕوونو ئاشـكرای نەبوو، بەڵام لەئیسلامدا وانیە، لەئیسلامدامافەكانیمرۆڤ وەك چـەوەندەرێك لەو گۆڕە هەڵنەقەندراون!، وەلەئیسلامدامافەكانیئینسان وەك ئاڵقەیـەكی پچـڕاو لـەزنجیرێك نـینو، وەك ئەنجامـێكیبێ پێشەكی نین، بـەڵكو لەئیسلامدا پێش ئەوەی باسی مافی مرۆڤ بكرێت چەند شتێكی تر هەیـە، ئیـنجا مـافی مرۆڤ وەك ئەنجامێكی مەنتیقیو سروشتی خۆی فەرز

دەكات.

جا ئێستا با سەرنج بدەین داخۆ:

لەسەر چ بناغەیەك ئیسلام مافەكانیمرۆڤ بنیات دەنێ؟ بناغەی دیواری مافەكانی مرۆڤو سەرچاوەی هەڵقوڵینیان بریتیە لەوە كە ئینسانو ژیانو بوونەوەر، خاوەنێكیان هەیە، كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (دنیا شاری بێ ساحێب نیە) جاخاوەنی ئینسانو ژیانو بوونەوەر، ئەركەكانی ئینسانو مافەكانی ئینسانو ڕێزو كەرامەتی و پایەو مەقامی ئینسان، دیاری دەكات.

كەواتە: دەتوانین بناغەو سەرچاوەی مافەكانیمرۆڤ لەشەریعەتی خوای دادگەردا ببەینەوە سەر دوو ریشەی گرنگ: ١- پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی خوا، خاوەندارێتی خوا بۆ بوونەوەر، ٢- بەندایەتی ئینسان بۆ خواو ڕێز لێگیراوێتی ئینسان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

ئاشكراشە كە ئەم دوو ڕیشە گرنگە بناغەیمافەكانیمرۆڤ لەئیسلامدا پێك دێنن تایبەتن بەئیسلامەوەو لەهیچ بەرنامەو ڕێبازێكی دیكەدا نایەنە بەرچاو بەڵام ئیمتیازو تایبەتمەندیی ئیسلام هەر ئەوەندە نیەو تایبەتمەندیەكی گرنگی دیكەی ئەوەیە كەئیسلام نەهاتوە مافەكانیمرۆڤ تەنها وەك دروشمێكی جوان بخاتەڕوو،بەڵكو لەئیسلامدا گرنگ ئەوەیە قسەو دروشم بەكردەوە تەرجەمە بكرێو لەمەیدانی واقیع د ا بچەسپێنرێو بكرێ بەركردەوە (عمل) ئەوجار بۆ خەڵك شتێكی لێ هەڵدەوەرێو خەڵك لێی بەهەرەمەند دەبن.

بۆیە ئیسلام هاوكات لەگەڵ داكۆكی كردن لەسەر ڕێزو حورمەتی ئینسانو دابین كردنو پاراستنی مافەكانی، فەرمان بەمسوڵمانانیش دەكات كە زەمینەیەك بسازێننو كەشو هەوایەك بخەملێننو ئامادە بكەن كە ئینسانی تێدا ڕێزلێگیراو بێو مافەكانی تێدا دابین كراو بن، دیارە هەر

لێرەشــدا یەکـێك لــە حــیکمەتەکانی هــەبوونی دەوڵــەت لەئیســلامدا دەردەکـەوێ، هـەندێك کـەس دەڵـێن: دیــن سیاسـەتو دەوڵەتی بۆ چیـیە، دیــن[٥٩] حوکـمو دەسـتەڵاتی بـۆ چیـیە؟! لەوەڵامیدا دەڵێین: دین دەوڵەتو سیاسـەتو حوکمڕانیی بۆ ئەوەیە کەشو هەوایەك بسازێ، ئینسان بەڕاستی تێـیدابەندەی خوابێو ئینسانەکان هەندێکیان هەندێکیان نەپەرستنو ئینسان کۆیلـەو خـزمەتکاری کـەس نـەبێ، ئینسـانەکان پـێکەوە برابن ، یان برای دیـنیبن، یـان بـرای ژیـنی بـن، یان لەسەر بناغەی دین پێکەوەبرا بن، یان لەبەر بەڕێکردنی ژین پێکەوە تەبا بن.

واتــە ئیسـلام بەشـێوەیەکی واقـیع بیـنانە تەماشـای مافەکانی مرۆڤ دەکـات، بەشێوەیەکی وا کەکەشو هەوا یەك بسازێنێ، کەئینسان بەکردەوە (فعلـی) بـتوانێ مافـەکانی تێداوەدەسـت بهێـنێ، بۆیـە مەسەلەی فەرمان بەچـاکەو نـەهی لەخراپە، مەسەلەی پێکهێنانیدەوڵەتو حوکمو سیاسەت، مەسـەلەی کەمسـوڵمان دەبـێ کـیانو قەوارەیـەکـیان هـەبێ مەسـەلەیەکە پەیوەسـتە بەعەقـیدەو ئـیمانەوە، یەکسەر پەیوەستە بە (لا إله الا الله)وە، جگەلــە (الله) پەرسـتراوێکی دیکـە نیە، کەواتە ئەو پەرستراوە پەروەردگارو خـاوەنی بوونـەوەرە، دەبێ حەڵاڵو حەڕام بۆ بەندەکانیدیاری بکاتو ڕێگەو شوێنیان بۆ دیاری بکاتو چاکەو خراپەیان پێشان بداتو ئەرکو مافەکانیان بۆ دەست نیشان بکات.

چـونکە ئیسـپات بووە: (چەوساندنەوەی نێو خۆو دەستدرێژیی دەرەکی/ الاسـتبداد الداخلـی والعـدوان الخـارجی) گەورەتـرین ئاسـتەنگن لــەڕێی مافەکانیمـرۆڤدا، تەماشـای مـیللەتی کـوردی خۆمـان بکەین، کاتێك کە

---

٥٩) لێرەداوشەی (دین)مان بەمانای باوو عورفییەکەی نێو مسولمانان بەکارهێناوە، کە بریتیەلە (ئیسلام).

ڕژێمـی بـەعس سـێبەری شـوومی بەسـەر سەری میللەتی ئێمەوە بوو، یان لەشوێنانی‌تر کەمیللەتی ئێمە بەعاستەم هەر لێی دەسەلمێندرێ کەهەیە[٦٠]، ئایـا لەشـوێنێکدا کـە ئینسـان دان بـەبوونی‌دا نەهێـنرێو دان بـەمافی دا دەهێـندرێ! لەشـوێنێك دا کەجارێ (کورد)ەکە هەر بەگەلو نەتەوە حیساب نەکـراوەو هـەر بەهاووڵاتی دانەندراوە، ئایا دان بەمافەکانی‌دا دەهێندرێ؟!! بەتەئکید نەخێر.

لەڕوانگـەی ئیسـلامەوە بـۆ دابـین کـرانی مافـەکان مرۆڤ دەبێ کیانو قەوارەیـەك پـێك بهێندرێ کە چەوساندنەوەی نێو خۆ (الاستبداد الداخلی)ی تـێدا نەبێ ورێگەش لەدەستدرێژی دەرەکی بگرێ (العدوان الخـارجی)، ئینجا مافەکانی‌مرۆڤ دەڕسقێن و وهەراش دەبن‌و دەبنە درەختو بەر دەگرن.

ئەگـەر یەکـێك بپرسێ: بۆ لەقورئان‌و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ زاراوەی مـافی مـرۆڤ، (حـق الانسـان)، کـەمتر دەکەوێـتە بەرچاو؟! کە ئەوە وایەو لـەقورئاندا، وە لەسـوننەتەدا زاراوەو وشـەی (مافی‌مـرۆڤ/ حـق الانسـان) بەشـێوەیەکی زەق ناکەوێـتـە بەرچاو، هەرچەندە بەشێوەی (تفصیلی) هەیە، وەك : حـەقی خـوا لەسـەر بـەندەکانی‌و ، حـەقی بـەندەکان لەسـەر خواو، حەقی‌ئینسـان لەسـەر برای مسوڵمان‌و، حەقی (راعي) لەسەر (رعیة) حەقی مـیللەت لەسـەر حوکمـڕان‌وهـتد، بـەڵام وشـەی (مـافی مـرۆڤ/ حـق الانسـان)باس نەکراوە، هەرچەندە بەگشتی دەقەکانی قورئان‌و سوننەت ئەوە دەگەیـەنن، بـەڵام وەك زاراوەیـەك کـەمتر بەکارهێنراوە ئەوەش لەبەر چەند هۆکارێك لەوانە:

---

٦٠) مەبەست تورکیایە کەهەتا ئەم ساڵانەی دوایی دانی پێدانەدەهێنا کەگەلێك هەیە بەناوی (کورد)؟!

یـەك: مـافی مرۆڤـوەك پێشتر باسمان کرد- دەبێ بناغەیەکی هەبێ لەسەری بنیات بنرێ، مرۆڤ بۆچی دەبێ‌مافی هەبێ؟! بۆچی دەبێ نەچەوسێندرێتەوە؟ بۆچی دەبێ ڕێگای‌عەقیدەو بیروباوەڕی لێ نەگیرێ‌و لەو ڕووەوە ئازاد بێ؟! بۆچـی دەبـێ ڕێگـای دەربڕیـنی لێ نـەگیرێ؟! بۆچـی دەبـێ ئازادیی‌یـە شەخسی‌یەکانی بۆ دابین بکرێن‌و لەبەرچی؟!

ئیسـلام دانی‌بـەو بـناغەیەدا هێـناوە، کـە بریتـیە لەڕێـز لێ گیران‌و کەڕامـەتی ئینسـان (کرامە الإنسان)، وە ئەوە کە ئینسان خوای بەدیهێنەر بەتایـبەت خولقاندوویـەتی‌و بەجێنشـین (خلـیفة)ی خـۆی‌و بـۆ بەندایـەتی کـردنی‌خۆی خولّقاندوویەتی، نەك بۆ کۆیلایەتی‌و خزمەتکارێتی طاغووت‌و دیکـتاتۆرەکان، بۆیـە بـۆ هـیچ کـەس نـیە نەبەناوی سیاسەتەوە، نەبەناوی دیـنەوە، نـە بـەناوی دنـیاوە، بـەندەکانی خـوا ژێر دەست‌و زەبوون‌و زەلیل بکـات، لـەو بـارەوە قسـەیەکی نـاوداری (عومەر) خوا لێی ڕازی بێ‌هەیە، کەبـە (عەمری کوڕی عاص‌و کوڕەکەی)گوت، عەمری کوڕی عاص خوا لێی ڕازی بـێ (والی)ی مسولّمانان بوو لە (مصر)، کوڕەکەی عەمر لەگەلّ کوڕی کابرایەکی (قـبطي)دا پێشبڕکێی ئەسپیان دەکرد، ئەسپی کوڕە (قبطي)یەکە پـێش ئەسـپی کورەکەی عەمر کەوتەوە، ئەویش دایگرت‌و هێنایە خوارەوەو دایـە بەرقەمچـی‌و پێی گوت: (خذها وانا إبن الأکرمین) واتە بیگرە، نازانی مـن کـوڕی دوو ئینسـانە بەڕێـزەکانم، کوڕی دایك‌و باوکی خۆمم، کەباوکم عەمـری کـوڕی عـاص (والی)ی (مصر)ەو دایکیشم فلاّن ئافەرەتەیە، تۆش کابـرایەکی (قـبطي)[61]ی، چـۆن بـۆت هەیـە ئەسـپی تۆ پێش ئەسپی من بکەوێـتەوە؟! دیارە کوڕە (قبطي)یەکە دەزانێ کە ڕۆژگار ڕۆژگاری خەلیفەی دادگـەری ئیسـلام عومـەری کـوڕی خـەطابـە، بۆیە لەمیصرەوە دەچێ بۆ

---

٦١) (قبطي) واتە: نەصرانی

مەدیـنە، بـەڵێ دەبێئینسان ئاوا لەسەر مافی خۆی بەدەنگ بێ، زانیویەتی حوکمـێك هەیـە کـە ئیسلامە حەقی ئەو قەمچی‌یانەی بۆ دەستێنێ، دەچێ سـکاڵای خـۆی دەباتــە لای ئـیمام عومەر، عومەر خوا لێی رازی بێ نامە دەنـێرێو دەڵـێ: عەمـری کـوڕی عاص خۆتو کوڕەکەت وەرن بۆ لام ئەو قەمچـی‌یەش کەپێـتان لـەو کـوڕە (قـبطي)یـە داوە لەگەڵ خۆتانی بهێنن، یەکســەر دێــنو دادگایی‌یـان دەکات، دیارە شتەکەی لەسەر ئیسپات دەبێ، دەڵـێ: قەمچـی‌یەکە بـدە دەسـت ئـەو کـوڕە(قـبطي)یە، ئەویش لەدەستی وەردەگـرێ، جاعومەر پێی دەڵێ، کوڕ عەمر چەند قەمچی لێداوی هێندەی لێـبدەوەو چـۆنی لـێداوی ئـاوای لێـبدەوە، ئیدی کوڕە قبطی‌یەکە کوڕەکەی (والـی) میصـر دەداتــە بەر قامچی بەو شێوەی کە لێی دراوە، دوای ئەوەی کەتــەواو دەبـێ، عومـەر دەفـەرموێ: (أدرهـا عـلى صـلعة عمـرو) واتــە: قەمچـی‌یەکە وەربسووڕێنە بۆ سەریعەمری باوکیشی، عەمری کوڕی عاص یەکـێك بـووە لەهاوەڵـە بەڕێـزەکانو (والـی)ی میصـریش بووە، لەوکاتەدا هـاوەڵان (اصحاب) خوا لێیان رازی بێ دەکەونە نێوانو دەڵێن: ئەی گەورەی ئــیمانداران، خــۆ بــاوکی لــێی نــەداوە، کوڕەکــەی لــێی داوە! کــوڕە (قـبطي)یەکـەش دەڵـێ گـەورەی ئیمانداران هەقم بەسەربابیەوە نیە چونکە حـەقی خـۆم سـتاندۆتەوە، عومەر دەفەرموێ، نەء، بەپشتو پەناو قووەتی بـابی لـەتۆی داوە،لـێی بـدە لەسـەری بابیشـی، دوایـی هـاوەڵان دەکەونە شەفاعەتو تکاو ڕەجاوبەهەر حاڵ عەمر ڕزگاری دەبێ.

جـا عومــەری کـوڕی خەطاب لەو مەقامەدا ئەو ڕستە ناوداره-کەدەبێ بەزێـر بنووسـرێت- دەفـەرموێ: (متى إستعبدتم الناس وقد ولدتهم مهاتهم أحـراراً)، واتــە لەکەیـەوە خەڵکتان کردووە بە کۆیلە، خۆ بەئازادی لە دایك بوون؟!

کەواتــە ئینســان بەڕێـزە، ئـازادە، خوا ئینسانی بەئازادانە خولقاندوە،

بۆیـه دەبـێ مافـەکانی بۆ دابین بکرێن، ئیسلام باسی ڕێزی ئینسان، ئازادی ئینسـان، بەندایەتـیی ئینسـان، بـۆ خوا دەکات، بۆیە زۆر داکۆکی نەکراوە لەسـەر مـاف، وەختـێك ئینسـان ڕێـز لـێگیراوو حیسـاب بـۆ کـراو بـوو، مافەکانیشی دابین دەکرێن.

دوو: لـە ئیسـلامدا مافـەکانو ئەرکـەکان وەك دروشـمو شیعارێکی گشتی نەخـراونەڕوو، بـەڵکو وەك شـتێکی تەفصـیلی، وە بەوردی دیاری کراون بۆ ئـەوەی بگونجـێ بەکـردەوە جێبـەجێ بکـرێن، نەك تەنها دروشمی بریقەدارو قسـەی خـۆشو بـۆش بـن و دروشمـێکی گشتی بنو خەڵك هەڵبخەڵەتێننو چەواشە بکەن.

جـا لەشـەریعەتی ئیسـلامیی‌دا بـە وردیـیو بەڕوونی هاتووە کەمافی حوکمـڕان بەسـەر مـیللەتەوە چیيە؟ وەمافی میللەتیش بەسەر حوکمڕانەوە چـیيە؟!، مـافی ژن بەسـەر مێردیيەوە چیيە؟ مافیمێردیش بەسەر ژنەوە چـیيە، و مـافی دایـكو بـاوك بەسـەر ڕۆڵەکانـیانەوەو، مافی ڕۆڵە بەسەر دایـكو باوکـیانەوە، وە مـافی دراوسێ بەسەر دراوسێ، مافی میوان بەسەر خـاوەن مـاڵ چـیيە؟ وەهەروەها تاکۆتایی، واتە: هەرکام لەو ئەركو مافانە بـەدرێژیی (تفصـیل) بـاس کـراوە، نەك وەك دروشمێکی گشتی باس بکرێ، بـەڵام نەزانـرێ چۆن جێبەجێ بکرێ! بەوردی لەدەقەکانی قورئانو سوننەتدا باس کراوە کەمافی فلان لەسەر فلان ئاوایە دەبێ ئاواش جێ بەجێ بکرێ.

سـێ: ئـەوەی لـەرۆژئاوادا مـاف (حـق)ی پی دەگوترێ، لە ئیسلامدا ئەرك (وظـیفة)ی پێ دەگوترێ، ئەوەش حیکمەتێکی زۆر گەورەی تێدایە، چونکە کاتـێك ئینسـان مافـێکی هەبێ، ڕەنگە هەرکات بەربەستێکی بێتە پێشو هەڕەشـەیەکی لێ بکـرێ، لەئـەنجام دا بڵـێ: کاکـە مافەکـەم نـاوێو سـەر

سەلامەت بێ حاشا لەو غەنیمەتە!!!

بـەڵام کاتـێك ئەرکـێکی لەسەر شان بێ لەترسی سزاو جەزرەبەی خوای پـەروەردگار ناچارە بەدوای جێبەجێ کردنی ئەو ئەرك‌و واجبەی سەرشانی‌دا بـڕوا، بـەڵێ لەئیسـلام دا ئـەوەی کـە ئـەورووپی‌و ڕۆژئاوایی‌یـەکان بەماف (حـق)ی دادەنـێن ئیسلام بەئەرك (وظیفة)ی دادەنێ با تەماشا بکەین چۆن‌و بـەچ شـێوەیەك بـۆ وێـنە: خـوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْـتَدُوا عَلَـيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ ﴾(البقرة: من الآية١٩٤). واتـە: هەرکەسـێك دەسـتدرێژیی کردنەسـەر، وەك دەسـتدرێژی‌یەکەی دەستدرێژیی بکەنە سەرو بەرپەرچی بدەنەوە.

واتـە ئەگـەر نیشتمانی‌داگیرکردی، دەری بکە، ئەگەر ماڵی داگیر کردی لـێی بسـتێنەوە، ئەگـەر قسـەی پـێ گوتـی، قسـەی پـێ بڵـێوە، هەڵبەتە دەشـتوانی لەهەندێك حاڵەتدا چاوپۆشیی لێ بکەی، ئەگەر ویستی بتکوژێ، مەهـێڵە بتکوژێ‌و تۆ بیکوژە، وەك پێغەمبەر ﷺ دیفاع لەخۆکردنی کردووە بـە ئەرکـێکی شـەرعیی، وەپایـەو مەقامـێکی بەرزیشی داناوە بۆ کەسێك کـەدیفاع لەحـەقی خۆی دەکات وەك ئەرکێکی‌شەرعی، دەفەرموێ: (( من قـتل دون مظلمـته فهـو شهيد)) رواه النسائي وصححة الالباني، واتە: هەرکەسـێك لەسەر دیفاع کردن لەمەزڵوومیەتی خۆی‌و لەسەر ستەم دیدەیی خۆی بکوژرێ شەهیدە.

جـا زوڵمـی نەتەوەییت لێ بکرێ، زوڵمی ئابووریی، سیاسی، شەخصی لەڕووی ئابروو و کەرامەت‌و نامووسەوە، لەهەر ڕوویێکەوە زوڵمت لێ بکرێ‌و دسـتدرێژیت بکرێتەسەر بەرگری لەخۆت بکەی‌و لەو بەرگریی‌یەدا بکوژرێی، بە مردنێکی‌شەریفانە مردوویی‌و پلەی (شەهیدی)ت هەیە.

لـە فەرموودەیـەکی دیکـەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ( من قتل دون مالـه فهـو شهيد) رواه البخاري، واتە: هەرکەسێك لەسەر ماڵ‌و سامانی

خۆی بکوژرێ شەهیدە.

زانایـانی ئیسلام باسیان لەوە کردووە، کە ئەگەر کەسێك یەك دینار بە زوڵـم لـەتۆ بستێنێ، ئایا وا باشە دینارەکەی بدەیتێو لە کۆڵت بێتەوە، یان نەیدەیـەو دیفاع لەخۆت بکەی؟ لەوەڵامدا زۆربەیان دەڵێن: واباشە نەهێڵیو دیفاع لەو دینارە بکەی،پاشان گوتراوە: ئەگەر نەهێڵێ چۆن نەهێڵی؟ دەڵێن: سـەرەتا بەهەڕەشـە کـردن، ئەگەر بەهەڕەشە لێت دوور کەوتەوە ئەوە باشە، ئەگەرنا  هەوڵ بدەی بریندارى بکەی، ئەگەر بەوەش هەر وازی لێ نەهێنای، دەتوانـی بیکوژی، خوێنەکەشی بەخۆڕایی (هدر) دەڕواو تۆڵە (قصاص)یشی نـیە، ئـەو بەهـیلاك دەچـێو تۆش پاداشتت هەیە، چونکە دیفاعت لەماڵی خۆت کردووە.

هـەروەها پێغەمـبەر ﷺ دەفـەرموی: (**من قتل دون ماله فهو شهيد، ومن قتل دون دمه فهو شهيد، ومن قتل دون دينه فهو شهيد، ومن قتل دون أهلــه فهو شهيد**) رواه أبو داود وصححه الالباني، واتـە: هەرکەسێك لەسـەر مـاڵی، لەسەر خوێن (نەفس)ی، لەسەر دینی وە لەسەر ماڵو خێزان (نامووسو ئابڕوو)ی بکوژرێ شەهیدە.

کەواتـە دابـین کـردنی مافـەکان لـە ئیسلامدا ئەرك (وظيفة)نو ئەگەر ئینسـان کەمـتەرخەمی یـان تـێدا بکات گوناهبار دەبێت، واتە شتێك نیە بڵـێن: قەیـناکات چاوپۆشـی لێ دەکـەم بـەڵکو خـوای پـەوەردگار لەسـەر کەمتەرخەمـیی کردنـت سـزات دەدات، هەرکەسـێك زوڵم قبوڵ بکاو هەوڵ نەدا بۆ مافی شەرعی خۆی ئەوە لەدنیادا بەئاگری زاڵمەکان دەسووتێ خوای باڵادەسـتیش لەرۆژی دوایی‌دا بەئاگری خۆی دەیسووتێنێ، لەسەر ئەوەی کە لەبەرانـبەر زاڵمـەکاندا هەڵوێسـتی نـەبووە، ئـەوەش بەدەقی ئایەت، خوای دادگەر دەفەرموێ:﴿**وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ**﴾(هود:من الآية١١٣)، واتـە: مـەیل مەکەن بەلای ئەوانەدا  کەزوڵم دەکەن (هەر جۆرە

زوڵمێك، زوڵمی سیاسی، ئابووریی، كۆمەڵایەتی، نەتەوەیی) لێیان نزیك مەكەونەوە (مەبنە دەستو پێوەندیانو مەبنە خزمەتكاریان)ئەگەرنا ئاگری دۆزەخ دەتانگاتێ، (وەخوای پەروەردگار سزاتان دەدات لەسەر ئەوەی كەمتەرخەمی تان كردووە لەبەرگری لێكردنی مافی‌خۆتاندا). ئێستاش با دووبارە سەرنج بدەینەوە:

## بناغەی ئەرك‌و مافەكانی مرۆڤ لەئیسلامدا

هەرچەندە پێشتریش ئاماژەمان بۆ كرد، شەریعەتی ئیسلامیی لەسەر سێ (٣) بناغەو بنەما ئەرك‌و مافەكانی‌مرۆڤی بنیات ناوە:

یەكەم: تەنیا خوا-جل جلالە- بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی ئینسان‌و ژیان‌و بوونەوەرە.

دووەم: ئینسان دروستكراوێكی ناوازەی هەڵبژاردەو بەجێنشینی خوا داندراوە لەسەر زەوی.

سێیەم: ئینسانەكان یەكسانن لەڕەگەزو لەسروشت‌و لەمافەكانیاندا . ئێستاش با باسێكی ئەوسێ بنەمایە بكەین:

**یەكەم: ئەوە كەخوا-جل جلالە- پەوەردگارو بەدیهێنەری هەموو شتێكە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾**(الزمر: من الآية٦٢) **یان دەفەرموێ:﴿الْحَمْدُ للَّه رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾**(الفاتحة:٢) **یان دەفەرموێ: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ ﴾**(آل عمران: من الآية٢٦).

كەواتە ئەوەی كەبەدیهێنەرو پەروەردگارەو خاوەنە بۆ هەمووشتێك تەنیا (الله)یە-جل جلالە-، مادام وایە تەنها (الله)ش حەقی ئەوەی هەیەو شایستەی ئەوەی هەیە كەئەرك‌و مافەكان بۆ ئینسانەكان دیاری بكات‌و

پێیان بدات.

جائەوەش حیکمەتێکی گەورەی تێدایە، چونکە کاتێك خوا مافێك بۆ ئینسان دیار دەکات وەك بەندەی خۆیو جێنیشینی خۆی لەسەر زەوی، هیچ کەسێك بۆی نیە نەبەناوی دینەوە، نەبەناوی سیاسەتەوە،نەبەناوی بەرژەوەندیی گشتییەوە، نەبەهیچ ناوێکەوە ئەو مافەی لێ زەوت بکات، کەخوا پێی داوە، حەقو مافێك خوا بەبەندەکانی خۆی بدات هیچ بەندە (عبد)ێك بۆی نیە لێیان بستێنێتەوە، بەڵام ئەگەر بەندە (عبد)ەکان بۆ خۆیان لە نێوان خۆیاندا رێك بکەون لەسەر هەندێك ماف دەشتوانن دوایی سەوداو مامەڵەی لەسەر بکەن!

**دووەم: بنەمای دووەمی دیاری کردنی مافەکانی مرۆڤ لەشەریعەتی ئیسلامییدا بریتیە لەڕێزو حورمەتو پایەو مەقامی بەرزو ناوازەی ئینسان.**

بەداخەوە زۆر کەس بەتایبەتی خوێندەواران‌و رۆشنبیرانی نێو میللەتەکەمان، یان هاندەرێکیان نەبووە، یان چەواشەکراون، یان بەرچاویان لێڵ کراوە،بۆیە لەقورئان‌و سوننەتیان نەکۆڵیوەتەوەو نازانن کەمرۆڤ ـ ئینسان- لەئیسلامدا چ پایەو مەقامێکی بەرزی وای هەیە، لەهیچ فەلسەفەو بەرنامەو فیکرەیەکی دیکە دا ئینسان ئەو پایەو مەقامەی نەدراوەتێ بەڵکو نێوانیان ئاسمان‌و ڕێسمانە!! کە دەتوانین بەخێرایی لە (١٠) خاڵدا ئاماژەی بۆ بکەین:

**١- ئینسان بەندەی خوایە**

زۆر کەس وا دەزانێ ئەوە ئیهانەیە بەئینسان، نەخێر، ئینسان کاتێك لەکۆیەلایەتی رزگاری دەبێ کەبەندەی خوابێ، کاتێك زنجیرو کۆتو پێوەندی طاغووتو دیکتاتۆرەکان لەدەستو پێوملی خۆی دادەڕنێ، کەبەندەی خوابێ چونکە خوا بەدیهێنەر (خالق)ی هەمووانە، ئیمتیازی بەسەر

دروستكراوه (مخلوق)ەكانیدا هەیە، بەڵام ئەوانی دی هەموویان دروستكراون، بۆیە هیچ كەسێك حەقی ئەوەینیە كەس بكاتە كۆیلەی خۆیو خزمەتكاریخۆی، بەڵی ئینسانەكان بەوە رزگاریان دەبێ لەكۆیلایەتیو خزمەتكاریتیو لە وابەستەییو دابەستەیی بۆ یەكتر، كەبەندەی خوابن، خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ:﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْأِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ (الذريات:٥٦) واتە: ئینسانو جند (جن)م تەنیا بۆ ئەوە دروست كردوون كەبەندایەتیم بكەن.

دیارە خوای پەروەردگار پێویستی بەبەندایەتیی ئێمە نیە، بەڵام ئێمە ئەگەر بەندەیخوا نەبین، تووشی كۆیلایەتیو خزمەتكاریی بۆ طاغووتەكان دەبین!

با تەماشا كەین ئایا لە (یەكێتی سۆڤیەتیی) پێشوودا، بیردۆزەی (ماركسیزم، لینینیزم)وەك بت (صنم)ێك نەدەپەرسترا؟!! ئایا پەیكەرە مۆمیاكراوەكەی (لینین) لەكۆشكی (كرملین)دا نەدەپەرسترا؟! ئایا (ماركس) وەك بتێك نەدەپەرسترا؟! ئێستاش ئایا كۆشكی سپیو بڕیارەكانی كۆنگرێسو بۆچوونەكانی (جۆرج W بۆش)وە باقی سەرانیئەمریكی لەلایەن ئەمەریكاییيەكانەوە وەك كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس) سەیر ناكرێت؟! وەهەروەها ئینسان ناتوانێ بێ پەرستراو بژی، جائەگەر پەرستراو (معبود)ی حەقیقی نەپەرست كەخوا (الله)یە، پەرستراوە ساختەكان (المعبودات المزيفة)، یان ئینسانێكی وەك خۆی دەپەرستێ، جاچ مردوو بێ چ زیندوو، یان ئەستێرەو مانگو خۆر دەپەرستێ، یان حزبێك دەپەرستێ، یان دەوڵەتێك دەپەرستێ، گرنگ ئەوەیە ئینسان بێ پەرستراو ناژی.

**٢- ئینسان جێنیشین (خلیفة)ی خوایە:**

جێنشــینیخوا، واتــە خوائینســانی لەســەر زەوی دانــاوە بــۆ ئاوەدانکــردنەوەی زەوی، جــاچ جێنشــینی خــوا (خلیفة الله)بێ چ جێنشینی مــەخلوقاتی دیکــەبێ کــەخوا لەسەر زەوی دایناوە، جائایا جێنشینی کێیە لەمــەخلووقاتی دیکە کە لەپێش ئینساندا لەسەر زەی ژیابن[٦٢]؟ بەهەر حاڵ لــە نــێو توێژەرەوان (مفسرین)ی قورئاندا مشتومڕێك لەوبارەوە هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئینسان جێنشینە کە لەسەر زەوی داندراوە، خوای پەروەردگار دەفــەرموێ: ﴿وَإِذْ قَــالَ رَبُّــكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ (البقرة: من الآية٣٠) بەڕاستی پایەو مەقامێکی یەکجار بەرزە، مەقام لەوە بەرزتــر؟! واتــە لــەخوای پــەروەردگار بێــتەخوار، ئینســانە، چونکە جێنشین (خلــیفة) واتــە: ئــەو کەســەی لەشــوێنی ئەو زاتە دادەنیشێ کە کردوویەتی بەجێنشــینی خــۆی، خــوا ئینسانی لەسەر زەوی داناوە، بۆ ئەوەی سەرزەوی ئاوەدان بکاتەوە وەك لەئایەتی دیکەدا باسی دەکاتو دوایی دەیهێنین.

**٣- وە خوای پەروەردگار ئینسانی بەشێوەیەکی تایبەت خوڵقاندوەو لەڕووحی تایبەتیخۆی فووی بەبەرداکردووە**

وەك دەفــەرموێ: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي ﴾(الحجر: من الآية ٢٩) واتە: جاکاتێك جەستەی ئینسانم ڕێك خست، وە لەڕووحی تایبەتیخۆم فەووم بەبەردا کرد.

هەڵــبەتە ڕووحــی ئینســان لــەخوای پــەروەردگار جــیا نەبۆتەوە، بەڵام ڕووحــی دروســتکراو (مخلوق)ێکی تایبەتە، خوا-جل جلالە- بەفوو (نفخة)ی

---

٦٢) ئەمە ڕایەکیزاناو توێژەرەوانی قورئانە کەڕایەکی بێ هێزەو هیچ بەڵگەیەکیلەسەر نیەو ڕای ڕاست ڕای یەکەمە، وەك لەبەرگی یەکەمی (خواپەرستی مسوڵمان)دا ڕوونمان کردۆتەوە.

تایــبەتی خــۆی نــاوی هێــناوە، ئــەوەش نهێنی (سر)ێکە تەنیا خوای بەرزو مــەزن دەزانــێ چی‌یە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِــنْ أَمْــرِ رَبِّــي﴾ (الاسراء: من الآية٨٥) بەلاَم گرنگ ئەوەیە ئەوە پایەو مەقامــێکە بە ئینسان دراوە بەسەر هەموو دروستکراوەکانی دیکەدا، خوای پــەروەردگار بەهیچ کام لەدروستکراوەکانی دیکەی نەفەرمووە: لەڕووحی‌خۆم فــووم بەبــەردا کــردوون، تەنــیا بــە ئینســانی فــەرمووە ، واتــە ئەو رووحە تایبەتی‌یەی کە هی خوایە.

**٤- وە خوا –جل جلاله- دەفەرمووێ بەفریشتەکانمان فەرموو: سەجدەی رێزگرتن بۆ ئادەم بەرن‌و سجدەیان برد..**

بەڵێ باوکی بەشەریەت سەجدەی بۆ براوی فریشتەکانە!! وە لەشوێنی‌دیکەدا دەفەرموێ: ﴿فَسَجَدَ الْمَلائكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ﴾ (الحجر: ٣٠) واتە: تێکڕای فریشــتەکان لەئاسمانــەکان‌و زەوی‌داسەجدەیان بۆ ئادەم برد، ٠سـجدة التكريم والتشريف).

**٥- ئینجا خوای پەوروەردگار دەفەرموێ: ئێمە ئەمانەتێکمان بووە بەئاسمانەکان‌و زەوی‌و شاخەکان هەڵنەگیراوە، بەلاَم ئینسان ئەمانەتی ئێمەی هەلگرتووە**

﴿إِنَّــا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَات وَالْأَرْضِ وَالْجبَال فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْملْنَهَا وَأَشْــفَقْنَ منْهَا وَحَمَلَهَا الْأنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ (الأحزاب:٧٢)، پایــە لــەوە بەرزتــر؟! ئــەو ئەرکــەی بەئینســان ســپێردراوە لەبوونەوەردا نە ئاسمانــەکان‌و نــە زەوی‌و نەشــاخەکان، هیچــیان نەیانتوانــیوە ئــەو ئەرکــە هەلگــرن، بــەلاَم ئینســان توانــی، ئینســان شایســتەی ئەوە بوو، کەخوا جل جلالــە ئــەو شایســتەیی‌یەی پــێداوە، ئــەو ئەمانەتــەش ئەوەیــە کە ئینسان

بـەئیرادەو ئیختیاری خۆی لەسەر ئەم زەوییە بژیەت بەوشێوەیە کەخوا پێی خۆشەو فـەرمانی پـی کـردووە، ئـەو توانـاو ئیرادەیـەی پێ دراوە، یاخود بەوشێوەیەی کەخواپێی ناخۆشە، ئەو بوارەو مۆڵەتەشی هەرپێ دراوە.

ئائـەوە ئەمانەتـێکە لەئەستۆی ئینساندا، ئەو ئیرادە ئازادە کەئینسان دەتوانێ بەرێی شەڕو خراپەداپێی بڕوا، یان بەرێی خێرو چاکەدا.

**٦- هەروەها خوای پەروەردگار ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەئینسان سپاردوە**

وەك دەفـەرموێ ﴿**هُوَ أَنْشَأَكُمْ منَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فيهَا**﴾(هود:من الآیة ٦١) واتـە: خوا ئێوەی لەزەویدا پێگەیاندوە، وە ئاوەدان کردنەوەی زەویشی بەخۆتان سپرادوە.

هـەندێك کـەس وا دەزانـن کەباسـی دینداری کرا نابێ باسی دنیاداری بکـرێ، بەڵام خوای پەروەردگار دەفەرموێ: خوا ئاوەدان کردنەوەی سەرزەوی بەئێوە سپاردوە

**٧- پاشان لەوە گەورەتر، دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِنْهُ﴾** (الجاثـیة: من الآیة١٣)، **واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەمووی بۆ ئێوە مەیسەر کردووە.**

هـەندێك کـەس وا دەزانـن کـە ئـەهلی دیـن پێیان ناخۆشە بەوەی کە ئینسان پێی ناوەتە سەر مانگ، یان ئەگەر لەداهاتوودا بگاتە سەر (مریخ)، یـان بگاتەسـەر خـڕۆکەیەکی دیکـە!! نەخـێر بەپێچەوانەوە ئەگەر ئینسان لـەدین تێگەیشـتبێ‌و لەڕوانگـەی قورئانـەوە تەماشـا بکات، دەزانێ خوای پـەنهان بـین دەفەرموێ: ئاسمانەکان‌و زەویم بۆ ئێوە ڕام‌و دەستەمۆ (مسخر) کـردوە تـا سـوودیان لێ ببینن، کەواتە ئەگەر ئینسان بتوانێ بچێتە شوێنی

زۆر دوورتـر لەمانگو (مريخ)یش، ئینجا ئەوە مانای ئەوەیە کەلەو بوارەوە هەنگاوی ناوەو بەو مەجالەدا ڕۆیشتوە کە خوا بۆی ئاسان کردووە.

**٨- وە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾** (الاسراء: ٧٠) **واتە: بەتەئکید ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە (بەهەموو شێوە ڕەگەزەکانیانەوە)، وە لەدەریاو لەوشکانیدا هەڵمانگرتوون، (واتە هۆکارەکانمان بۆ سازاندوون کە بتوانن لەوشکاییو دەریادا پێی بڕۆنو سەفەری پێ بکەن) وە بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانمان پلەو ئیمتیازمان پێداون.**

وەك دەبیـنین خـوای کاربەجێ فەرموویەتی: **﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾** (الاسـراء: مـن الآیة ٧٠) ڕێـزمان لەوەچەی ئادەم گرتووە، دیارە خوا-جل جلالـە- دەزانـێ کـە لە وەچەی ئادەم (هابیل)یش هەیەو (قابیل)یش هەیە کافـریش هەیـەو مسـوڵمانیش هەیـە، کەچی دەفەرموێ: ڕێزمان لەوەچەی ئـادەم گـرتوە، کەواتە: ڕێز لێگیرانی ئینسان گشتییەو سەرجەم ئینسانەکان وەك خودی خۆیان ڕێز لێگیراون.

ئـنجا ئایـا ڕێزەکە لەچی دایە؟! لەوەدایە کە دەفەرموێ: **﴿ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾** (الاسراء: من الآیة ٧٠)، واتـە: سەرزەویو بوونەوەرمان بۆ ڕامو دەسـتەمۆ کـردوون، **﴿وَفَضَّـلْنَاهُمْ عَلَـى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾** (الاسـراء: مـن الآیة ٧٠) کۆمەڵـێك ئامادەییو شایستەیی (إستعدادات) بەئینسان دراون کەلە دروستکراوەکانی دیکەدا نین.

**٩- هەروەها خوای کاربەجێ دەفەرمووێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْأِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾** (التین: ٤)، **واتە: (وەبێگومان ئینسانمان لەباشترین شێوە پێکهاتنی ماددیو مەعنەویدا خولقاندوە)، واتە: هیچ**

**مەخلووقێکی دیکە بەوشێوەیە کەئینسان خولقاوە، دروست نەکراوە.**

**١٠- وە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾**(الكهف: من الآية٢٩) **واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بفەرمووە: حەق لەپەروەردگارتانەوەیە، جاکێ پێی خۆشە بائیمان بێنێو کێش پێی خۆشە باکافر بێ.**

ئـا ئەوە گەورەترین رێز دانانە بۆ ئینسان، رێز دانانە بۆ ئیرادەو وجودی ئینسان کە خوا هەرچەندە کوفری پێ ناخۆشە، بەڵام رێی لەئینسان نەگرتوە رێـی کوفـریش بگرێـتەبەر، چـونکە ئینسـان کاتێك وجودی خۆی ئیسپات دەکات کەئازاد بێت.

**سێیەم: بنەمای سێیەمی مافەکانی ئینسان لەئیسلامدا بریتیە لە یەکسانیو وەك یەك بوونی ئینسانەکان بەهەموو رەنگو رەگەزو زمانە جیا جیاکانیانەوە لەوەدا کە هەموویان بەندەی خوانو خاوەنی یەك سروشتنو بۆ یەك ئەرکو حیکمەتو ئامانجیش خولقێنراون !**

دیـارە یەکسـانی ئینسانەکانیش دەیان دەقی قورئانو سوننەت دەلالەتی لەسەر دەکەنو شتێکی‌یەکجار ئاشکراو روونە، بۆ وێنە:

**﴿لَقَــدْ خَلَقْــنَا الْأِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾** (التين:٤)، **﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾**(الاســـراء: من الآية٧٠)، **﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْــنَاكُمْ شُــعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)** (الحجرات:١٣)، **((كلكم من آدم خلق وآدم من تراب)).**

وەلە كۆتایی ئەم خاڵەدا بەپەسندی دەزانم ئاماژە بۆ دووپلەو ئیمتیازی دیکـەی تێروانیـنی ئیسـلام بـۆ مافـەکانی مـرۆڤ بکەم ، بەسەر تێروانینی رۆژئاوادا:

**یەکەمیان:** ئەوەیـە کـەدان پێداهێـنانو دابیـنکردنی ئیسلام بۆ مافەکانی مـرۆڤ بەرهـەمی کردوکۆشـی کـەس نـیەو، هـەر لەسـەرەتاوە کـەخوای پـەروەردگار قورئـانی ناردۆتـە خـواریٚ، ئـەو ئایەتانەشـی ناردۆتە خواریٚو نەپێویسـتی کـردووە کە کەس ڕاپەڕینو شۆرش بکاتو، نەپێویستی کردووە کەس کۆبوونەوەی لەسەربکات کە داوا بکەن ئینسانەکان ڕێزیان لیٚ بگیریٚو مافیان پارێزراوبیٚ، چونکە خوا دروستکەری ئینسانەکانەو هەموومافەکانی پێداونو هەموو ڕێزو حورمەتێکی بۆ داناون.

**دووەمـیان:** ئەوەیـە کەلەئیسـلامدا ئـەرکو مافەکانی مرۆڤ وەك چۆن وەك دروشـم (شـعار) بـاس کراون، میکانیزمی بەرجەستەکردنییان دیاری کراوە، هـەروەها پشـتیوانە (ضـمانة) شیان بۆ داندراوە، کە گەورەترین زەمانەتی دابیـنکردنی مـافو ئەرکـەکانی مـرۆڤ بریتـیە لەئـیمان، پاشـان بریتـیە لەدەوڵـەتو حکوومـەتو، لـە شـەریعەتی ئیسـلامیی‌دا دەبـیٚ دەوڵـەت بەهەمووهـێزو توانـای خۆیـەوە لەپشـت ڕێـز لێگرتنی ئینسانو کەرامەتی ئینسـانو مـافو ئەرکـەکانی ئینسـانەوە بوەستیٚو ڕیٚ نەدات هیچ کەسو لایەنێك بەهیچ بیانووو پاساوێکەوە پێشێلیان بکات.

## دووەم: ئەرك و مافە بنەڕەتییەكانی ئینسان لەئیسلامدا

**یەك : دابین كردنی ژیانێكی ئازادانە:**

بنەڕەتی‌ترین٦ سەرەكی ترین مافی ٧ینسان لە٧یسلامدا بریتیە لەوە كەژیان٦ گوزەرانێكی ٧ازادانەو سەربەرزانەی بۆ دابین بكرێ، لەسۆنگەی ٧ەوەوكەخوای دادگەرو كاربەجێ ٧ینسانی بۆ ٧ەوە خولقاندووە كەتاقی بكاتەوەو تاقیكردنەوەكەیشی بەوە دەبێ كە بەندایەتی‌كردنی خۆی لەسەری پێویست كردوە ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذريات:٥٦)، جا ٧ەو بەندایەتی كردنەی مرۆڤیش بۆ خوا بەهۆی پابەندیی بە بەرنامەی خواوە جل جلالە دێتە د١: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾(الفاتحة:٥)، ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ)(الفاتحة:٦).

٧نجا بۆ ٧ەوەی بەڕاستی ٧ینسان لەو مەیدانەدابتوانێ ٧یمتیحانی خۆی بدات٦ تاقی بكرێتەوە، خوای كاربەجێ ٧یرادەیەكی ٧ازادی پێ بەخشیوەو توانای ٧ەوەی پێداوە كەبە هەر لایەكدا حەز بكات بڕوات: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾(الكهف: من الآية٢٩).

بۆیە ٧ەگەر٧یسلام كیان٦ دەوڵەتێكی هەبێ كەهەموو خەڵكی سەر زەوی بخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە، بێ ٧ەوەی تۆسقاڵێك زەخت٦ فشار بخا تەسەر هیچكەس، تێكرای ٧ینسانەكانەرپشك دەكات لەنێوان ٧یسلام٦ كوفرداو پاشان هەم مسوڵمانەكەو هەم كافەرەكە بەیەكسانی هەل٦ مەرجەكانی‌ژیانێكی ٧ازادانەو سەربەرزانەیان‌بۆ دەڕەخسێنرێ، بۆ ٧ەوەی حیكمەتی خوای كاربەجێ لەخولقاندنی بەشەردا كەتاقیكردنەوە (إبتلاء)یە بێتە د١: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ (الملك:٢).

ئەگەر یەکێك بپرسێ:

چۆن کیانو دەوڵەتێکیئیسلامیی ڕێ بەخەڵکی دەدات کە لەسەر کوفرو شیرك بمێننەوەو لە ژێر ڕکێفی دەستەلاتی ئیسلامیشدا بژین، مەگەر سەرانە (جزیە) لێوەرگیرانو لەسەر دینیخۆ مانەوە تایبەت نیە بەخاوەن کتێبەکان (أهل الکتاب)ەوە کەجوولەکەو دیانەکانن؟!!

لە وەلامی ئەم پرسیارەدا بەپێویستی دەزانم کورتە لێکۆڵینەوەیەك بکەم کەچەند جارێکیش لە کۆڕو کتێبەکانمدا ئاماژەیەکی خێرام بۆ کردووە لەبارەی ئەوەوە کەئایا تەنها خاوەن کتێبەکان سەرانەیان لێ وەردەگیرێو وازیان لێ دەهێنرێ کەلە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدابژین، یان ئەو حوکمو هەڵوێستەی شەریعەت تایبەت نیە بە (أهل الکتاب)ەوەو سەرجەم ئینسانەکان دەگرێتەوە، چ خاوەن کتێب بن، چ هاوبەش دانەر (مشرك) چ بێ بڕوا (ملحد) چ بێ دین (زندیق)هتد؟!.

هەڵبەتە بەندە بیروڕاو قەناعەتم وایە کە سەرجەم ئینسانەکان خاوەنی هەر جۆرە دینو فیکرەیەك بن، لەشەریعەتی وردبینو دووربینو دادگەری ئیسلامدا ڕێیان پێ دەدرێ کە لە ژێر سێبەری دەوڵەتو کیانی ئیسلامییدا بژینو سەربەزرانە قۆناغی ژیانیدنیاو دەرفەتی تێدا تاقیکرانەوەیان بگوزەرێنن وەپێشم وایە غەیری ئەم ڕایە هەڵەیەو بەهیچ جۆرێك لەگەڵ شەرعو عەقڵدا ناگونجێو لەگەڵ چەندان دەقی قورئان و سوننەتدا دژ دەوەستێو تێك دەگیرێ، ئەمەش چەند بەڵگەیەك بۆ ئیسپاتی ڕاستی ئەو ڕایەی هەڵمان بژاردووە:

١- خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ (البقرة: من الآية٢٥٦). واتە: لەئیسلامدا تۆبزی کردن (إکراه)و زۆره ملێ (إجبار) بۆ سەپاندنی دینو عەقیدە قەدەغەیە.

ئنجا بێگومان دینو عەقیدە بەزۆرە ملیٚ هەرناگونجیٚ وەربگیریٚ چونکە سەرەنجام بابای تۆبزی لێکراو دەچێتە حالەتی دووڕوویی (نفاق)یەوەو ئاشکراشە کە جۆری کوفری (نیفاق) پەنهان لەکوفری ئاشکرا خراپترەو بەزەرتریشە بۆ ئەهلی ئیسلام. هەر بۆیەش خوای بالاّ دەست لەبارەی نیفاقەوە هەڕەشەی توندی کردوەو پانتاییەکی زیاتری قورئانیشی بۆ کەشفو خستنەرووی مونافیقان تەرخان کردووەو ئەوەندەش بەسە کە خوای دادگەر بنی بنەوەی دۆزەخی بۆ مونافیقان داناوە: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ (النساء: من الآية١٤٥)، واتە: بێگومان دەغەلّەکان لە پلەی ژێرەوەی ئاگری دۆزەخ-دان.

کەواتە: بەلیٚ دروست نیە هیچ جۆرە کافرێك بخرێتە نێوان: هەلّبژاردنی ئیسلام بەزۆرە ملیٚو ناچاریی (نیفاق)، و کوژرانەوە، بەلّکو دەبیٚ هەمووکەس مافی ئەوەشی بدرێتیٚ کەلەسەر فیکرەی خۆی بمێنێتەوەو سەرانە بداتو ببێتە هاوولاّتی یەکی سەربەزری ژێر سایەی دەولّەتی ئیسلامیی!

٢- ئنجا مادام خوای دادگەر لەچەندان ئایەتدا ڕایگەیاندووە کەمافی هەلّبژاردنی یەکێك لەکوفرو ئیمانی بەبەندەکانیداوەو، پاشان زۆر بەڕوونیش فەرموویەتی هیچکەس بۆی نییە زۆر لەبەندەکان بکات بۆ ئیمان هێنان، هیچ جێگای مشتو مڕو ڕاجیایی لەو مەسەلەیەدا نەماوەتەوە؟!

با سەرنج بدەین: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾(الكهف: من الآية٢٩) واتە: وەبلیٚ هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، جاکیٚ دەیەویٚ بائیمان بێنیٚو کێش حەز دەکات باکافر بێت.

﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (يونس:٩٩)، واتە: وەئەگەر پەروەردگارت ویستبای هەمو ئەوانە کە لە زەوی دان تێکڕایان ئیمانیان دەهێنا، جائایا تۆ زۆر

لەخـەڵکی دەکەی تاکوببنە بڕوادار!! (کە دیارە ڕووی دواندن لەپێغەمبەری خوایەﷺ؛ واتە تۆش ئەو مافەت نیە!).

هـەوەرها هـەر لەو بارەوە خوای دادگەر بەپێغەمبەری کۆتایی خۆیﷺ فەرموەوە: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ، لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ﴾ (الغاشية: ٢١-٢٢).

وەفەرموویـەتی: ﴿وَمَـا أَنْـتَ عَلَـيْهِمْ بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَنْ يَخَافُ وَعِـيدِ﴾(قّ: مـن الآية٤٥) کەواتە:تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ بێجگە لەبیرخستنەوەو بێدارکردنەو قورئان بەسەردا خوێندنەوە ماف‌و دەستەڵاتێکی دیکەی بۆ مسوڵمان کردنی‌کافرو موشریکەکان پێ نەدراوە!

٣- پاشـان خـوای کاربـەجێ تـبارك وتعـالی بەڕاشـکاوی فەرموویـەتی کە ئینسـانەکان لـەژیانی سـەر زەمیندا بۆ کافرو مسوڵمان دابەش بوونە: ﴿هُوَ الَّـذِي خَلَقَكُـمْ فَمِـنْكُمْ كَافِرٌ وَمِنْكُمْ مُؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الـتغابن: ٢)، کەواتـە: ویستی‌خوای مەزن وابووە کەلەم ژیانە زەمینی‌یەدا هـەم کافـر هـەبن‌و هـەم مسـوڵمانیش! پاشـان لەهـیچ دەقێکی‌شەرعیشدا نـەهاتوە کـە دەبێ کافران قەڵاچۆو بنبڕ (إبـادة) بکرێن، بەڵکو لەو ئایەتەش کـەوا خوای‌کاربەجێ‌فەرمانمان پێ دەکات بەئامادەکردنی هێز (قوة) لە دژی کافـران، فەرموویەتی: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾(لأنفال: من الآية٦٠) وەك دەبینین ئامانج‌و حـیکمەتی هـێز سـازکردنەکە بریتـیە لـە : ترسـاندنی دوژمـنان (إرهـاب الاعداء) نەك قەڵاچۆکردنیان (إبادتهم) !

٤- ئینجاجێی خۆیەتی‌بپرسین: ئایا لەحالێکدا کە دەوڵەتی‌ئیسلامیی ئەهلی کوفـر سەرپشـك (مختار) دەکات لەنێوان مسوڵمان بوونی بەڕواڵەتی‌و کوژران (الإسـلام الظاهـري والسـيف)دا، ئایـا چـۆن‌و کـەی ئەوتاقـیکردنەوە

(إبتلاء)یـەی خـوای دادگـەر بـۆ بـەندەکانی دیّـتەدی کەلە چەندان ئایەتی قورِئانداجەخـتی لـە سەر کراوەتەوەو نەك تەنهابەهۆکارو ئامانجو حیکمەتی دروسـتکرانی ئینسان دانراوە، بگرە کراوەتە حیکمەتو ئامانجو فەلسەفەی تـێکرِای بـوون (الوجود)؟! وەك فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْـأَرْضَ فِـي سِـتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾(هود: من الآية٧)، واتـە: وە خوا ئەو زاتەیە کەئاسمانەکانو زەوی لە شەش رۆژان دا دروستکردوون، وە ئەوکاتە عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە داخۆ کامەتان کردەوەتان چاکترە.

بـەڵێ بەبێ ئازادبوونیئینسان لەهەڵبژاردنی بیروباوەڕیدا تاقیکرنەوەی مـرۆڤ دەبێـتە نـاوی بێنـێوەرِۆك، بێگومان ئەوەش لەئایینو بەرنامەی بێ هەڵـەو پەڵـەی خـوای کاربـەجێ.ناوەشـێـتەوەو پێچـەوانەی حـیکمەتو فەلسەفەی خولقێنرانی مرۆڤیشە!.

٥- پێغەمبەری خواﷺ هەرکاتێك کۆمەڵێك جەنگاوەری لەهاوەڵانی دڵسۆزی بـۆ جـەنگ رِەوانە کردبێ عادەتی وابووە کەبەم شێوەیە ئاراستەی کردوونو فەرموویـەتی: (( وإذا لقيــت عــدوك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصالٍ... فإن أبوا فَسَلْهُم الجزية...)) رواه مسلم عن بريدة.

واتــە.. وەهەرکاتــێك بـەرەنگاری دوژمــنەکەت بـووی لەهاوبـەش دانـەران بانگـیان بکـە بـۆ یەکـێك لەسـێ شتان.[٦٣] جائەگەر رازی نەبوون (مسوڵمان بن) داوای سەرانەیان لێ بکە.

دیـارە ئـەم فەرمایشـتە بـەڕوونی ئـەوە دەگەیـەنێ کەهاوبـەش بـۆ خوادانـەران (مشـرکین)یش وەك ئەهلی کیتاب سەرانەیان لێوەردەگیریو لەو

---

٦٤) کە لە درێژەی فەرموودەکەدا هاتوون و بریتین لە: مسوڵمان بوون، سەرانەدان، جەنگ کردن، دیارە هەتا یەکەم هەبێ دووەم دروست نیەو مادام دووەمیش هەبێ سێیەم دروست نیە.

بارەیەوە هیچ جیاوازییان نیە.
٦- هـەروەها دەربارەی وەرگیرانی سەرانە لە فارسەکان کە بێگومان ئەهلی کیـتاب نەبوونـە ئـەم دەقـەی سـوننەت هەیـە: (**قال مغیرة بن شعبة لعامل کسـری بـین یدي معرکة نهاوند: أمَرَنا نبینا رسولَ ربناﷺ أن نقاتلکم حـتی تعـبدوا الله وحده و تؤدوا الجزیة...**) رواه البخاري بڕوانە (فتح الباری)ج٦ ص٢٥٨.

وەك دەبیـنین موغـەیـرەی کـوڕی شـوعبە خـوا لـێی ڕازی بێ لەکاتی جـەنگی نـەهاوەندا بەکاربەدەسـتێکی کیسـرا دەڵـێ: پێغەمـبەرمان ڕەوانەکـراوی پـەروەردگارمانﷺ فـەرمانی پێ کردووین کە لە دژتان بجەنگین تاکو یان تەنها خوا دەپەرستن، یان سەرانە دەدەن
٧- هـەروەها دەربـارەی وەرگیرانیسـەرانە (جـزیة) لەمەجوسـی هەجەر ئەم دەقـەی سـوننەتیش هەیـە: (( **عن عبدالرحمن بن وعوف رضي الله عنه أن رسول اللهﷺ أخذها- أي الجزیة- من مجوس هجر**)رواه البخاري.

ئاشکراشـە کەمەجووسـییەکان ئاگرپەرست بوونەو لەسەر هیچ دینێکی خـوای نەبوونـە هـەر چـەندە پـاش ئـەم بەڵگـە ڕوونو بەهـێزانەی قورئانو سوننەت پێویستمان بە هیچ شتێکی دیکە نیە نەکەوتەوە، بەڵام با بۆ زێدە دڵنیایی سەرنجێکی قسەی هەندێك لە زانایانیش بدەین:
أ:- ( الـنووی) لـەکاتی شـەرح کردنی فەرموودەکەی (بریدە) داگوتوویەتی: (هـذا مما أستدل بە مالك والأوزاعي وموافقوهما في أخذ الجزیة من کل کافر عربـیاً کـان أو أعجمـیاً، کتابـیاً أو مجوسیاً أو غیرهما) بڕوانە: شرح صحیح مسلم، ج٧ ص٣١٣.

واتــە: ئـەم فەرموودەیــە (فـإذا لقیـت عـدوك مـن المشـرکین) لــەو بەڵگانەیـە کـە (مالك) و (أوزاعی)و هاوڕایەکانیان بەبەڵگەیان هێناوەتەوە

لەسـەر ئـەوە کەسـەرانە لەهـەموو جۆرە کافرێك وەردەگیرێ عارەب بێ یان عەجەمو خاوەن کتێب بێ یان مەجووسی یان غەیری ئەوانەش
ب:- (الصـنعانی)یـش هەر لەشەرحی فەرموودەی ناوبراودا گوتوویەتی: (في الحديث دليل عن أن الجزية تؤخذ من كل كافر كتابي أو غير كتابي عربي أو غير عربي، لقولـه: (عـدوك) وهـو عام.. وأما الآية فأفادت أخذ الجزية من أهـل الكـتاب ولم تـتعرض لأخذها من غيرهم ولا لعدم أخذها، والحديث يبين أخذها مـن غيرعـم.. وأمـا عـدم أخذهـا من العرب فلأنها لم تشرع إلا بعد الفـتح وقـد دخـل العرب في الإسلام ولم يبق منهم محارب.. وأستمر هذا الحكم بعـد عصـرهﷺ ففتحـت الصـحابة رضـي الله عـنهم بـلاد فـارس والـروم وفي رعايـاهم العـرب خصوصـاً الشـام والعراق ولم يبحثوا عن عربي من عجمي، بـل عمموا حكم السبي والجزية على جميع من استولوا عليه، وبهذا يعرف أن حديـث بـريدة كـان بعـد نـزول فـرض الجـزية وفرضها كان بعد الفتح، فكان فرضها في السنة الثامنة عند نزول براءة) بروانە سبل السلام، ج٤ ص٤٧.

واتـە: لـەو فەرموودەیەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە سەرانە لەهەموو کافـرێك وەردەگـیرێ کیـتابیو غەیـری کیـتابی، عـارەبو غەیری عارەب، چـونکە فەرموویـەتی: (دوژمـنەکەت) کەوشەیەکی گشـتییە، ئینجا هەرچی ئایەتەکەیـە ئـەوە دەگەیـەنێ کە سەرانە لەئەهلی کیتاب وەردەگیرێ بەڵام باسـی وەرگرتـنی یـان وەرنەگرتـنی لەغەیـری ئـەوان نەکـردووە، بـەڵام فەرموودەکە ڕوونی کردۆتەوە کە لە غەیری وانیش وەردەگیرێ

بـەڵام هۆی وەرنەگیرانی لەعارەب ئەوە بووە کەوەرگرتنی سەرانە تەنها پاش ئازادکـرانی شاری مەککە (فتح مكـة) دانراوەو، هەتا ئەوکاتەش عارەبەکان هاتبوونە نێو ئیسلامەوەو هیچ جەنگاوەرێکیان نەمابوو لەدژی ئیسلام
ئیـنجا ئـەو حوکمـە پـاش سـەردەمی پێغەمـبەریشﷺ هـەر بەردەوام بوو، هـاوەڵانی خوالـێـیان ڕازی بـێ وڵاتـانی فـارسو ڕۆمـیان ئـازاد کـرد کـە

عارەبیشیان لەنێودا هەبوون بەتایبەت شامو عێراق، وە هاوەڵان هەوڵیان نەداوە کەعارەبو عەجەم لەیەك جیابکەنەوە، بەڵکو حوکمی بەدیلگرتنی وەچەو سەرانە وەرگرتنیان بەسەر سەرجەم ئەوانەدا گشتاندەوە کە خستوویاننە ژێر قەڵەمڕەوی حوکمی ئیسلامەوە، وە لەمەوە دەزانرێ کەفەرموودەکەی (بريدة) پاش هاتنە خوارەوەی حوکمی سەرانە بووەو حوکمی سەرانەش پاش ئازاد کردنی مەککە بووە، واتە لەساڵی هەشتەمداو لەکاتی هاتنە خوارەوەی سووڕەتی (البراءة)دا.

ج:- (إبن قيم الجوزية)ش کە یەکێکە لەلایەنگرانی ئەو ڕایەی کەهەڵمان بژاردووە لەو بارەوە گوتوویەتی: (وقال طائفة في الأمم كلها إذا بذلوا الجزية قبلت منهم. أهل الكتابين بالقرآن والمجوس بالسنة ومن عداهم ملحق بهم، لأن المجوس أهل شرك لا كتاب لهم فأخذها منهم دليل على أخذها من جميع المشركين،وإنما لم يأخذهاﷺ من عبدة الأوثان من العرب لأنهم أسلموا كلهم قبل نزول آية الجزية فإنها نزلت بعد تبوك وكان رسول الله فرغ من قتال العرب وأستوثقت كلها له بالإسلام،ولهذا لم يأخذها من اليهود الذين حاربوه لأنها لم تكن نزلت بعد، فلما نزل أخذها من نصارى العرب ومن المجوس، ولو بقي حينئذ أحد من عبدة الأوثان بذلها لقبلها منه لما قبلها من عبدة الصلبان والنيران وهذا القول أصح في الدليل كما ترى) بڕوانە: زادالمعاد، ج٥ ص٩٢،٩١.

واتە: وە کۆمەڵێك گوتوویانە: سەرجەم میللەتان ئەگەر سەرانە بدەن لێیان وەردەگیرێ، جوولەکەو دیانەکان بەدەقی قورئانو مەجووسییەکان بە دەقی سوننەتو ، غەیری ئەوانیش قیاس دەکرێنە سەر وان، چونکە مەجووس هاوبەش دانەرنو هیچ کتێبیان نین، جا وەرگرتنی سەرانە لەوان بەڵگەیە بۆ وەرگرتنی لەتێکڕای هاوبەش دانەران وە هۆی وەرنەگرتنی سەرانە لە لایەن پێغەمبەرەوەﷺ لەبت پەرستەکانی عارەب ئەوە بووە کە بت

پەرستەکان تێکرا بەر لەهاتنە خوارەوەی ئایەتی سەرانە[٦٤] مسوڵمان بووبوون کەپاش جەنگی (تبوك) هاتۆتە خوارێ، وە ئەوکاتە پێغەمبەری خوا لەجەنگی عارەبەکان بووبۆوەو هەموویان بەئیسلامەوە پەیوەست بوو بوون هەربۆیەش سەرانەی لەو جوولەکانەش وەرنەگرت کە لە دژی جەنگین، چونکە جارێ ئایەتی سەرانە نەهاتبۆ خوارێ، بەڵام پاش هاتنە خوارەوەی لەدیانە عارەبەکانو لەمەجووسیشی وەرگرت، وەبێگومان ئەگەر هەتا ئەوکاتە هەرکام لە بتپەرستەکان مابایەو سەرانەی دابایە لێی وەردەگرت، وەك چۆن لەخاچپەرستو ئاگرپەرستەکانیوەرگرت وەئەم قسەیە وەك دەبینی لەڕووی بەڵگەوە .. لەقسەکەی دیکە بەهێزترە.

د:- (الشوكانی)یش کە لایەنگری هەمان ڕأیە لەوبارەوە گوتوویەتی: ( قوله: (فسلم الجزية) ظاهرة عدم الفرق بين الكافر العجمي والعربي وغير الكتابي) بڕوانە: نيل الاوطار ، ج٧ص٢٤٥: کەماناکەی ڕۆشنە.

هەروەها گوتوویەتی: (ظاهر الأدلة يقتضي أن بذل الجزية من أي كافر يوجب الكف من مقاتلته.. فإن قوله: (كان رسول الله).. يدل على أن هذا كان شأنه في كل جيش يبعثه) بڕوانە: (السيل الجرار)ج٤ ص٥٧٠-٥٧١.

واتە: ڕواڵەتی بەڵگەکان ئەوە دەخوازێ کەسەرانەدان لەهەر کافرێکەوە دەست گێڕانەوە لەجەنگ لەگەڵ کردنی پێویست دەکات

هەروەها گوتوویەتی: (والحاصل: أنّ من أدعى أن طائفة من طوائف الكفار لا يجوز ضرب الجزية عليها بل تخير بين الإسلام والسيف، فعليه الدليل ولا

---

٦٤) ئایەتیسەرانە ئەم ئایەتەیە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلايَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ (التوبة:٢٩)

دلـيل تقـوم بـه الحجة إلا ماورد في المرتد) بروانة: (السيل الجرار)٤ ص٥٧٠-٥٧١.

واتـه پوختـەی مەبەسـت: هەرکەسێك لافی ئەوە لێبدات کەکۆمەڵێك‌و جۆرێـك لەکافـران دروسـت نـیە کەسەرانەیان لێ وەربگیرێ، بەڵکو لەنێوان ئیسـلام‌و شمشـێردا سەرپشـك دەکـرێ پێویسـتە بەڵگـە بێنێـتەوەو هـیچ بەلگەیەکـیش نـیە کە قسە بڕبێت، مەگەر ئەوەی کەلەبارەی هەڵگەڕاوەوە هاتوە!

لـە کۆتـایی ئـەم بـڕە لیکۆڵینەوەیەشـدا بەپێویسـتی دەزانم ئاماژە بۆ فەرمایشـتێکی پێغەمـبەری خـواﷺ بکـەم کەرەنگـە گومـان‌و دوو دڵییەك لـەبارەی ئـەو ڕایـەوە کەهـەڵمان بژارد لەدڵی هەندێك کەسدا پەیدا بکات، ئەگەر وەك پێویست لێی حاڵی‌نەبین!

ئـەویش ئەمەیـە: (**أمـرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا اله إلا الله واني رسـول الله..**) رواه الـبخاري.. واتـە: فـەرمانم پێکراوە کە لەدژی خـەڵکی بجەنگم تاکو شایەتمان دێنن کە بێجگە لەخوا هیچ پەرستراوی دیکە ڕاسـت-نـین، وە کـە مـن پێغەمـبەری خـوام. بـەڵێ ڕواڵـەتی ئـەم فەرمایشـتە ئـەوە دەگەیـەنێ کەخـەڵکی لـە نـێوان مسوڵمان بوون‌و هاتنە مەیدانی جەنگ دا سەرپشك بکرێن!.

بـەلام هـەر بـەکورتی دەڵـێین: ئـەم فەرمایشتە کورت (مجمل)ەو درێژە (تفصـیل)ی ئەو مەبەستە لەدەقی دیکەدا هاتوە وەك لەئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرە بابەتـەدا بـەوردی باسمان کردووە، کەهەمیشە خەڵکی خراونە بەردەم سـێ شـتانەوە: (الإسـلام، الجزية، القتال)، دیارە سەرجەم زانایانیش لەسەر ئـەوە یـەکدەنگن کەپێویستە هەمیشە دەقە کورتەکان لەبەر ڕۆشنایی دەقە تەفصیلییەکاندا فام بکرێن، بۆ ئەوەی بەهەڵەدا نەچین، وە بۆ ئەو مەبەستە

زانایـانی (اصـول الفقـه) ئەم بنچینه شەرعییەیان داناوە: (**يحمل المجمل على المفصل**).

پێشـم وایـه لەئـەنجامی ئـەم بڕە توێژینەوەیەدا زۆر چاك ڕوون بۆتەوە كەئەو ڕایـه چـەندە ڕاسـتو بەهـێزە كەئـێمە هەڵمان بژاردو، بێجگە لە (مالك)و (أوزاعـی)و (إبـن القـیم)و (الصنعانی)و (الشوكانی) ژمارەیەك لەزانایانی هاوچەرخیش پەسندیان كردووە[٦٥].

بـەڵێ بەڕێـزان: لەدەوڵـەتی ئیسـلامیی‌دا هەموو كەمایەتی‌یە فیكری‌و دینـیەكان بـە (مـلحد)و (زندیـق)ەكانیشـەوەـنـەك هـەر ئـەهلی كیـتاب) هەموویان سەرانە (جزیة)یان لێ قبووڵ دەكرێ‌و لێیان قبووڵ دەكرێ هاوڵاتی بـن‌و لـە ژێـر سـایەی دەوڵـەتی ئیسلامیی‌دا بژین، وەلەسەر دین‌و فیكرەو بەرنامەی خۆشیان بن لەڕووی شەخسی‌و نێو خۆیانەوە، بەڵام بێگومان دەبێ ڕێـز بگـرن لـەو ئـاداب‌و یاساو ڕێسایانەی كە بەسەر ئەو كیان‌و قەوارەیەدا حاكمن.

وە خـوای دادگـەر كەدەفـەرموێ: ﴿**هُـوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنْكُمْ كَافِرٌ وَمِــنْكُمْ مُؤْمِــنٌ**﴾ (الـتغابن: من الآية٢)، واتە: (خوای ئێوە خولقاندووە، هەتانە كافرەو هەتانە ئیمانداره)، دەبینین لێرەدا (كافر)ەكەی پێش خستوە!، جائایا حیكمەتی ئەوە چییە؟! ڕەنگە هەندێك مسوڵمانی واهەبن پێیان وابێ ئەگـەر ئیسـلام حاكم‌و فەرمانڕەوا بێ، یەك كافر لەسەر زەوی ناهێڵێ! بەڵام وانـیەو ئـەوە تـێڕوانین (تصـور)ێكـی هەڵەیە، چونكە خوای پەروەردگار كە دەفەمـەرموێ: خوائـێوەی خولقـاندووە، هەتانـە كافرە، هەتانە مسوڵمانە، نەیفـەرمووە: دەبێ‌كافـرەكە قەڵاچـۆ بكـرێ، بـەڵكو بوونـی هەردووكـیانی

---

٦٥) بڕوانه (آثار الحرب..) د. وهبة الزحيلي ص٧٠١،٧٠٢وة : (الجهاد والقتال في السياسة الشرعية) د.محمد خير هيكل، ج٣ ص١٤٦٤.

بەشتێکی واقیعو ئاسایی داناوە!.

وە کەباسی قووەتو جیهادیش دەکاتە دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾(لأنفال: من الآية٦٠).

نافەرموێ: (تبيدون به)[٦٦]، بەڵکو دەفەرموێ: هێز ئامادە بکەن تاکو دوژمنی خواو دوژمنیخۆتانی پێ بترسێنن، واتە: با دوژمنتان بایی ئەوەندە لێتان بترسێ کە دەستدرێژی نەکاتەسەرتانو نەبێتە کۆسپو ڕێگر لەبەردەم کاروانی بانگەوازیی ئیسلامیدا، ئەگەر نا بامێنێت، چونکەخوای بەدیهێنەر ئەم دنیایەی تەنیا بۆ مسوڵمانان دروست نەکردووە.

ئنجا وەك نوکتەیەکی خۆش ئەم بەسەرهاتەتان بۆ بگێڕمەوە: (ابن بطوطة) هەبووە کەیەکێك بووە لەگەڕیدەو مێژوونووسان: دەڵێن کەبەشاراندا دەگەڕاو دەگەیشتە هەر شوێنێك پرسیاری دەکردو دەیگوت: ئێرە کوێیە و دانیشتوانی چین؟! ئەگەر بەدڵی نەبا، دەیگوت (دمرها الله) واتە خوا کاولی بکات، جا لە ڕاستیدا ئەو بۆچوونە ڕاست نیە، چونکەئیسلام هاتووە کەهەموو سەر زەوی ئاوەدان بکاتەوە، چ ئەوەی بەمسوڵمانەتی تێیدا دەژی، وە چ ئەوەی بەکافرێتی تێیدا دەژی،گرنگ ئەوەیە کافرەکە ڕێ لەسیستەمی حوکمی مسوڵمانەکە نەگرێ ئەویش کاتێك کەمسوڵمانەکە دەستەڵاتی هەبوو، کە بتوانێ سیستەمی حوکمەکەی جیهانگیر بکات، وەك ئێستا ئەمەریکا دەیەوێ بیرو (قیم)ی خۆی بەسەر دنیادا حاکم بکات کە زادەو هەڵقوڵاوی چەند ئینسانێکە، دیارە خوای پەروەردگار ئەو حەقەی هەیە کە بەرنامەو شەریعەتەکەی بەسەر هەموو دنیادا حاکم بێ، لەحاڵێکدا کە بە باشترین شێوە ڕێز لە هەموو کەمایەتییە

٦٦) إبادە يبيدە، قەلا چۆی کرد، قەلا چۆی دەکات.

فـيكريى‌و ديـنـى‌يه‌كان ده‌گـرێ‌و به‌خـته‌وه‌ريى‌و سـه‌رفه‌رازيى ڕاسـته‌قينه‌ى دنيايى‌و دوارۆژيى بۆ ئينسانه‌كان دابين ده‌كات.

ژيانـێكى ئازادانـه‌ش پێويسـتيى بـه‌وه هه‌يـه كـه ئينسـان ئـازادیى بيركـردنه‌وه‌ى هـه‌بێ، ئازاديى ده‌ربڕينى هه‌بێ، ئازاديى عه‌قيده‌و بيروباوه‌ڕى هـه‌بێ، ئـازاديى سياسـى، كۆمه‌لاّيـه‌تى، شه‌خسـيى، ئـابووريى، وه‌بـاقى ئازاديى‌يـه‌كانى هـه‌بێ كه‌بـه‌كورتى له‌بـڕگه‌كانى داهـاتوودا ئاماژه‌يـان بـۆ ده‌كه‌ين.

## دوو: مسۆگه‌ر كردن‌و پاراستنى شه‌ش (٦) شته پێويسته‌كان (تضمين وحماية الضروريات الست):

خوشـك‌و بـرا به‌ريـزه‌كان: له‌شـه‌ريعه‌تى ئيسـلاميى‌و له‌فـيقهى ئيسـلاميى‌دا، زانايـانى (أصـول الفقـه) به‌تايـبه‌تى، زاراوه‌يه‌كـيان هه‌يـه كه‌بريتـيه لـه: (الضـروريات السـت) يـان (الضـروريات الخمـس) ئه‌و شه‌ش شـتانه‌ى كه‌پێويسـتن، يـان ئـه‌و پێـنج شـتانه‌ى كه‌پێويسـتن‌و، كۆمـه‌لگاى ئيسـلاميى‌و ده‌ولـه‌تى ئيسـلامى ده‌بـێ بـۆ هـه‌موو هاوولاّتـيان دابينـيان بكات[٦٧]، كه بريتين له‌م مافانه:

١- دين ٢- ژين ٣- وه‌چه (النسل) ٤- ئابڕوو

٥- عه‌قلّ ٦-مالّ‌و سامان.

ئـه‌و شـه‌ش شـتانه هه‌موو ئينسانێك پێويستى پێيان هه‌يه، چونكه به‌بێ ئه‌وان ژيان‌و گوزه‌رانى به‌ڕێوه ناچى.

٦٧) بڕوانه: (نظرية الإسلام وهديه)ى أبو الأعلى المودودي، ص٣٠٨، كه‌له‌و باره‌وه ده‌لّێ: (والاسلام لا يفرق في هذا الباب بين سكان الدولة من المسلمين وأهل الذمة وهو يضمن لكل رجل من أهل الذمة- كمايضمن لكل رجل من السملمين- بأن الدولة لن تحرمه من المأكل والملبس والمسكن).

١- هەڵبەتە (دین) تەنیا بەمانای ئەو ئایینو بەرنامەیە نیە کەخوا ناردوویەتی، چونکە ئەوەی خوا ناردوویەتی ئەوە دینی حەقە، ئەگەرنا وشەی (دین) بەمانای هەر بەرنامەیەکە کە ئینسان پەیڕەوی لێدەکات، جائەگەر خوا ناردبی ئەوە دینێکی ئاسمانی پێ دەڵێن، ئینجا ئەگەر (نسخ) نەکرابێتەوە کەئیسلامە، ئەوە دینی حەقە، ئەگەر (نسخ)یش کرابێتەوە یان گۆڕابێو دەستکاریی کرابێو شێوێنرابێ، وەك هەرکام لەجولەکایەتیو دیانەتی (الیهودیة والنصرانیة)، هەروەها هەر دینێکی دیکەی خوایی گۆڕاوو شێوێنراو، ئەوە دینێکی بەتاڵە، چونکە هەرچەندە ئەو دینانە لەئەسڵدا خواییو ڕاست بوونە بەڵام دوایی یان نەسخ کراونەوە، یان دەستکاریی کراونو گۆڕاون، وە ئەگەر ئینسانیش داینابن، وەك دیموکراسی، کاپیتالیزم، لیبڕالیزم، مارکسیزم، سۆسیالیزم هتد، کەبێگومان ئەوانەش هەموویان دینن بەڵام زادەی بیرو هۆشی مرۆڤن-، ئەوە دینی بەشەرییو دەستکرد (وضعي)یان پێ دەگوترێ، جامافی دینداریی (حق الدین) بریتیە لەوەی کەهەموو ئەو ئینسانانەی لە ژێر سایەی دەوڵەتیئیسلامیدا دەژین، ئازاد بن لە هەڵبژاردنی ئەو دینەدا کەبەپەسندی دەزاننو بەزۆر هیچ دینو بەرنامەیەکیان بەسەردافەرز نەکردێ دینی دڵپەسەندی خۆیشیانیان لێ قەدەغە نەکرێ.

٢- مافیژین (حق الحیاة)یش ئەوەیە کە هەرکام لەو کەسانە کەرەعیەتی کیانو دەوڵەتی ئیسلامیین هەم هۆکارەکانی ژیانێکی ئینسانانەی ئاسوودەیان بۆ دابین بکرێنو، هەم ژیانو گوزەرانیشیان پارێزراو بێت لەهەرجۆرە مەترسییو دەستدرێژییەك، دیارە قەدەغە کرانی قەتڵیش هەر لەو سۆنگەیەوەیە.

٣- مافی وەچە (حق النسل)یش، ئەوەیە کە هەرکام لەهاووڵاتیان هەلو مەرجی ماڵو حاڵ پێکەوەنانو وەچە لێکەوتنەوەیان بۆ بسازێنریو،

بەهــەمان شــێوەش وەك قەدەغــەو پیاوانــێك بــپارێزرێ، هەر بۆیەش داوێن پیسی قەدەغە کراوە.

٤- مــافی ئابرِوو (حق العــرض) یش ئەوەیە کە دەبێ هەموو هاوولاٌتیەك لە ژێر سایەی دەولّەتی ئیسلامییدا ئابرِووو کەرِامەتیو کەسایەتی سەلامەتو پارێــزراو بێــت، هەربۆیەش شەریعەت بوختان (قــذف)و زەمو غەیبەتو ناوو نــاتۆرەو وەدواخســتنو جاسووســی لەســەرکردنو..هتد حەرِام کردووە، جا چ بەرانـــبەر بەهاوولاٌتیـــیەکی مســـولّمان بکـــرێن، چ هاوولاٌتیـــیەکی نامســـولّمان!چـونکە هەرکەسـێك رِازی بـێ کە رِەعییەتیکیانو دەولّەتێکی ئیسلامیی بێتو لە ژێر سێبەری ئیسلامدا ژیان بەسەر بەرێ دینو عەقیدەو بەرنامەی هەر شتێك بێ هیچ لەمەسەلەکە ناگۆرِێو مادام خوای دادگەر کە بەدیهێنەرو پەروەردگاریەتیو لێشیسەلماندوە کەبەویستی خۆی بژیەتو هیچ شــتێکی لەسەر فەرزنەکردوە، هیچ کەسێکی دیکە بۆی نیە کەبەو بیانووەوە هــیچ جــۆرە زمــان درێژیــیو دەســتدرێژییەك بکاتــە ســەر کەســایەتیو کەرِامەتیو،کــتو مــتو وەك مســـولّمانان هــەر جــۆرە ئــازاردانو زیــان پێگەیاندنێکی حەرِام و قەدەغەیە.

لــە (صــحیح الــبخاری)دا هــاتوە، کەخەلــیفەی چوارەمی پێغەمبەرﷺ عــەلی کــورِی ئەبووتالیــب ئــەم وتــە بەجێیــەی فەرمووە: (**إنما قبلوا عقد الجــزية حــتى تكــون أموالهــم كأموالنا ودماؤهم كدمائنا**) واتە: (أهل االذمــة)- ئەوانەی کە دەبنە رِەعیەتی دەلّەتی ئیسلامیو مسولّمانیش نین- بۆیــە قبوولّیان کردووە پەیمانان لەگەلّدا ببەستنو ببنە هاوولاٌتیی ئێمە، تاکو مالّــیان وەك هــی ئێمە بێو خوێنیشیان وەك هی ئێمە بێ: (هەروەها باقی مافەکانی دیکەشیان وەك هی ئێمە پارێزراو بن)[٦٨].

---

٦٨) ئەوەی نێوان دووکەوانەکە خۆم زیادم کرد چونکە سیاقی قسەکە دەیگەیەنێ.

٥- هــەروەها هــەموو کەسـێك دەبــێ لەسـایەی کیانو دەوڵەتیئیسلامیدا عــەقڵی هــەم گەشــەی پێ بدرێ، هەم بشپارێزرێ لەهەر شتێك کەزیانی پێ بگەیــەنێو ببێــتە مایــەی سســت کــردنیو پەککخســتنی، هــەر بۆیــەش لە ئیســلامدا مــاددەی ســڕکەرو سەرخۆشکەرەکان قەدەغە کراون تاکو عەقڵی خــەڵك ســاغو ســەلامەت بــێ، چونکە ئینسان بەعەقڵو هۆش لەئاژەڵ جیا دەکرێتەوە.

٦- وە لــە کۆتــاییدا پێویستە لە ژێر سایەی حوکمڕانێتی ئیسلامدا،ماڵو سـامانی هــەموو هاوولاتیـان پارێــزراوبێ، هاوولاتــیان هــەم دەبێمافیان هەبێکــە کەســابەت بکــەنو ماڵــێ حــەڵاڵ پەیدابکــەنو، هەم ماڵەکەشیان ســەلامەتو پارێــزراو بــێ، هەربۆیــەش لەئیســلامدا ســزای دزیو ڕێگــری داندراوە تاکو ماڵی خەڵك سەلامەت بێ.

زۆر کەس هەیە پەرۆشی دەستی دزێکیەتی کە دەبڕدرێ، بەڵام پەرۆشی مــاڵو ســەروەتو سامانیخەڵکێکی نیە کە بەئارەقی نێوچاوانو ڕەنجی شان پــەیدای کــردووەو بەئاشــکراو لــە ڕێگــرییدا لــێی دەســتێندرێ، یــاخود بە پەنامــەکیو لەماڵێ لێی دەدزرێ!! پێویستە پەرۆشی هەوڵو ماندوو بوونو مــاڵو ســامانی خــەڵکمان بێــت وە دیفــاع لەکەســێك نەکەین کەخیانەتو ناپــاکی دەکــات بەرانــبەر بەماڵو سامانی خەڵك، یان بەرانبەر بە ئابڕوو و کەڕامــەتی خەڵك، نابێ بەزەییمان بە کەسانیناپاکدا بێتەوە، کەتاوانو دزی دەکات و حوکمی شەرعی بەسەردا دەدرێ.

وەپێغەمــبەرﷺ دەربــارەی ئــەو مافانــە لەحــەجی ماڵــئاوایی (حجــە الــوداع)دا کەزیاتــر لەســەد هــەزار (١٠٠٠٠٠)کــەس لەهاوەڵە بەڕێزەکانی لەخــزمەتی دابــوون، وە دوایــن حــەج بووکردی، دواین وتاریشی بوو کە بەو شــێوەیە بەگشــتی بۆیــان بــدات، فــەرمووی : (( **فــإن دمائکم وأموالکم وأعراضــکم علیکم حرام کحرمة یومکُم هذا في شهرکم هذا في بلدکم**

**هذا فليبلغ الشاهد الغائب**))متفق عليه، واته: خوێنتانو ماڵتانو نامووسو ئابڕووتان لەسەرتان قەدەغەیە لەنێو خۆتاندا وەك قەدەغەی ئەم ڕۆژەتان، لەم مانگەتاندا لەم وڵاتەتاندا، ئەوەی کەلێرەیە بابیگەیەنێ بەوانەشتان کەلێرە نین.

**سێ: مافە شەخسیو تایبەتیەکان.**

لە ئیسلامدا هەموو ئینسانێك وەك شەخص[٦٩]، دەبێ مافە شەخسیەکانی بۆ دابین بکرێن، دیارە مافە شەخسیەکان زۆرن بۆ وێنە: ئازادیی هەڵبژاردنی عەقیدە، وەك باسمانکرد، وەك ئازادیی بیرکردنەوەو دەربڕین، هەتا (أبو الاعلى المودودى)[٧٠] و (سید قطب)و هەندێکی دیکە لە زانایانی ئیسلامیی هاوچەرخ، ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، رایان وایە کەئەهلی کیتاب، یان ئەهلی زیمە، وەختێك لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی‌دا بون، بۆیان هەیە بانگەشە بکەن بۆ فیکرەو بیروباوەڕی خۆیان، بەڵام بەبێ قسە گوتن بە ئیسلام، وە بۆیان هەیە بەشێوەیەکی بابەتی (موضوعي) یان باسی بیرو باوەڕی خۆیان بکەنو بانگەواز بکەن.

وە لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ لەکاتێك دا وەفدی (نجران)هاتووە، لەمزگەوتی پێغەمبەرداﷺ قسەکەر (خطیب)ی ئەوان هەستاوە قسەی خۆی

---

٦٩) لێرەدامن قسە لەئینسان دەکەم نەك لە مسوڵمان، ئینسان بەگشتی، چ مسوڵمان چ نامسوڵمان نێرو مێ و گەورە و بچوك .

٧٠) أبو الاعلى المودودى ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: (**فالذي يظهر من هذا بوجه قاطع أن كل طائفة من طوائف البلاد إذا كانت لاتوافق آراؤها آراء الأمة الإسلامية، لا تحول الدولة الإسلامية دون إظهار آراءها، وأما إذا حاولت نشر أفكارها وحمل الجمهور عليها بالطرق الأرهابية والعمل على قلب فظم البلاد بالقوة، فهناك تؤاخذها الدولة وتجازيها على أعمالها**) بڕوانە: نظرية الاسلام وهدية). ص٣٠٧.

کـردووەو دیفاعی لەبیروباوەڕی (نەسرانیەت)ی خۆیان کردووە، پێغەمبەریش ﷺ ئایەتی خوای بۆ خوێندوونەوەو باسی ئیسلامی بۆ کردوون.

هـەروەها لەمەدیـنە لەمـزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ شاعیری موشریکەکان هێرشـی کـردۆتە سـەر ئیسلام، پێغەمبەریش ﷺ بە (حەسانی کوڕی ثـابیتو کەعـبی کوڕی مالیكو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە)ی گوتووە، کە سێ شاعیر بـوون لەهاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، دیارە هەر جارەی یەکێکیان بوو بوون، فەرموویـەتی: هەسـتن وەڵامیان بدەنەوە، شیعر بەشیعر، وتار بەوتار، قسە بەقسە، ئەوە لەکاتێکدا بووە کە ئیسلام لەوپەڕی دەستەڵاتی‌دا بووە!!

هـەروەها ئـازادیی جـلو بەرگ[٧١]، ئازادیی خواردنو خۆراك، ئازادیی سـەفەرو هـاتوو چـۆ، ئازادیی خانووبەرە، ئازادیی گەشتو گەڕان، هەندێك کـەس لەخۆوە پڕوپاگەندەی خراپمان بۆ دەکەنو دەڵێن: ئەگەر ئیسلامی‌یەکان دەسـتەڵاتی حوکمڕانیـیان بکەوێـتە دەسـت، پـێکەنینو زەردەخەنە قەدەغە دەکـەن، چـوونە سـەیرانو گەشـتو گوزار قەدەغە دەکەن، بەرگو پۆشاکی جوانو خواردنی خۆش قەدەغە دەکەن!!

بـەڵام لەڕاستیی‌دا ئەوە هەموو درۆو دەلەسەیە، چونکە خوای بەخشندە دەفـەرموێ: ﴿قُـــلْ مَـــنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الـــرِّزْقِ﴾ (الأعراف: من الآية٣٢)، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بفەرموو: کـێ جوانـیو ڕازاوەیی‌یـەك کەخوا خولّقاندوویەتی بۆ بەندەکانی وە ڕۆزی‌یە پاكو بەلەزەتو خۆشەکانی قەدەغە کردوە؟!

کێ قەدەغەی کردوون؟! ئەدی خوا بۆ بەندەکانی خۆی نەیخولّقاندوون؟! بـەڵام خـوا فەرموویـەتی: بەشـێوەی شەرعی وەدەستیان بێنن، وەبەشێوەی شەرعیش بەکاریان بێنن.

---

٧١) دیارە لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئادابە شەرعییە گشتی‌یەکانی کۆمەڵگای مسوڵماندا.

**چوار: مافە ئابووریی‌یەکان:**

هــەموو ئینســانێك لە ژێر سایەی کیان‌و قەوارەیەکی ئیسلامیی‌دا بۆی هەیــە خــاوەن(ملــك) بێت، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لا تَظْلِمُونَ وَلا تُظْلَمُونَ﴾(البقرة: من الآية٢٧٩).

واتــە: ســەرمایەکانتان هی خۆتانن، نەستەم دەکەن‌و نەستەمیشتان لێ دەکــرێ. وەهــەموو ئینســانێك لەدەوڵــەتی ئیســلامیی‌دا بــۆی هەیــە کارو کەســابەت بکات بەشێوەیەکی شەرعی‌و ڕەوا، هەرکارو کەسابەتێك دەکات‌و چــۆن مــاڵ‌و ســامانی‌خۆی وەســەرێك دەنــێ بەڵام لەسنووری شەریعەت داو بەشــێوەی شــەرعی، بۆیــە لــە ئیســلامدا سوودخۆری (ربا) قەدەغە کراوە، (إحــتکار) قەدەغە کراوە، زەوت کردن (غصب)و دزی کردن قەدەغە کراون، چونکە زیان بەبەرژەوەندیی گشتی‌و بەکۆمەڵ دەگەیەنن.

وە ئیســلام لــەڕووی ئابووری‌یــەوە هاوسەنگی‌یەکی زۆر وردی ڕاگرتووە لەنــێوان ئــازادیی تــاك‌و بــەرژەوەندیی کۆمــەڵدا، بەپێچــەوانەی سیســتمی ســەرمایەداریی‌و بەپێچــەوانەی سیستمی سۆشیالیستی‌یەوە کەلەسیستەمی ســەرمایەدارێتی‌دا کۆمەڵ‌و کۆمەڵگا لە ژێر پێی تاك دا دەپلیشێندرێتەوەو، تــاك بەکــەیفی خــۆی‌و بــێ گوێدانــە هــیچ شــتێك ماڵ‌و سامانی‌خۆی زیاد دەکــات؟ بەبازرگانــیی حــەڕام؟ بەبازرگانی کردن بەناموسی خەڵك؟ بەهەر شــتێك، گــرنگ ئەوەیــە ســەروەت‌و ســامانی زۆر وەســەرێك بنێــت، وە لەسیســتەمی ســەرمایەدارێتی‌دا ئینســان وەك تــاك بەرهــەڵداو ئــازادە هەرچی‌یەك بکات.

بــەڵام لەسیســەمی سۆشــیالیزمدا بەپێچــەوانەوە تــاك لــە ژێــر پــێی کۆمــەڵگادا دەپڵیشــێندرێتەوەو بەبــیانووی بــەرژەوەندی گشتییەوە سەرجەم ماف‌و ئازادییەکانی پێشێل‌و زەوت دەکرێن.

بـەڵام ئیسـلام وا نـیە، ئیسلام ڕێزی تاك دەگرێو مافو ئازادییەکانی بۆ دابین دەکات، بەڵام نەك لەسەر حیسابی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا.

هـەروەها لـە کۆمـەڵگای ئیسـلامیی‌دا هەرکەسـێك نەیـتوانی ژیـانو گوزەرانـی خـۆی دابـین بکـات، دەوڵـەتی ئیسـلامیی (مکلـف)ە کە ژیانو پێداویسـتی‌یەکانی بـۆ دابـین بکـات[72]، (ابو یوسف) لە کتێبی (الخراج)دا لەلاپـەڕە (١٢٦)دا هێـناویەتی کـە: ڕۆژێك خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خـەتاب خـوا لـێی ڕازی بـێ جولەکەیـەکی ریش سپیو بەتەمەنو نەخۆش دەبیـنێ سـواڵ دەکـات، دەفەرموێ: جوولەکە بۆ چی سواڵ دەکەی؟ ئەویش دەڵـێ: بڵێم چی سێ شتم لەسەر کۆبۆتەوە، فەقیریو پیریو سەرانە، سەرانە (جـزیة)م لەسـەرداندراوەو پیریشمو نەداریشم، لەریوایەتێك دا دەڵێ: عومەر خوالـێی ڕازیبێ، ئەوەندە دەگریا تا ریشی تەڕ دەبوو، پاشان ووتی: سوێند بـەخوا ئینسـاف نـیە کەبەگەنجێـتی سوودت لێ ببینینو بەپیری بەرهەڵدات بکـەین، دەسـتی دەگـرێو دەیـباتە لای بەرپرسـی خەزێـنەی دارایی (بیت المـال)ی مسـوڵمانانو پـێی دەڵێ: سەرنج بدەو سەرژمێریان بکە ئەمەو هاو وێـنەکانی لەخەزێـنەی مـاڵدا مووچـەیان بـۆ ببڕنەوە، چونکە هاووڵاتی‌یان (رعـیة)ی دەوڵـەتی ئیسـلامی بـا کافـریش بـن، نابـێ سواڵ بکەن و نابێ موحتاجو نەداربن.

**پێنج: مافە کۆمەڵایەتی‌یەکان:**

ئەمانــەش مــافی هــەموو ئینســانێکن لــە ژێــر ســایەی دەوڵــەتی ئیسلامیی‌دا، هەر لەژن هێنانو شووکردنو پێکەوەنانی خێزانەوە بگرە هەتا پاراسـتنی ساغو سەلامەتیو هەتا ئەنجامدانی چالاکی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان،

---

(٧٢) وەك پێشتر قسەیەکی (ابو الاعلی)مان لەوبارەوە هێنا.

کەبێگومان شەش مافە گرنگەکان (الضروريات الست) یش دەگرنەوە.

**شەش: مافە سیاسییەکان:**

بەهەمان شێوە لە ژێر سایەی کیانو قەوارەی ئیسلامیی‌دا هەموو ئینسانەکان مافی چالاکیی سیاسی‌یان هەیە، جا یەکەمین مافی سیاسی ئەوەیە کەوەك میللەتو نەتەوە، نەتەوەکان بەیەك چاو سەیر دەکرێن و لەشەریعەتی ئیسلامی‌دا کەمینە (أقلية)ی نەتەوەیی نیە، لەدەوڵەتی ئیسلامیی‌دا کەمینەیی دینیو فیکریی هەیە، بەڵام کەمینەی نەتەوەیی (الأقلية القومية) نیە، بۆچی؟ چونکە نەتەوەکان لەڕوانگەی ئیسلامەوە وەك یەکن، نە عەرەب لە کورد،نەکورد لەتورك، نەتورك لەئەفغان‌هتد، هیچ لەهیچی گەورەتر نیە، بەڵام کەمینەی دینیو (الاقليةالدينية)و فکیریی هەیە، مادام زۆربەی وڵاتەکە مسوڵمان نشینەو کەمێك جولەکە یان کەمێك نەصرانی یان کەمێك زەردەشتی یان کەمێك زەندیقی تێدایە، بەپێی سیستمی دیموکراسیش بێ دەبێ کەمینەکە لەیاساو دەستوورە گشتییەکان دامل کەچ بکەن بۆ زۆرینە[٧٣].

بەڵی وەك گوتمان یەکەمین مافی سیاسی بریتی‌یە لە (مافی نەتەوەیی) واتە نەتەوەکان هەموویان وەك یەكو بەیەك چاو سەیر دەکرێن، پاشان مافی فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە هەیە، تەنانەت بۆ ئەهلی زیمە (أهل الذمة)ش، ئەگەر ناحەقیو ناعەدالەتی‌یەك ببینن بۆیان هەیە بەرهەڵستی لێ بکەن، وەزۆر لەزانایانی ئیسلام ڕایان وایە کەلە ئەنجوومەنی شووڕای دەوڵەتێکی ئیسلامیی‌دا دەبێ نوێنەری هەموو کەمایەتی‌یە دینی‌یەکانیشی

---

٧٣) دیارە بەپێی شەریعەتی ئیسلامیی هەر شوێنێك کەوتە ژێر ڕکێفی حوکمی ئیسلامەوە شەریعەتیان بەسەردا جێ بەجێ دەکرێ وەك سیستمی حوکمڕانی بەبێ ڕەچاوکردنی زۆرینەو کەمینەی مسوڵمانان لەو شوێنەدا.

تێدابێ، بەجوولەکەو نەصرانییو زەردەشتیو هەموویانەوە، دەبێ هەموویان نوێنەریان لە ئەنجوومەنی شوورای دەوڵەتی ئیسلامییدا هەبێ، بۆ ئەوەی نوێنەرەکەیان دەنگو باسو خواسو پێداویستییەکانی ئەو خەڵکەی خۆی بگەیەنێ بەئەنجوومەنی شوورا، وە دیفاع لەمافەکانیان بکات.

مافێکی دیکەی سیاسی، بریتیە لەهاوکاری کردنو دەستبارگرتن بۆ حوکمڕان، وە ڕاستکردنەوەی لەهەڵەکان، وەلە حاڵەتی ڕاست نەبوونەوەشی دا هەڵوێست لێوەرگرتنی، وەك لادانو دوورخستنەوەی لەدامو دەزگاکانی حوکمڕانی چونکە بۆیە داینراوە کە شەریعەت پیادەبکات، وە مافێکی دیکەی سیاسی ئەوەیە کەبەگوێرەی شایستەیی (کفاءة)ئەرك بەخەڵکی دەسپێردرێ، نەك لەسەر بناغەی ڕەنگو زمانو خزمەیاتیو.. هتد.

وە مافێکی دیکە ئەوەیە کەخەڵك لەبەرانبەر یاساو دادگادا یەکسانن‌و هیچکەس هیچ جۆرە پلەو ئیمتیازێکی‌نیەو کێ لەهەموو کەس پلەو پایەی بەرزترە دەبێ لە هەموویان ملکەچتر بێ!

ئەوە کورتەیەك بوولەمافە بنەڕەتییەکانیمرۆڤ، وە ئەرکەکانی لەسایەی شەریعەتی خوادا (تبارك وتعالى).

شایانی باسیشە کە زۆربەی ئەو ئەركو مافانە بەتایبەت مافە سیاسییەکان بەکورتیو خێرایی ئاماژەمان بۆیانکرد، ئەگەرنا پێویستییان بەتوێژینەوەو ڕوونکردنەوەی چاکترو زیاتر

هەیە، بەتایبەت هێنانەوەی دەقی قورئانو سوونەت لەسەر هەرکام لەو مافانە.

•

## کۆتایی ئەم ئاڵقەیەش بەم چەند تێبینییە کورتە دێنم:

یەکەم: ناگونجێ ئیسلامێك پێغەمبەرەکەیﷺ نازناوی (رحمة للعالمين)ی هەبێ ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾(الانبياء:١٠٧)، هەموو

مافـەکانی ئینسـانەکان دابین نەکات! ! تەماشا دەکەین لەو ئایەتەدا خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ((للعـالمین)) واتـە: هەموو جیهانیان، واتە: بەلای کەمەوە، سەرجەم ئەوانەی کەلەسەر زەوین، کەواتە کاتێك شەریعەتی (محمد المصـطفی)ﷺ بـەرپاو بەرقـەرار دەبـێ، هـەموو جـیهانیەکان بەکافـرو مسـولمانەوە بەهەرەمـەند دەبـنو وەك ئینسـانێك رێـزیان لێ دەگـیرێو مافەکانیان دابین دەکرێت.

دووەم: هەرکارگەیـەك کەشـتێك بەرهـەم دێنێـتو ئامـێرێك دروسـت دەکـات، یەکسـەر (کەتـەلۆك)ێکـی ڕەگـەڵ دەخـات، خـوای بەدیهێنەریش ئینسـانی خولقـاندوەو، هەرئـەویش شایسـتەی ئەوەیـە ئەركو مافەکانیبۆ دیـاری بکات، وە چاکترینو پێشکەوتوو (متطور)ترین کەلو پەل کە دروست دەکرێـت، بۆ وێنە: تەلەفزیۆنێك کەدەتوانێ چەندان شەپۆلی دەنگیو ڕەنگی کۆبکاتـەوە، کاتـێك کـە بەوشـێوەیەی کەکارگەکـە دەسـت نیشانیکردووە بەکارناهێـنرێ، دەبێـتە کۆڵکە دارێك، ئینسانیش بەڕاستی هەرتا ئەوکاتە ئـەو پایەو مەقامەی دەبێ کەبەو شێوەیە بەڕێوە دەچێ کە خوای بەدیهێنەر بۆی دیاری کردووە.

سـێیەم: لەکۆتایـیش دا دەڵێم: بەندەبوونی ئینسان بۆ خوا-جل جلالە- بـۆ ئەوەیـە کەلـە کۆیلایەتی بۆ بەندەکان رزگاریبێ، وەلەراستیدا ئینسان بەبێ پەرستراو (معبود) ناتوانێ بژیەت، جا پەرستراوی حەقیقی بێ کەخوایە -جـل جلالـە-، یـان پەرسـتراوە ساختەکان بن کە لە بت (صنم)و طاغووتو دیکـتاتۆرەکاندا خۆیان دەبیننەوە، بەڵێ ئینسان تەنهابەهۆی بەندایەتییەوە بـۆ خـوا ڕێـزو کەرامـەتو کەسـایەتی سەلامەتو پارێزراو دەبێو لەخەمو پەژارەی دنیاو دوارۆژ دەرەخسێ.

خـوای پـەروەردگار میللەتیئێمەو باقی میللەتانی مسولمان هیدایەت بـدات کەلەژێـر سـایەو سـێبەری شـەریعەتەکەیداهەوڵ بـدەن ئەرکـە

شەرعییەکانیان جێ بەجێ بکەن، وەمافە شەرعییەکانیشیان دابین بکەن.

وەبەڕاستیش ئێمە خۆشحاڵ بووین کە لەو دواییەدا هەرچەند درەنگ وەخت بوو برادەرانی (یەکێتیو پارتی)توانییان کەدوای هەشت ساڵ بۆ یەکەمین جار لەپەرلمانەکەیاندا پێکەوە دابنیشن، لەگەڵ ڕەخنەو گلەییو تێبینیمان لەسەر زۆر شت، بەڵام بێگومان ئاشتیو تەبایی لەبەرژەوەندیی هەموولایەك دایە، هیواداریشین ئەو ئاشتەواییو ئەو دەست لەنێو دەستی یەکترنانە هەڵقولاوی قەناعەتو ئیرادەیئازادانەی خۆیان بێ، وەلەپێناوی بەرژەوەندیی میللەتەکەشماندا بەکاربێت، وەبۆ دابین کردنی بەرژەوەندیی شەخسیو حیزبیو بۆ تەصفیەی حیساباتی لاوەکیش بەکارنەیەت، وە بۆ دژایەتی کردنو پەراوێز کردنیخەڵکی دیکەش بەکارنەیەت، خوای پەروەردگاریش سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات.

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين

## ئاڵقەی (٤)

# جیهانگیریی رۆژئاواو جیهانێتیی ئیسلامو چەند سەرنجێك

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه

سەرەتا لەخوایپەروەردگار دەپارێمەوە تاعەتی مانگی ڕەمەزان لەهەموو لایەکمان قبووڵ بفەرمووێ، وەیارمەتیمان بدات کەلەم مانگی لەخوا نزیك بوونەوەو بەخۆدا چوونەوەیەدا ئەنجامێکی زۆر باش لەبواری لەخوا نزیك بوونەوەو بەخۆدا چوونەوەدا بۆ دونیاو دوارۆژمان وەدەست بهێنین، چونکە بێگومان شەریعەتیخوای پەروەردگار هەموو ئەو ئەرکانەی خستوونیەتە سەرشانی ئینسان پێش قیامەت بۆ دونیای لێیان بەهەرمەند دەبێ، ئەگەرنا خوای پەروەردگار پێویستیبەخۆ ئەزیەت دانو خۆ ماندووکردنو برسیو تینوو کردنی هیچ کەس نیە بەڵام ئەوە ئینسانەکانن کەپێویستیان بەوە هەیە کەبەوشێوەیەی خوای پەروەردگار بۆی دیاری کردوون بژیێن، وە ئەو کارانەی کە لەشەریعەتدا خوای پەروەردگار بۆی ڕوون کردوونەوە، جێ بەجێیان بکەن بۆ ئەوەی لەدونیاو دوارۆژدا پێی بەختەوەر بن.

ناوونیشانی کۆڕەکەشمان ئاوایە: (جیهانگیریی رۆژئاواو جیهانێتیی ئیسلامو چەند سەرنجێك).

جـا دوای ئـەوەی لـەدوو توێی ئەو سێ بەشە سەرەکییەدا کەباسەکەیان تـێدا پێشـکەش دەکـەین، لەهەرکام لە (جیهانگیریی)و (جیهانێتیی) حاڵی دەبین، ڕوون دەبێتەوە کە بۆچی ئەوەی ڕۆژئاوا جیهانگیرییە؟

(دیـارە لـەزمانیکوردی هاوچـەرخدا بـەزۆری وشـەی: گلۆبالیزەیشـن، بەجـیهانگیرایی تەرجەمە کراوە ئەگەرنا دەگونجێبڵێی، گلۆبالیزەیشن، یانی یەکخسـتنی جیهان، یان یەك شێوەکردنی جیهان)، وەدەریش دەکەوێ بۆ چی بۆ ئیسلام گوتوومانە، (جیهانێتیی) کە دیارە لەعەرەبیدا (گلۆبالیزەیشن)، دەبێـتە (العولمـة)، وە (العالمیة) بـەکوردی (جیهانێـتی)یـە، وە ئاشـکرایە کەمەسـەلەی (گلۆبالیزەیشـن)، لـەم ڕۆژگارەمـاندا پانتاییەکی زۆر لەباسو خواسی سیاسیو فەرهەنگیو فیکریی داگیر دەکات، نەك هەر لەسەر ئاستی ئەو وڵاتانەی کەبەکردەوە پێی هەڵدەستنو بەڵکو لەو شوێنانەی وەك ئێرەش دا وەك کوردستانی ئێمە کەهەتا ئێستا هیچ پشکێکمان تێیدا نیە، مەگەر لـەداهاتوودا دەردەکـەوێ داخۆ ئایا خێری بۆ ئێمە چ دەبێ وەشەڕو زیانی چ دەبـێ هەرچەندە تاڕاددەیەك شەڕو زیانەکانی دەرکەوتوون، جا خوا پشتیوان بێ من لەسێ بەشی سەرەکیدا ئەم باسە پێشکەش دەکەم:

بەشـی یەکـەم پێناسـەو سەرگوشـتەو بەرهەم و شوێنەوارەکانی، بەشی دووەم پێناسـەی جیهانێتـتی ئیسـلامو جـیاوازی لەگـەڵ جـیهانگیریی ڕۆژئـاواییدا، بەشـی سـێیەم دا هەڵوێسـت وەرگرتـنی راسـتو دروسـت، لەبەرانبەر جیهانگیرییدا.

# بەشی یەکەم

## پێناسەو سەرگوزشتەو ئامانج و بەرهەم و شوێنەوارەکانی جیهانگیریی ( عەولەمە )

مەسەلەی جیهانگیریی شتێك نیە کە ئێمە بتوانین لەکۆڕێکی ئاوادا ئەوەی کەپێویستە لەبارەیەوە بگوترێ بیلێین، بەڵام وەك عەرەب گوتوویانە: (ما لا يُدركُ كُلُّهُ لا يُتركُ جُلُّهُ) ئێمەش هەوڵ دەدەین زۆر بەگوشراوی ئەم مەسەلەیە باس بکەین، زیاتریش ئەوەی کە لەم کات و ساتەدا بۆ خەڵك و میللەتی خۆمان بەپێویستی دەزانین کەلەو بارەیەوە بیزانین، جەخت لەسەر ئەوە دەکەین، ئینجا وەك عادەتی خۆیشم لە بەر ڕۆشنایی واقیعی (گلۆبالیزەیشن) و لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتدا قسەو سەرنجەکانی خۆم دەخە مەڕوو:

### ١- پێناسەی جیهانگیری:-

وشەی جیهانگیریی تەرجەمەی وشەی (گلۆبالیزەیشن) ( Globalization)ی ئینگلزیەو عەرەبیش بە (عولمة) تەرجەمەیان کردووە (عەولەمەش) واتە: جیهان کردنەوەیەك وەك چۆن وشەی(قالب) ئەگەر بگوترێ (قولبة)یانی لە قالب دان، عالەمیش کەکردت بە (عولمة) واتە دونیا کۆکردنەوە سەریەك و دونیایەك شێوە لێکردن، جا ئەم وشەیە بۆ یەکەم جار لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەری هەڵداوەو بەکار هێندراوە، بۆیە هەندێك لەنووسەرو سیاسەتمەداران لە جیاتی (عولمە) دەلەێن (ئەمرەکە) نەك بەجیهانی کردن بەڵکو بەئەمەریکایی کردن، واتە بەئەمەریکایی

کـردنی هــەموو شتێك، جا ئەم پێناسە زمانەوانی‌یە دەتوانین بڵێین: هەموو لـێکۆڵەرەوان لەسەری یەك دەنگن، پاشان زۆربەی توێژەرەوان لەسەر ئەوەش یـەك دەنگـن کـە بڕبڕەی پشتی جیانگیریی‌و بناغەکەی بریتیی‌یە لەئابووری (إقتصـاد)جـا هەرچەندە ئەوەی جیهانگری تێدا دەردەکەوێ زیاتر ئابووری‌یە بــەڵام لەویشــداکورت نەبۆتــەوە بــەڵکو جــیانگیری فەلســەفەو دینــێکی سەردەمەو ڕێبازێکە کە دەیەوێ دەست بخاتە هەموو شتێکەوەو دەست بخاتە دیــنە ئاسمانیەکانیش ئەوەی کەوەکو خۆی ماوەتەوەو دەستکاری نەکراوە کە ئیســلامەو، ئەوانەش کەدەستکاری کراون، وە دەیەوێ دەست بخانە کلتورو عــادەت‌و نەریتی‌میللەتان تەنانەت دەست بخاتە شێوەی نان خواردن‌و بەرگ‌و پۆشاکیشیانەوە، کەواتە جیهانگیریی لەئەسڵدا زیاتر دیاردەیەکی ئابوورییە بــەڵام دوایــی چــڵ‌و پۆپــی هاویشــتووە بــۆ هــەموو لایەنــەکانی دیکــەی ژیان،بەسیاســەت‌و کۆمەڵایــەتی‌و ئــەخلاق‌و فــیکرو فەرهــەنگ‌و عــادەت‌و نەریتیشــەوە، هــەروەها شــارەزایان لەسەر ئەوەش یەك دەنگن کەهەرچەندە ڕۆژئــاوا (کــە دەڵــێین ڕۆژئــاوا واتــە ئــەورووپاو ئەمــەریکاش کەلەڕاستی‌دا ئەمــەریکاش هــەر درێژبوونــەوەو ئیمتیدادی ئەورووپایە). مەڵبەندو کانگای یەکــەمی جــیهانگیری (گلۆبالیزەیشــن)ە بەپلــەی یەکــەم: جــیهانگیری لەڕۆژئاوادا بەرجەستە بووە، بەڵام لەڕۆژئاواشدازیاتر لەئەمەریکادابەرجەستە بـووە، کـە جلـەو بەدەســتی بەجـیهانی کـردنە، دیسان لێکۆڵەرەوان لەسەر ئــەوەش یــەك دەنگـن کـەڕەگ‌و ڕیشـەی ئەو دیاردەیەی کە پێیی دەگوترێ بەجیهانی کردن کە هەر هەمان شتەکە بە (سیستەمی نوێی جیهانی (النظام العــالم الجدید)یش ناودەبرێ ڕەگ‌و ڕیشەکەی بەقووڵایی مێژووی ئەمەریکاو ڕۆژئاوادا چۆتە خوارێ، شتێك نیە کەتازە پەیدا بوو بێت‌و سەری هەڵدابێت، بــەڵام وەك واقیعــێكِ پــاش هــەرەس هێنانیی یەکیەتی سۆڤیەت لە ساڵێ ( ١٩٩٢)ەوە بــەزەقی ئــەو دیاردەو مەسەلەیەی جیهانگیرییە (گلۆبالیزەیشن)

هاتۆتــە مەیدان، وەلەڕاستیدا لەوکاتەشەوە کەئەو مەسەلەیە هاتۆتە کایەوە دەتوانــین بڵــێین بۆتــە تاکــە بابەتــێك کە هەموو خەڵکی بەخۆیەوە مەشغوڵ کــردووە چ ئەوانــەی لەگــەڵی دانو پشت گیری دەکەنو چ ئەوانەش کە دژو نەیاریــنی هــەموویانی بەخۆیــەوە مەشــغوڵ کــردوە، هەروەها لێکۆڵەرەوان لەســەر ئــەوەش یــەك دەنگــن کەیەکــەم جار نی‌یە وڵاتێکی وەك ئەمەریکا یــاخود شارســتانیەتێکی وەك شارســتانێتی رۆژئــاوا بــیەوێ دونــیا بۆ خۆی (کۆنــترۆڵ) بکــاتو بــیەوێ بــاڵ بەســەر دونیادا بکێشێ، بەڵکو لەقووڵایی مــێژوودا ئەو هەوڵانە هەر بوون (ئیغریقیەکان)کاتی خۆی هەوڵیان داوە کە هــەموو دونــیا بخەنــە ژێــر دەســتەڵاتی خۆیــان، بەتایــبەتی لەســەردەمی (ئەسکەندەری مەقدۆنی)دا، هەروەها رۆمانیەکان هەوڵیان داوەو هەر کام لە فارســەکانو تەتەرو مەغۆلەکانیش هەوڵیان داوە، وە (جەنگیزخان) کەهات زۆربــەی دونــیای خســتە ژێــر دەســتەڵاتی خۆی، هەروەها هیتلەریشو بیری کۆمۆنیزمــیش بەهــەمان شــێوە، کە ئەو شێوە جیهانگیرییی‌و دونیا خستنە ژێــر کۆنترۆڵو دەسەڵاتی خۆیە لەگەڵ ئەوەی ئیسلام کە دوایی باسی دەکەین دوو مەســەلەی لــێك جــیان، چونکە هەموو ئەو هەوڵو تەقەللایانەی دیکە لەسۆنگەی ئەوە کە لەسەر بناغەیەکی خوایی نەبوون، بەڵکو لەسەر بناغەی هەســتو نەســتو ئــارەزوو ویســتێکی ئینسانانەو بگرە دڕندانەو بەئامانجی خۆســەپاندنو بــۆ کۆنــترۆڵ کــردنو دەســت بەسەراداگرتنی دنیا بوون، بەڵام ئەوەی کە ئیسلام دەیەوێتو لەسیستەمی ئیسلامی‌دا هەیە شتێکی دیکەیە وەك دوایــی باســی دەکــەین، بــەڵام دیــارە ئەو دەرفەتەی کەئەمڕۆ لەبەردەم جــیهانگیریی‌دا ڕەخســاوە وە ئــەو زەمیــنەی کــەبۆ ئەو ساز بووە بەدرێژایی مێژوو ساز نەبووە کەهەموو دونیا ئاوا بەکەڵکی ئەوە بێت کەبخرێتەوە سەر یــەكو بکرێــتە یــەكو یــەك شــێوەی لێبکرێــت، دیــارە ئەوەش بەهۆی ئەو تەکــنۆلۆژیا بــەرەو پێش چووەی کەبەدەستی شارستانی‌یەتی رۆژئاواوە هەیە

چ لـەبواری راگـەیاندن، چ تەکـنەلۆژیای جـەنگی چ ئاشـتی، بـەڵێ لـەم رۆژگـارەدا تەکنەلۆژیایەکی زۆر گەورە بەدەستی‌ئەم شارستانیەتی‌یەوە هەیە کەبەئاسانی دەتوانێ دووریەکانی پێ نزیك بکاتەوە وە دەست بەسەر دونیادا بگرێ بەخۆشی یان بەترشی.

## ٢- ئامانج و مەبەستی جیهانگیریی:-

ئایـا ئامـانجی جـیهانگیریی چـیە؟! وە ئایـا جیهانگیریی دەیەوێت چی بکـات؟ دیـارە ئاشـکرایە نێوەڕۆکی وشەی جیهانگیریی لەناوەکەیدا دیارە، جـیهانگیریی یـان دەست بەسەرداگرتنی جیهان‌و گرتنەوەی جیهان‌و خستنە ژێـر کۆنترۆڵـی خـۆی جـیهان[٧٤]، بـەڵام بـۆ ئـەوەی کـە لـە دەمی ئەهلی جیهانگیریـیـیەوە قسـەکان وەربگـرین بەپێویسـتی دەزانم گـوێ لەدووکـەس لەسیاسـەت مـەدارو بیریـارو نووسـەری ئەمەریکایی ڕابگرین، کەیەکێکیان بریتی‌یە لە (فەرەنسیس فۆکۆیاما) کەبە ئەصڵ (یابانی)یە بەڵام دوایی بۆتە ئەمـەریکی وە ئێسـتا وەك ئینسـانێکی ئەمـەریکی خۆی دەناسێنێ، ئەو کابـرایە کتێبـێکی داناوەو بەعەرەبی تەرجەمە کراوە، بەناوونیشانی (نهایـة الـتأريخ وخـاتم البشـر) واتـە: (کۆتـایی مێژووو مرۆڤی کۆتایی)یان (نهاية الـتأريخ والإنسـان الأخـير) لەسـاڵێ ١٩٩٣ ئەو کتێبە چاپ کراوە جا دیارە (فۆکۆیامـا) لـە ژێـر کاریگـەریی‌و تەئسیری خەڵکی پێش خۆیەوە هەندێك قسـەی کـردوە، بـەڵام لەهەر کەسە شتێکی وەرگرتوەو فەلسەفەیەکی نوێی لێ بنـیات ناوە کەدەیەوێت (تـنظير) بکات بۆ ئەم دیاردەی سیستەمی نوێی جـیهانی یـان ئـەو دیـاردەی (گلۆبالیزەیشن) وە دەیەوێ ئیسپاتی بکات کە

---

٧٤) کەواتە: (جیهانگیریی) بریتی‌یە لەهەوڵدان بۆ کۆنترۆڵ کردن‌و داگیر کردنی جیان بەهەموو ڕەهەندە جیا جیاکانی کۆنترۆڵ کردن‌و داگیر کردنەوە.

ئـەو سیسـتەمو دیاردەیـە شتێکی حەقو ڕەوایەو لەئەنجامی گەشەسەندنو بـەرەو پـێش چـوونی بەشـەریەتەوە پـەیدابووە، وە پێویسـتە هەموو لایەك باوەشـی بۆ بگرنەوەو تەسلیمیبن، چونکە حاڵ لەوە پێشکەوتووترو سیستەم لـەوە چـاکتر نـەبووەو ناشبێ!! دیارە پوختەی قسەکانی (فۆکۆیاما) ئەوەیە کـەمن عـەزرم کـردن، وەشایانیباسـە (فۆکۆیامـا) زیاتـر لـە ژێر تەئسیری فەلسـەفەی (هـێگڵ) دایـە کە بۆ خۆشی لەکتێبەکەیدا ئاماژەی پێدەکات، هـەروەها کـەمو زۆر سوودیشـی لەهـەرکام لـە (مـارکس)و (داریـون) و (نیتشـە)یـش وەرگرتوەو،هەر کام لەوانەو بیرو بۆچوونەکانیان چەند شتێکی وەرگـرتوە کە لەگەڵ بۆ چوونو ئارەزووی ئەودا دەگونجێو سەرەنجام لەهەموو ئەوانە ئەو بیردۆزەی خۆی پێکهێناوە.

وە ئـەوەی جـێی سـەرنجو تـێڕامانە ئەوەیـە کەهـەرکام لـە (هـیگڵو مـارکسو نیتشـە) ئـەڵمانی بـوونو، کەئەڵمانیەکانـیش دەستپێشـخەری هـەردووك شـەڕی جیهانی یەکـەمو دووەم بوون بەتایبەتی جەنگی جیهانی دووەم کەهیـتلەرو بـۆ چوونە توندڕەوو شۆڤێنیەکانی دیگوت دەبێ هەموو گـەلانی دونـیا لەخـزمەتی (نازیسـم) دابـن، ئەمـەش دەسـتە چـیلەی هەڵگیرسـانی شەرەکە بوو، جا (فەڕنسیس فۆکایاما) مەسەلەی کاریگەریی (ڕۆحو ئایدیـا) لەسـەر مـاددەی لـە (هـیگڵ)و دژایـەتیو پێکەوە ناکۆکی شـتەکانو گەشـەکردنو بـەرەو پـێش چـوون لەئـەنجامی ئەو ناکۆکیەدا له (مـارکس) هـەندێك بـیرو بۆچونیسـتەمکارانەو دیکتاتۆریانەشی لە نیتشە وەرگـرتوون: بـۆ وێنە (نیتشە)ی ئەڵمانی بڕوای وا بووە کەیەکسانی لەنێوان دەسـەڵاتدارو بـێ دەستەڵاتاندا لە بەرانبەر یاساو دادگادا زوڵمو ستەمێکی بـێ جـێو بـێ مەعـنایەو مایەی بەرەو پێش نەچوونی ژیانو مردنی تواناو ئامادەییە ناوازەکان (الاستعدادات الخارقە)ە: هەروەهاپێی وابووەکە نابێو زوڵـمو ستەمە کە دەوڵەمەندەکان لەگەڵ هەژارەکان دا یەکسان بن، وە دەڵێ

دادگــەری ئەوەیــە کەئــەوەی دەســەڵاتدارە بەکــەیفی خــۆی دەســتەڵات بەکاربهێــنێ، ئــەوە کە دەوڵەمەندە بەکەیفی خۆی بەبێ هیچ قەیدو بەندێك بەهــەرە وەربگــرێ لــەپارەو ســامانیخۆی، فەقیرەکــەش دەمــرێ بــا بمــرێ کەیفیخۆیــەتی!! ئــەوە نــیوەڕۆکی فەلســەفەی (نیتشە)یە وەلە (داریۆن)یش مسەلەی (مانەوەی بۆ بەهێزتر) یان (مانەوە بۆ چاکتر) (البقاء للأقوی) یان (الـبقاء للأصـلح) کــە ئــەوە یەکــێکە لــە گرنگترین بنەمایەکانی بیردۆزەی (داریۆنــیزم) و (فۆکۆیاما) لەویش ئەوەی وەرگرتووە، وە سەرەنجام فۆکۆیاما هاتۆتــە ســەر ئــەو قەناعەتەو کتێبەکەی هەموو لەوەدا خولاًسە دەبێتەوە - دیــارە شــتی تریشــی تــێداهەیە بــەڵام ئەوەیکــە ئــێمە مەبەســتمانە-کــە: شارســتانییەتەکان هــەموویان کەئــەنجامی بــەرەو پــێش چــوونی ژیــانو گەشــەکردنی بەشــەرن هەموویان مردوونو لەبەین چوونو یاخود بەرەو مردن دەچــن هــەموو شارســتانیەتەکانی دنــیا بەگشــتیو بەتایــبەتی رۆژهــەڵات بەئیسلامیشــەوە!! وەدەڵــێ فیکرو سیاسەتو عەقڵی بەشەر خولاسە بۆتەوە لەشارســتانیەتی رۆژئــاوادا کەلە (دیموکراسیو لیبرالیزم)دا خۆی دەبینێتەوە! وە (فۆکۆیامــا) قەناعەتی وایە دەڵێ: دەبێ هەموو بەشەریەت بێتەسەر ئەو فــیکرەو ڕێــبازە وەهــەموویان لــەدەوری (کاپیتالیزم) کۆبینەوە چونکە هیچ فیکرەو ڕێبازێکی دیکە شایستەی ئەوە نییەو بەکەڵکی ئەوە نایە کە ژیانی لەســەر بگوزەرێنرێ وە (فۆکۆیاما) قەناعەتیوایە دەڵێ ئینسانی ژێر سایەی جــیهانگیری چــاکترین ئینســانە، بۆیــەش نــاوی لێناوە (خاتم البشر) دوامین ئینســان، وەباشــترین ئینســان وەك چۆن دەگوتــرێ (ســۆپرمان)واتە دەڵێ: باشــترین ئینســان ئەو ئینسانەیە کەلە ژێر سایەی عەولەمەو جیهانگیرییدا پــێ دەگــات، وە دەڵــێ: لــەو قۆناغەدا مێژوو یەکجاری ڕادەوەستێت، دیارە (مــارکس)یــش بــڕوای بەڕاوەستانی مێژوو هەبووەو (هیگڵ)یش بڕوای پێی هــەبووە کەمــێژوو دەبێــت نیهایەتــێکیهەبێ، بــەڵام (مارکس) پێی وابووە

بەپەیدابوونیکۆمــەڵگای (کۆمۆنیســتی) مــێژووی بەشــەریەت ڕادەوەســتێ کەچــی (فۆکۆیامــا) بەپێچــەوانەوە دەڵــێ: نەخێر بەپەیدابوونی کۆمەڵگای ســەرمایەداریی وە بــەحاکم بوونی ئەو سیستەمەی کەئەمڕۆ لەشارستانیەتی ڕۆژئــاوادا بەسیســتەمی ئــابووریو سیاسـیی‌یەوە، بــەوە مێژوو رادەوەستێ ئینســان دەگاتە دوایین قۆناغەکانی گەشەکردنی خۆی، بەڵام (فۆکۆیاما) کە دەیەوێــت بەڵگــە بێنێــتەوە بــۆ ســەلماندنی راستی قسەکانی بەبۆچوونی من کەتەماشــای کتێــبەکەیم کــردووە بەڕاســتی ئیدیعایەکی زۆر گەورەیە بەڵام بەڵگەکــەی زۆ بێ هێزە وەك چۆن کەسێك قسەیەکی زۆر گەورە دەکات بەڵام دوایــی کەدێــتە ســەر بەڵگــە بەڵگەکــەی زۆر بچووکە!! بەهێزترین بەلگەی (فۆکۆیامــا) ئەوەیــە کــەدەڵێ: مادام لەلایەکەوە یەکێتی سۆڤیەتو بلووکی ڕۆژهــەلاتو شارســتانیەتی (سۆســیالیزم) هەرەســی هێــناوە وە لەلایــەکی دیکەشـــەوە ئێســـتا ڕەقیـــبو مونافیســـێکی زۆر بـــەقووەت لەبـــەردەم شارســتانیەتی ڕۆژئــاوادا نی‌یــە، کەواتــە ئــەم واقــیعە دوایــین قۆناغــەو ئەم شارســـتانیەتەش دوایـــین شارســـتانیەتەو، هـــیچ هـــێزێکی دیکـــەو هـــیچ شارســـتانێتی دیکــە پــەیدا نابێــت کــە جــارێکی دیکــە لــە بەرانــبەر ســەرمایەداریو لەبەرانــبەر ئــەو فەلســەفەو سیســتەمەدا کــە لە ڕۆژئاوادا حاکمــە خــۆی بگــرێ! پــێموایە ئەو قسانەش بێجگە لەحاڵەتێکی لەخۆبایی بــوونو خۆبەزلگــریو خــەڵك بەکــەم گرتن بەولاوە چی دیکە نی‌یە، ئەم خۆ بەگەورەگــرتنو خــەڵك بەکەم سەیرکردنەش کە لە کتێبەکەی (فۆکۆیاما)دا دەبیــنرێ، دیــارە لەتصــریحاتو لــە قســەو لــێدوانی گەلــێك لەبیرمــەندو سیاســەتمەداری دیکــەی ئەمــەریکیو ئــەوروپایش بیســتراون، ئەم حاڵەتو ڕۆحیەتی خۆپەسەندیەش دیسان ریشەیەکی قوولێ هەیە لەمێژووی ڕۆژئاوادا هــەر لەســـەردەمی (ئـــیغریقی)و یۆنانـــیەکانەوە تائێســـتا! بۆنموونـــە: (یۆنانــیەکان)بەغەیــری خۆیانــیان دەگــووت: (بەربــەریی) واتــە وەك بڵــێی

خـێڵەکیو دەشـتەکیو بـێ ئاگـا، وە دووەم کـەس کەباسـی جـیهان گـیری (گلۆبالیزەیشن)ی کردووەو ویستوویەتی تەنظری بۆ بکات بەڵام بەشێوەیەکی دیکـە بریـتیـیە لـە (صـموئیل هانتیگـتون) کە ئەویش دیسان کابرایەکی ئەمەریکییەو لەساڵێ ١٩٩٦ کتێبێکی چاپ کردووە کەبەعەرەبی تەرجەمە کـراوە بـەناوو نیشـانی (صـدام الحضـارات) یـان (صـراع الحضـارات) (خۆبەیـەکدادانی شارسـتانیەتەکان)یان (ململانێی شارستانیەتەکان) شایانی باسیشـە کـە (صـموئیل هانتیگـتون) کابـرایەکی جوولەکەیـەو مامۆستای زانـیارییە سیاسـیەکانە لـە زانکـۆی (هارفـارد)کە زانکۆیەکی بەناوبانگە، جائەمـیش واتە (هانتیگتون) هەردەیەوێت خەڵك بگەیەنێتە هەمان ئەنجامو قەناعـەت کـە (فۆکۆیامـا) دەیەوێـت بیانگەیەنێت کەبریتییە لەوەی دەبێ شارستانیەتی رۆژئاوا کە ئێستا لە (عەولەمە)دا خۆی دەبینێتەوە حاکم بێت بەسـەر هـەموو دونـیادا! بـەڵام (هانتیگـتون) بەشـێوەیەکیدیکەو بەمیکانیزمـێکی دیکـە دەیەوێـت بگاتـە ئـەو ئەنجامـەو دەڵـێ وانییـە کەشارسـتانێتی تەنـیا شارستانێتی رۆژئاوا بێت، بەڵکو شارستانێتی تریش هـەن، پاشـان چـەند شارسـتانیەتێك دەژمێرێت کە ئێستا هەن، هەندێکیان بەقوەتـەوەو هەندێکـیان بە لاوازی، بەڵام دوانیان تێدا دەست نیشان دەکات کـە (شارسـتانێتی چـین)وە (شارسـتانێتی ئیسـلامیی)یەو دەڵێ ئەم دووانە بەهـێزن بەتایـبەتی ئەگـەر یـەك بگـرن ئـەوە شـەڕێکی زۆر گـەورە لەگەڵ شارسـتانیەتی رۆژئـاوادا بـەرپا دەکـەن، جـا (هانتیگـتۆن) بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەخۆ جـیهانی رۆژئاواو سەرمایەدار هان دەدا لە دژی شارستانییەتی (ئیسـلامیو چـینی) کەبەر لەوەی ئەوانە گەشە بکەنو وەك پێویست لەسەر پـێی خۆیـان بوەستنو یەکتر بگرن پێویستە ئەمەریکا خەمێکی خۆی بخوات (هانتیگتۆن) زۆر تەرکیز دەکاتە سەر ئەوەی ململانێی شارستانیەتەکان هەر بـوەو هـەر دەشـبێتو بەردەوام دەبێت، دیارە ئەویش دەڵێ: باشترین شتێك

کەبەشـەریەت خـەوی پێوە بینیوە ئێستا هاتوتەدی ئەو جیهانگیریی‌یەو ئەو سیسـتەمو وەزعەیـە کـە ئەمـڕۆ لـەرۆژئاوادا بەرقەرارە، وەدەڵێ: بۆ ئەوەی بەهـێزەوە بمێنێتەوە پێویستەزۆر لەخۆ وریابێت، بەتایبەتی‌لەم دوومونافیسە شارسـتانیەتی ئیسلامی‌و شارستانیەتی چینی، دیارە (هانتیگتۆن) هەندێك شـتی دیکەشـی هەیـە کەجـیاوازە لـەهی (فۆکویاما)، بۆ وێنە: دان بەسێ حەقـیقەتدا دەنـێ یەکـەم: کـە جگـە لەشارسـتانێتی رۆژئـاوا شارسـتانێتی‌دیکەش هـەن، دووەم: کەجـیهانی رۆژهـەلات بەعالـەمی ئیسلامیشـەوە هـیچ کاتـێك تەسـلیمی جیهانی رۆژئاوا نابێ، چونکە پاش خـانی، فکـیری‌و فەلسـەفەیان بـۆ ژیـان‌و تێروانینـیان بۆ ژیان جیایە لەهی رۆژئـاوا بۆیـە تەسـلیم نـابن، بـەڵێ ئیستفادە دەکەن لە تازەگەریەك کە لە ئەوروپاداولـەرۆژئاوادا هەیە،بـەلاّم دەڵـێ: هەرگـیز (تغـرب) ناکـەن واتـە ژیانی‌مـاددی خۆیـان بـەرەو پـێش دەبـەن‌و نوێ دەکەنەوەو بەهرە وەردەگرن لەتەکـنەلۆژیای رۆژئـاوا، بەلاّم ئامادە نین کەتەسلیمی فەلسەفەو سیاسەتی رۆژئـاوا بـبن. سـێ‌هەم: بێ داری‌و هۆشیاری ئیسلامی نیشانەی بوژاندنەوەو زیـندووبونەوەی مسـولمانانە، وە دەڵـێ: ئـەو هەڵسـانەوەو هۆشـیاری‌یە ئیسـلامیە کـە لەعالـەمی ئیسـلامی‌دا هەیـە ئـەو حاڵەتـە بریـتی‌یە لەبوژاندنـەوەی ئیسـلامی. کەواتـە ئەگـەر لەقسەو تصریحاتی ئەو دووانەوە تەماشـای جـیهانگیریی بکـەین، وەشـایانی باسیشـە کـە بـەڕای ئەوانـەی پشـتگیری دەکەن لە (گلۆبالیزەیشن) ئەو دووانە بە دوونوێنەری‌شارستانێتی رۆژئاواو دوو بیریاری زەبر بەدەستی ئەم حاڵەتو دیاردەیە دەزانن، دەگەینە ئـەو ئەنجامـەی کەجیهانگیریی رۆژئاوا دەیەوێ خەڵکی دونیا بەخۆشی یان بەترشـی تەسـلیمی بـن، جـا هەرچـی (فۆکۆیامـا)یـە دەڵێ: سەرجەم ئەو خەڵکانـە بـۆ خۆیان دەتوێنەوەو ئەوەیان لەباراندا نی‌یە کەلەسەر پێی خۆیان بوەسـتن بـەلاّم (هانتیگتۆن) دەڵێ: نەخێر دەبێ بەزۆر ملیان پێ کەچ بکرێ،

هەرکەسێك سەری بڵند کرد دەبێ لەسەری بدرێ بۆ ئەوەی ئەم شارستانێتی‌یە بمێنێتەوە واتە هەردووکیان دەیانەوێت خەڵك بگەیەننە ئەو قەناعەتەو ئەو ئەنجامە کە دەبێ حەتمەن شارستانێتی رۆژئاوا بەسەر هەموو گەلو میللەتانی جیهاندا فەرمان ڕەواو کوێخاو باڵا دەست بێ پێویستە ئەوەش بگوترێ کەمەسەلەی جیهانگیری پێشتریش واتە پێش روخانی یەکێتی سۆڤیەتیش لەزاری زۆر لەسیاسەتمەدارانی ئەمەریکا بیستراوە بۆ وێنە: (روزفلت) سەرۆکی ئەمەریکا ئەوکاتە پاش کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم لێیەوە نەقڵ کراوە کە گوتویەتی: ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە جیهان بەئەمەریکایی بکرێ، (الان یجب أمركة العالم)، هەروەها (ئیزنهاور)یش لەساڵی ١٩٥٢ وەك (حسن قطامش)[٧٥] لەهەردووکیانەوە نەقڵ دەکات گوتویەتی: قەدەر ئێمەی هێناوە (واتە میللەتی ئەمەریکای هێناوە) کەقیادەی دونیا بکەین!، کەواتە ئەو بیرۆکەی کوێخایی کردنە بەسەر دونیاداو دونیا خستنە ژێر ڕکێفی خۆ، لەپاشخانی فیکری خەڵکی ئەمریکی‌و بەڵکو خەڵکی رۆژئاواش دا بەگشتی ڕەگو ڕیشەیەکی قووڵی هەیە.

## ٣- پاساوو بیانووی جیهانگیریی:-

بەڵگەو پاساوەکانی‌جیهانگیریی ئەمەریکاو رۆژئاواش بەگشتی چەند شتێکیان بەدەستەوە هەیەبۆ شەرعیەت پێدانی‌ئەو جیهانگیریی‌و سیاسەتەی خۆیان کە جارێك پێی دەڵێن جیهانگیریی‌و جارێك پێی دەڵێن سیستەمی نوێی جیهانی وەك:

---

٧٥) بڕوانە (نهاية الجغرافية، سيادة الدولة أم سيادة العولمة) حسن قطامش.

یەکەم دەڵێن ئێمە دەمانەوێت دیموکراسیی بسەپێنین![76].

دووەم: دەڵـێن ئـێمە لەسـەر مافەکانیمـرۆڤ وەدەنـگ دێـین، ودیفـاعی لێ دەکەین.

سێیەم: دەڵێن: ئێمە دژی تیرۆرو ئیرهابینو دژایەتی دەکەین.

چـوارەم: دەڵـێن نابـێ هـیچ میللەتـێك بچەوسـێتەوەو دیفـاع لـە مـافی چارەنووسی گەلان دەکەین.

پێـنجەم: مەسەلەی خۆشگوزەرانیو دابین کردنی مەدەنیەتو ڕوفاهییەت بۆ خـەڵكو کۆمەلگا، بەڵی ئەوانە چەند پاساوێکی ڕەواڵەتینو چەند دروشمێکن کەجـیهانی ڕۆژئـاوا بـەرزیان دەکاتـەوە بـۆ شـەرعیەت پـێدانیدیاردەی جیهانگیریی وەك پۆششێك بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجو مەرامانەی کەلوتکەی ئاواتـیانە بـەلاّم بەڕاستی ئەگەر لەدونیای واقیعدا لەو درووشمانە ورد بینەوە دلّنـیا دەبـین کەئەمـەریکاو ڕۆژئـاوا لەگەڵـیان ڕاست نین، دیارە ئێمە چەند کۆڕێکمـان تـەرخان کردوە بۆ توێژینەوەی هەرکام لەدیموکراسیو مافی مرۆڤ و تـیرۆرو (کـا)و (دان) یانمـان لەیەك جیاکردۆتەوە، بەلاّم لێرەدا مەبەستمان ئەوەیـە کەچاوپۆشـی لـەوە بکـە تـا چ ڕاددەیـەك لـەخودی خۆیـان دا چ تێبیـنیيەکەمان لەسـەر هـەر کـام لەو دروشمانە هەیە کە بێگومان ڕەخنەو تێبیـنیمان لەسەر دیموکراسییەتو لەسەر مافی مرۆڤ (زاراوەی مافی مرۆڤ لـەڕۆژئاوادا)و لەسـەر مەسـەلەی دژایەتی تیرۆر هەیە، جاجگە لەتێبییمان لەسـەر مانـاو نـێوەڕۆکی خـودی ئـەو دروشمانـە، بـەلاّم دیسان ئەو زاراوەو دروشمانـەش بەچـەند شـێوەیەك بەکاردێـنن وەکـو کوردەواری خۆمان دەڵێن (بانـێكو دوو هـەوا بـەڵکو بانـێکەو چـەند هـەوا) بۆ وێنە خەڵکی شیشان

---

٧٦) دیارە سەپاندنی دیموکراسی خۆی لەخۆیدا شتێکی سەیرە، چونکە ئەگەر ڕاست بێ دیموکراسی (حکومی گەل) بێت، دەبی گەلو میللەت خۆی بیخوازێو هەولّی چەسپاندنی بدات، نەك لەدەرەوەی ئیرادەی خۆیەوە بەسەریدا بسەپێنرێ.

بەرەگـەز ڕووسی نین، دینیان لەگەڵ ڕووسەکان جیایە میللەتێکی سەربەخۆن ئیـنجا دانیشـیان بـۆ پێدا هێنرا کە کیانو دەوڵەتێکیسەربەخۆیان هەبێت، کەچـی ئێستا ڕووس بەتۆبزی دەیان هێنێتەوە ژێر ڕکێفی خۆی و قەتڵعامیان دەکـات، بـەڵام ئەمـریکا هـەر ناوچـاوانیش گـرژ ناکـات، بـەڵام تەیمووری ڕۆژهـەڵات لەگـەڵ ئەندۆنووسـیا یەك قەومن بەڵێ زۆربەی خەڵکی تەیموری ڕۆژهـەڵات (نەصـرانی)ن، ئـەویش کـاتی خـۆی هـەر مسوڵمان بوون، بەڵام کـرانە (نصـرانی) کـە چی لەم حاڵەتەیاندا بەپێچەوانەوە ئەمەریکا (تدخل) دەکـاتو دەڵـێ: دەبـێ تـەیموری ڕۆژهـەڵات سـەربەخۆیی (الاستقلالیة) ی بدرێـتێ!؟! چـونکە ئەندوونووسـیا وڵاتـێکی مسـوڵمان نیشـنەو گەورەترین وڵاتـی ئیسـلامیە کەنزیکەی (دووسەد ملیۆن٠ ٢٠٠,٠٠٠,٠) کەسە لە ( ٩٠٪) ی زیاتر مسوڵمانە بەڵام لەولاوە چونکە بەپێچەوانە ڕووسیا وڵاتێکی نامسـوڵمانەو (شیشـان)یش میللەتێکی مسوڵمانن بۆیە ئەمەریکاچاو لە شیشـانو مـافو چارەنووسیان دەپۆشیو لەسەر مافی چارەنووسی تەیمور وە دەنـگ دێـت، ئیـنجا هـەرکام لەمەسـەلەی مافـەکانی مـرۆڤ ، مەسەلەی دژایـەتی کـردنی تیرۆرو ئیرهابیش بەهەمان شێوە تەماشا دەکەین جوولەکە چـی دەکـات بەمسـوڵمانانی فەلەسـتین، هـەروەها هیندیەکـیان چ دەکـەن بەکشمیریەکان، وە لەنێو خودی هیندستان دا چ دەکرێ بەمسوڵمانەکان چۆن تـێکڕای مافەکانـیان پێشـێل دەکـرێ، کەچـی ئەمـەریکا مەگـەر چۆن بۆ چاوبەسـتەکێی خـەڵك ئەگـەرنا نارەزایی دەرنابڕێو وە دەنگی نارەزایی لێ بـەرز نابێـتەوە، بەڵام لەشوێنێکی تر ئەگەر یەکێك لە کورەکەی خۆی تورە بێـت یـان کەسـێك لـە دراوسـێی خـۆی تووڕەبـێ ئـەوە ئەمـەریکا مادام بەرژەوەندی لەوەدا هەبێت کەوەدەنگ بێ وەدەنگ دێ!.

## ٤- بەرهەمو شوێنەوارەکانی جیهانگیریی:-

ئەوەی کە گرنگە لێرەدا بیخەینە ڕوو بەرلەوەی بێینە سەر خستنەڕووی پەرێـزی جـیهانگیریی ئەوەیـە کە بزانین پێش پەیدابوونی ئەو دیاردەیەی کە پێی دەگوترێ (سیستەمی نوێی جیهان).

یـان پـێی دەگوتـرێ (جـیهانگیریی) ئـەو بـەرەو پـێش چـوونە گەورەیــەی تەکـنەلۆژیای کەلـە ئـەورووپاو لە رۆژئاواداو لە دونیاشداهەیە بەگشتی کە دیـارە لـە مـێژووی کۆنـدا سەرچـاوەکەی شارستانێتی ئیسلامو لە مێژووی تازەشدا ئەوروپا بوو، ئەوە بەڕاستی کاتی خۆیشی هەر هەبوو، بەڵام ئێستاو لەسـایەی جـیهانگیریی‌دا تەکنەلۆژیا زیاتر بەرەو پێش دەچێو گەشە دەکات بۆچـی؟! چـونکە ولاتـە زلهـێزەکان پـارەو ئیمکانـیەتی زیاتریان دەکەوێتە دەسـتو خـەڵکی زیاتـریش تـەرخان دەکـەن، پسپۆڕی زیاتر پەیدا دەکەنو ئەمانـەش دەوری کاریگـەریان هەیـە لـە پەرەپـێدانی تەکنەلۆژیادا ئەگەرنا پێشـتریش تەکـنەلۆژیا هـەر بـووە، ئیـنجا پەرێـزو بەرهـەمو شـوێنەواری جیهانگیریی بەم دووشێویە تەماشا دەکرێت:

أ:- لایەنـێکی چـاكو ئیجابـیی‌یە کەلە خزمەتی بەشەریەتدایەو لەخزمەتی بەرژەوەندیــیەکانی خــەڵك دایــە لەزۆربــەی بــوارو لایەنــەکانی ژیــانو گوزەراندا،کـە بـێگومان ئـا ئـەوە خێرو بەرەکەتەو شتێکە نیعمەتی خوایە. لەدەستی هەر کەسێك دابێ دەبێ سوپاسی بکەین.

ب:- لایەنـێکی خـراپو شــوومە جـیهانگیری بەرهــەمی‌ی زۆر خــراپو شــوێنەواریزۆر شــوومی لــە ژیــانی بەشــەریەتدا هەیــە هەرچــەندە جــارێ جیهانگیریـیش تــەواو دونیای نەخستۆتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوەو ئەمەریکا جــارێ هــەر خەریکــە کــە جــیهانگیریی‌و جــیهان داگیریــیەکەی خــۆی بەســەرتەواوی دنـیادا بسـەپێنێو، خۆتـان ئاگـادارن کە جارێ جیهانگیریی

تـەواوی نەبۆتـە (جـیهانگیریی)بـەڵام لەگـەڵ ئـەوە ئەو قۆناغەی کەبڕیونی بێگومان پەرێزو شوێنەواری زۆر خراپی لێدەرکەوتوون، بۆ وێنە:

یـەك: لـەڕووی سیاسـی‌یەوە:- شـتێکی ڕوونـە کەهـەر میللەتێك حەز دەکـات لـە وڵاتەکـەی خـۆی‌دا سـەربەخۆ بێت هیچ کەس زوڵمی لێنەکات، کەهەسـتی نیشـتمان پەروەری شتێکی خواڕسکەو هەستێکی فیطرییەو خوا (تـبارك وتعـالی) هەتا لەحەیواناتیشدا داینـاوە تەنانەت پەلەوەڕیش بەرگری لەشـوێن‌و هـێلانەکەی خـۆی دەکـا، بـەڵام ئێسـتا لەسایەی جیهانگیریی‌دا دەویستریٚ سەربەخۆیی وڵاتان نەمێنێ، لەڕووی سیاسیی‌یەوە ئەگەر تەماشا دەکـەین ئەمـەریکاو ئەوانـەی لەگـەڵ ئەمەریکادان چاویان بەرینایی نادات کەوڵاتێك هەبێ بڵێ، جەنابی ئەمریکا نابێ دەست بخەیتە کاروبارمەوە!! وە هـەر وڵات‌و دەوڵەتـێك لەبەرانـبەر کوێخایـەتی ومـلهوڕی ئەمـەریکادا ملـەجیڕە بکـات، بەهەر برو بیانوویەك بێت ئابڵوقەی ئابووری دەخاتە سەرو شـەڕی پـێ دەفرۆشێت‌و بەهەر شێوەیەك بۆی بلوێ فشاری دەخاتەسەر، هەر لەبەرئەوە کە لە وەڵامی‌دا دەڵێت نەء! وەبێگومان ئەو حاڵەتە سیاسیەی کە ئـێمە باسـی دەکـەین بـەزەقترین شـێوە لـەو تەصریحەی (جورج W بوش)دا بەرجەستە بوو کەگوتی: (هەرکەسێك لەگەڵ ئێمە نەبێت ئەوە دژی ئێمەیە)! جـا هەرچـەندە بـۆش ئـەو قسەیەی لەباسی دژایەتی‌کردنی‌تیرۆردا کرد بەڵام بەڕاسـتی هەرچـۆن بێ ئەو قسەیە پرنسیپ (مبدأ)ێکی گشتی‌یە، ئەو جۆرە سیاسـەتە بەتەئکـید فیرعەونایەتیـیەکی ڕووتەو دیکتاتۆریەتێکی تەواوەو هەرکەسـێك خـۆی بەئازادو جوامێر بزانێ بەهیچ شێوەیەك ناچێتە ژێر باری ئـەو مەقوولەیـەوەو بەهـیچ ڕەنگـێك تەسلیمی ئەو بیرو بۆچوون‌و سیاسەتە چـەوتە نابن، چونکە بەر لەهەموو شتێك بپرسین‌و بڵێین: جەنابی ئەمەریکاو ڕۆژئـاوا بـێ زەحمـەت تیرۆرمـان بۆ پێناسە بکە داخۆ تیرۆر چی‌یە!؟ چونکە تـیرۆر ئەگـەر بریـتی بێـت لـەوەی ئینسـانێك بـە زۆر فیکری خۆی بەسەر

کەسێکدا بچەسپێنێ‌و دەوڵەتێك بەزۆر خۆی بەسەر خەڵکێکدا بسەپێنێ‌و بیترسێنێ‌و بیتۆقێنێ، ئەوە هەموومان رەفزی دەکەین‌و راستە، بەڵام ئەگەر هاتوو هەرکەسێك دژی سیاسەتی ئەمەریکاو رۆژئاوا بوو یان دژی جوولەکە بوو یان هەرکەسێك لەبەرانبەر (گلۆبالیزەیشن) وجیهانی سەرمایەداری‌دا گوتی: نەء، یەکسەر تۆمەتی تیرۆرو ئیرهابی بدرێتە پاڵ، ئەوە شتێکی سەیرو ناڕاستەو بەڕاستی ئەوە شتێکی بێ مەعنایەو ناهەقیەکی زۆر قورسەو ئەوە بەخەڵك ناسەلمێنرێ!

ئینجا دەڵێین: بێگومان ئەو تەصریحەی(جۆرج بۆش) کەبەڕاشکاوی گوتی: هەر کەسێك لەگەڵ ئێمە نەبێت دژی ئێمەیە، بەپێی ئەو قسەیە مانای وایە ڕەنگەکان تەنها دوو ڕەنگن، یان رەش یان سپی ئینجا ئەوە وەك دوایی باسی دەکەین زۆر پێچەوانەی ئەو حیکمەتەو ئامانجەیە کە خوا (سبحانە وتعالی) بەشەریەتی بۆ خوڵقاندوەو بەشەریەتی بۆ هاندەدات، وە شەریعەتی خوای پەروەردگار دانی هێناوە بەهەموو رەنگەکانداو بەهەموو زەمانەکانداو بەهەموو شێوەکاندا، بەڵام (گلۆبالیزەیشن) دەیەوێ هەموو ئینسانەکان‌و گەلەکان بەیەك رەنگ رەنگ بکات ئەویش تەنها ئەو رەنگەیە کە بۆ خۆی دەیەوێت رەنگەکەی دیکە نابێ بمێنێ، واتە تەنانەت دان بەدوو رەنگەکەش دا ناهێنێ‌و هەر هێندەدان بەدوو رەنگەکەدا دێنێ هەتا پاساوی شەڕی بەبیانووی جۆراجۆرەوە دەست دەکەوێ، بۆ ئەوەی کەشەڕ بەو رەنگەی تر بفرۆشێ ئەگەر بەپێی ئەو سیاسەت‌و عەقڵیەتە بێ دەبێ دنیا هەمووی بەیەك رەنگ رەنگ بکرێ، جا دیارە ئەوەش پێچەوانەی سروشتی میللەتانەو پێچەوانەی ئەو حیکمەتەشە کە خوای پەروەردگار (جل جلالە) ئینسانی بۆ خوڵقاندوە کەبریتی‌یە لەوەی ئینسان لەسەر زەوی ئیمتیحان دەکرێ‌و بە ئیرادەو حیکمەتی خواش بۆ چەند گەل‌و تیرەیەك دابەش کراوە، وەبەڕاستی ئەو هەڵوێستەی ئەمەریکاو ئەو هەڵوێستەی دەمڕاستی

جیهانگیریی و (سیستەمی نوێی جیهانی) هەر ئەو قسەیەی فیرعەون دێنێتەوە یاد کەزیاتر لە پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا گوتوویەتی و قورئان بەتوانجەوە لەسەر زاری دەیگێڕێتەوە: ﴿ مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾(غافر: من الآية۲۹) واتە: (تەنیا ئەوەتان پی دەڵێم کەبۆ خۆم بەڕاستی دەزانم وە ئەوەش کەمن دەیڵێم هەر ئەو ڕاستە)، جا سەیر ئەوەیە کەعەلمانیەکان ئیسلامیەکان بەوە تۆمەتبار دەکەن و دەڵێن: ئیسلامیەکان دەڵێن: هەق تەنیا لای ئێمەیەو ئێمە قۆرخمان کردوەو لەسەر ئێمە تاپۆیەو هیچ کەسێکی دیکە هیچ حەقێکی پێ نییە، بەڵام نەخێر ڕاست نییەو ئێمە ئەوە ناڵێین، بەڵکو ئێمە دەڵێین حەق تەنیا ئەوەیە کەخوا[77] فەرموویەتی بەڵام هیچ ئیسلامییەکی تێگەیشتوو ناڵێ: منی ئینسان هەموو حەقێکم لایە بۆچی؟! چونکە ڕەنگە ئەوەی کەخوا فەرموویەتی من هەموویم وەرنەگرتبێ، یان من چونکە وەك ئینسانێك قسە دەکەم، هەڵە دەکەم یان وەك ئینسانێك کە دەمەوێ دینداری بکەم ڕەنگە بەوشێوەیە کە دین دەڵێ بەڕێوە نەچم، بۆیە ئێمە دەڵێین حەق ئەوەیە کەخوا فەرموویەتی: بەڵام هیچ کاتێ ناڵێین: ئەوەی کە ئێمە دەیڵێین هەمووی حەق و ڕاستە، وەخوای پەروەردگار زۆر بەڕاشکاوی ئەوەی خستۆتەڕوو کەهەق لەدەستی هیچ کەسێك دا کورت هەڵنەهاتووە، بەڵێ هەموو هەق لای خوای پەروەردگار (حصر)ە بەڵام کەلەخوای پەروەردگار دێتە خوار تەنانەت لەپێغەمبەرانیشدا (علیهم الصلاة والسلام) کورت هەڵنەهاتووە، بۆچی؟ چونکە ئەو زاتە بەرزانەش لەبواری مەسەلەکانی ئیجتیهادیدا، هەرچەندە خاوەنی گەورەترین و کاملترین عەقڵ و هۆشن، بەڵام دیسان دەگونجێ کەبەهەڵەدا بچن، بابۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست نمونەیەك بێنینەوە:

---

77) ئەوە کەپێغەمبەرﷺ فەرمویەتی مادام وەحی بێت هەمان حوکمی هەیە.

پێغەمــبەرﷺ لــە (صــحيح مســلم)دا لــێی دەگێڕێــتەوە کــەرۆژێك هەندێك لەهاوەڵــەکانی بیــنی تــۆوی دارخورمایــان دەبردو موتەربەیان دەکرد (تۆوی نــێرەکەیان دەبــرد بۆ سەر مێیەکەی) جافەرمووی: بۆ چی وادەکەن، گوتیان ئەگــەر وانەکــەین بەرناگــرێ فــەرمووی پێم وایە ئەگەر واش نەکەن هەر بەر دەگــرێ ئــیدی ئەوانیش دەستیان لەکارەکەی خۆیان هەڵگرتو گوێیان نەدا بەموتوربەکــردنی دار خورمایــەکان لەســەر قسەی پێغەمبەرﷺ، دوایی دار خورماکــان بــەریان نەگــرت! ئــەویش فەرموی هەرکاتێك شتێکم پێ گوتنو گوتم: خوا (جل جلاله) فەرموویەتی وەك دین ئەوە بەبێ هەر تێبینییەك لێم وەربگــرن، بــەڵام ئەگــەر شتێك گووتم وەك شتێکی دونیایی ئەوە (أنتم أعلم بــأمور دنیاکم) واتە: (ئێوە خۆتان شارەزاترن بەکاروباری دونیای خۆتان)، وە بۆی ڕوون کردنەوە کەئەو ڕێ ڕوونیەی لەبارەی پێویست نەبوونی ئەو کارەوە پــێم گوتن، تەنها وەك بیروڕاو قسەیەکی خۆم گوتم نەك وەك دینو خوا وای فــەرمووە، بــەڵێ جاهەرکات (خوا)شتێکی فەرموو دیارە حەق هەر ئەوەیە، بــەڵام ئەگەر ئینسان شتێکی گووت تەنانەت ئەگەر پێغەمبەریش بێت دەبێ تەماشــا بکــرێ چــونکە دەگونجــێ وابێــتو دەشــگونجێ وانــەبێ ەهــەندێك مەســەلەی ئــاوادا بەکورتی دەڵێم: لەڕووی سیاسییەوە بەڕاستی ئەمەریکاو جــیهانگیرییەکەی وەزعــێکی زۆر خــراپی ڕەخســاندوەو دیــەوێ زۆر بەرەو خراپتریشــی بــبات، ئــیدی خــوای پــەروەردگار بمانــپارێزیو پەنامان بدات، ئاشکراشــە کەلەڕووی سیاسیەوە ئەمەریکاو سیستەمی نوێی جیهانیلە ژێر پــەردەی نەتــەوە یەککگــرتووەکانو ئەنجوومــەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی ئەو جــۆرە دامو دەزگــا نــێو دەوڵەتیانەدا ئەو کارو جمو جووڵە سیاسیانەی خۆی دەکات.

دوو: لـەبواری ئابووریـیەوە:- ئەمەریکاو باقی دەوڵەتانی جڵەوکێشی جـیهانگیریی کـاری چەپەڵیخۆیان لەڕێی بانکی نێو دەوڵەتیو کۆمپانیا فرە رەگـەزەکانو بازرگـانی جـیهانیو هـتدوە ئـەنجام دەدەن، جا دیارە ئەوەش تەفصـیلاتو وردەکاری زۆری هەیە وە من خۆشم پیسپۆرنیم لەم بوارە بەڵام شـتێکی هـەر لیٚ دەزانم مـەجال نییە باسی ئەم تەفصیلاتە بکەین کە چۆن سیستەمی سەرمایەدارێتیو جیهانگیری دەیەویٚ خەڵك بخاتە پێشبڕکیٚی ئەو کۆمپانـیایانەی کـەوەك سـەرۆك وەزیـرانی مالـیزیا (مهاتیر محمد) گووتی: جـیهانگیرییو سیسـتەمی نوێـی جـیهانیدەیەویٚ مـیللەتانی بـیٚ هـێزو دەولـەتانی تـازە گەشـەکردوو (الـدول النامـیة) بێنێـتە مەیدانی زۆرانبازی ئابوورییو بازرگانییەوە تاکو سەرەنجام جیهانی سەرمایەدارییو جڵەوکێشی جـیهانگیریی بەئیمکانـیاتی زۆرو زەبەلاحـیانەوەو، ئەو میللەتو ولاتانەش بـەو تواناو ئیمکانیەتە کەمو کورتەیانەوە، وەك (مهاتیر موحەممەد) گوتی: وەك زۆرانـبازی نـێوان بابایـەکی خـاوەن کێشـی قورسـی (١٥٠) کـیلۆیی وبابایـەکی لاوازی (٦٠-٧٠) کـیلۆیی بێـتە بەرچاو، کەهەر لەبەرایییەوە ئەنجامەکـەی ڕوونـە، هەڵـبەتە هـەموو لایەکـیش بینـیمان کەلە ئەنجامی زۆرانـبازی فێڵـبازانەو نەخشـە بـۆ کێشـراوی سـەرمایەدارە زەبەلاحـەکانی رۆژئـاواوە چـۆن ئـابووریی تـازە گەشەکردووی ئەو شەش حەوت ولاتەی کە بەپڵێـنگەکانی ئاسیا (نمور أسیا) ناسراون هەرەسی هێناو کەوتنە گۆڕیٚ[٧٨]، وەشـوێنەوارێکی دیکـەی زۆر شـوومو خراپی جیهانگیریی، سیستەمی نوێی جـیهانی، ئەوەیـە کەهەر ڕژێمو دەوڵەتێك لێی تورە بنو لەبەر هەر هۆیەك بـیٚ بەدڵـیان نـەبیٚ هەڵدەسـتن بەئابلۆقـەی ئـابووری خستنەسەری واتە: بۆ

---

٧٨) کەبریتین لەم ولاتانە: تایلاند ، فلپین، کۆریای خوارووی، تایوان، ئەندۆنووسیا، مالیزیا،یابان ، بڕوانە (فی مواجهه العولمه) ص١٢٥/ البروفیسور، زکریا بشیر أمام.

تەمبێ کردنو بە چۆکدا هێنانی ئەو دەوڵەتانەی کە بەدڵی ئەوان ناجوولێنەوە گەلو میللەتەکانیان لەبرسان دەکوژن!! نموونەی ئەو جۆرە سزادانو شەڕ پێ فرۆشتنە مۆدێرنو تازە مۆدیلەی رۆژئاواو ئەمەریکاش وەبەرهەمو پەرێزی شوومی لەعێراقو ئێران و سوودانو لیبیادا زۆر ئاشکراو روونە وەبەرهەمو پەرێزێکی دیکەی نەگبەتو بێخێری (گلۆبالیزەیشن)و بلووکی فەلسەفەی کاپیتالیزم بریتییە لەو شێوە بازرگانییەی کە بەهیچ جۆرێك دینو قیەمو رەوشتی تێدا رەچاو ناکەن، سەرنج دەدەن چ شتێك سوودو قازانجی زیاتری بۆ ئەوان هەبێت پارەو سامانی زیاتر بڕژێتە گیرفانەکانیانەوەو لەبازاڕدا رەواجی چاکتری هەبێت، کۆمپانیاو کارگەکانیان زیاتر ئەو شتانە بەرهەم دێنن، هەرچەندە ئەوکەلو پەلو شتانە نەك هەر خەڵكو میللەت پێویستیان پێیان نەبێ بەڵکو ئەگەر گەورەترین زەرەرو زیانیشیان لێ بدەن چونکە بناغەی فەلسەفەی کاپیتالیزمو سیکلۆلاریزم کە (گلۆبالیزەیشن) لەوان پەیدابووە لەسەر بێ دینایەتیو حیساب بۆ خواو قیامەتو ویژدان نەکردنو ژیان بەماددەی رووتو ئینسان تەنها بەئاژەڵ حیساب کردن بنیات نراوە!!

بۆیە تەماشا دەکەین لەرووی ڕاگەیاندنەوە زۆر فلیمی خیلاعیو شتی خراپو بەرنامەی زۆر پیس کەبەهیچ قیاسێك و بەهیچ پێودانگێك لەخزمەتی بەشەریەتدانین، زۆر ڕەواجیان پێ دەدرێ، بۆچی؟ چونکەپارەی زیاتریان بەدواوەیە لای ئەوانیش ئەوە گرنگ نییە کەئەخلاقی خەڵکی دەڕوخێنێو دەشێوێنێو خێزان هەڵدەوەشێنێتەوەو تێك دەدات، هەروەها بەرهەمێکی دیکەی شوومی کاپیتالزم لە ژێر سایەی جیهانگیریی‌دا ئەوەیە کە جیاوازی نێوان دەوڵەمەندەکانو فەقیرەکان زۆر زۆر دەبێت هەندێك سەرژمێری سەر سوڕهێنەر هەن لەوبارەوە بۆ نموونە: (روجیە گارودی)

لەکتێبـێکی‌دا بـەناوی (نحـو حـرب دینـیة)[٧٩] کـە کتێبەکە لەفەرەنسیەوە تەرجەمە کراوە دەڵێ: لەسی ساڵی دواییدا (کتێبەکەی لە ١٩٩٦ نووسیوە) جـیاوازی دەوڵەتانی هەژارو دەوڵەمەند واتە رێژەی دەخلی ژیان (لە ١/٣٠) یـەوە لـەماوەی سـی سـاڵ دا بۆتـە (١/١٥٠) یەك لەسەر سەدو پەنجا واتە ئەوەی کە ئێستا پێی دەڵێن ولاتانی‌سەروو و خواروو (الشمال والجنوب) یانی ئەگەر کاتی خۆی هاوولاتیەکی یەکێك لەولاتانی عەرەبی مانگی دۆلارێکی هـەبووبێ‌و بابایەکی ئەورووپی رۆژئاوایی (٣٠) دۆلاری هەبوە، بەڵام ئێستا ئـەو رێژەیـە بـەرز بۆتـەوە بـۆ یـەك بۆ سەدو پەنجا، یانی ئەمەریکیەك یان رۆژئاوایی‌یـەك سـەدو پەنجا بەرانبەر کابرایەکی رۆژهەڵاتی دەرامەتی هەیەو ئیمکانـیەتی مـادی هەیـە، جـا دیـارە ئـەم سەرژمێرە لەساڵی ١٩٩٦، دا گووتوویـەتی، بـەڵام کـێ دەڵـێ ئێسـتا چـەند قـاتی دیکە بەرز نەبۆتەوە!! هـەروەها (روجـیە گـارودی) دەڵێ[٨٠]: ساڵانە لەسەر ئاستی جیهان (١٥,٥ پانـزە ملـیۆن‌و نیو منداڵ لە برسان بەهۆی ئەو نەخۆشیانەوە کە لە ئەنجامی بـەدخۆراکی‌دا پـەیدا دەبـن، دەمـرن! دیارە هەمووشیان لەولاتانی عالەمی ئیسلامی‌و ئەفەریقی‌و ولاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا دان! دیسان دەڵێ: هەروەها دەرامـەتی جـیهان ئەگـەر بکرێتەسەد بەشەوە لە (٨٣٪) لەدەستی خەڵکی رۆژئاوادایـە کەنـزیکەی لە ٢٠٪ خەڵکی دونیا پێك دێنن وە لە (١٧٪)یش لەدەستی باقی خەڵکەکەی دیکەدایە کەرێژەی (٨٠٪)ی خەڵکی جیهان پێك دێـنن! واتە جیاوازیەکی زۆر گەورە هەروەهاگوتوویەتی: رۆژانە (٤٠,٠٠٠) چـل هـەزار کـەس بەپـێی سـەرژمێری یـەکانی ساڵی (١٩٩٦) لەئەنجامی برسێتی‌و بەدخۆراکی دا دەمرن.

---

٧٩) (نحو حرب دینیة)ص١١.

٨٠) سەرچاوەی پیشوو ص١١.

سێ: لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بەتایبەت لە بواری خێزان دا تەماشای پەرێزو شوێنەواری جیهانگیریی بکەین دیسان شتی زۆر خراپ دەبینین بەتایبەت لە بواری لایەنی جنسیو هەڵوەشاندنەوەی خێزانو بڵاوکردنەوەی بەرهەڵدایيو ئیباحییەتدا؛بۆ وێنە: ئێستا نەتەوە یەکگرتووەکان کە زیاتر ئالەتێکە بەدەست ئەمەریکاو سیستەمی نوێیجیهانییەوە، حەوت کۆنگرەی بەستوون، بەڵام بۆ چی؟! بێگومان بۆ ئەوە نا کەبزانن ئافرەت لەکوێ کێشەی هەیە؛ یان لەکوێ ئافرەتان برسین؟! یان شیریان نییە بیدەن بەمنداڵان یان لەبەرنەداری منداڵیان پێ بەخێو ناکرێ؟ نەخێر بۆ هەرکام لەم شتانە نا، بەڵکو رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان تائێستا حەوت کۆنگرەی بەستوون لەساڵی (١٩٥٠) کەویستترا لەشاری قاهیرە ببەسترێ بەڵام میصر رازی نەبوو دوایی لەشوێنێکی دیکە بەسترا، وە لەساڵی ( ١٩٧٥) کۆنگرەی دووەم لە (مەکسیك) بەسترا، هی سێیەمیش لەساڵێ ( ١٩٨٥) لە (بەیروت) بەسترا، وە لەساڵی (١٩٩٤) لە قاهیرە کۆنگرەی چوارەمو پاشان کۆنگرەی پێنجەم لەساڵی (١٩٩٥) لە پەکینو لەساڵی ( ١٩٩٦)یش لە ئەستەنبوڵ کۆنگرەی شەشەمو وەلەساڵی (٢٠٠٠) لە نیویۆرك کۆنگرەی حەوتەم بەسترا، بەڵام ئایا ئامانجی بەسترانی ئەو حەوت کۆنگرەیە چیبوو؟! بۆ ئەوە سەرجەم ئەو وڵاتانەی لەو کۆنگرەیەدا بەشدار دەبن ئەم شتانە بسەلمێنن:

١- هەرکاتێك ئافرەت بەبێ شووکردنیش منداڵی بوو بۆی هەیەو هیچ کەس هەقی گلەیی نییە، بەڵکو دەبێ دەوڵەت منداڵەکەشی بۆ بەخێو بکات!

٢- بۆ ئەوەی کەهەم پیاو لەگەڵ پیاو بۆیان هەبێ لەگەڵ یەك خێزان پێکەوە بنێنو وە هەم ئافردتو ئافردتیش بەهەمان شێوە!.

٣- بۆ ئەوەی کەئینسان بۆی هەبێ جینسی خۆی بگۆڕێ، پیاو خۆیبکات بەژنو خۆی عەمەلیات بکات، وە ژن خۆی بکات بەپیاو.

هەروەها بۆ گەلێك ئامانجی دیکەی لەو جۆرە هەموو ئەو کۆنگرانە بەستراون، ئینجا ئایا جیهانگیریی لەپشت ئەو کۆنگرانەوە چی کردوە بۆ ئەوەی سەرو بەربگرن؟! گوتویانە: هەر دەوڵەتێك ئامادەبێ ئەو شتانە بسەلمێنێ، قانوونی خۆی بگۆڕیو دەستووری وڵاتەکەی بگۆرێ ئێمەش یارمەتی دەدەین لەرێی بانکی نێو دەوڵەتیو صندوقی دراوی نێو دەوڵەتیو لەرێی رێکخراوی بازرگانی جیهانیو ئەوانەی هاوکاری دەکەن، هەرکەسێکیش ئەوانە نەکاتو نەچێتە ژێر باری ئەو شتانەوە ئەوە ئێمە هیچ هاوکاری ناکەین سزایشی دەدەین بەتایبەتی لەدوای ساڵی (٢٠٠٠)وە زۆر بێ شەرمانە زۆر بەزەقی هاتۆتە نێو ئەو مەیدانەوەو دەیانەوێت زۆر بەجیددی ئەو مەسەلانە بکەن بەقانوون لەهەموو وڵاتاندا بۆیە ئێستا ڕەنگە خەڵکێك هەبێ کەدەبینێ خەڵکی رۆژئاوا دژی جیهانگیریی دەوەستنەوە بڵێ باشە ئەوە خەڵکی ئەوروپا کە لەو ژیانە خۆشەدا دەژین لە ژێر سایەی جیهانگیرییدا ئەوە بۆچی خۆپیشاندان دەکەنو دژی دەوەستن؟ بەڵام نەخێر ئەو خەڵکە شێت نینو ئەوان دەزانن، خەڵکێك هەیە ویژدانێکی هەیە، ئەخلاقیکی هەیە، شەهامەتێکی ماوە دەزانێ کە ئەو جیهانگیرییە سەری بەکوێ دەگات بۆ وێنە: کە لەپەرلەمانی وڵاتێکی ئەوروپیدا بەئاشکرا باسی ئەوە دەکرێ: بەڵێ پیاو بۆی هەیە لەگەڵ پیاو خێزان دروست بکاتو مارەی بکاتو ژن لەگەڵ ژنو ئینجا کچ پێش ئەوەیمێردی کردبێ بەپێی ئەو رێبازو دینەی خۆیان بۆی هەبێ منداڵی ببێ وە دەوڵەتیش منداڵەکانی بۆ بەخێو بکات، وەکچ لەقوتابخانە نابێ کەس رێی لێبگرێ ئەگەر (حاملة) بوو بێ ئەوەی کەشووی کردبێ، هەر بۆیە ئێستا هەندێك لەوڵاتانی ئەوروپی رێژەی منداڵی بێ باوك واتە رێژەی ئەو منداڵانەی کەزۆڵن گەیشتوونە (٧٥

٪)، بەڵێ بۆ دژایەتی ئەوشتانەیە کەئەو خەڵکە نارەزایی دەردەبڕنو خۆپیشاندان دەکەن، ئینجا پێویستە بزانین کە ئەو جۆرە کەسانە وەنەبێ مسوڵمان بنو ئیسلامەتی پاڵیان پێوەبنێ، بەڵکو هەر فیطرەتو عەقڵو ئەزموونو دووربینی خۆیانە، چونکە تەماشا دەکەن ئەو وەزعەیان سەری بەزۆر شتی ترسناك دەگات، جاچۆن ترسناك نییە خۆ ئەگەر بەو پێیە بێ ئەگەر خەڵك هەمووی قەرار بدات پیاو لەگەڵ پیاو ژن لەگەڵ ژن جووت بنو خێزان دروست بکەن خۆ وەچەی بەشەر هەر یەکجاری دەبڕێتەوە لەسەر زەوی هەر هەموو بەشەریەت قڕ دەبێت!!

بەڕاستی جیهانگیریی لەڕووی کۆمەڵایەتیو کلتووریو فەرهەنگیو ئەخلاقیەوە پەرێزی شوومی زۆرە، بۆ وێنە: مۆدێلاتی سەیرو عەجایب لەبەرگو پۆشاکیئافرەتان، لەوەسائیلی خۆپێ جوانکردن، یان جۆرەها کەلو پەلی دیکە کەبەکاری دێنن مۆدێل لەسەر مۆدێل کارگەو کۆمپانیاکان بەرهەمیان دێننو ئەو ئافرەتانەی کە پێیان دەگوترێ شاجوان (ملكة الجمال) کەساڵانە بەو بیانووە ئاهەنگو میهرەجانی زۆر گەورە گەورە ساز دەکرێنو مەسرەفی زۆری بۆی دەکرێ پارەی زۆری بۆ تەرخان دەکرێ بۆچی؟! بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە پێشبرکێ بکات لەو مەیدانەداو ئافرەتەکان هەرچی زیاتر خۆیان بڕازێننەوەو جوانی خۆیان دەربخەن بەپێی ئەو شێوازو پێوەرەی کەجیهانگیری دای دەنێ بەپێی ئەو نەخشانەی کەئەو دەستە پەنهانانەی لەپشت کارگەو کۆمپانیاکانەوەن دایان دەڕێژن کە زیاتر دەستی جوولەکەو دەستی سەرمایەدارە زلەکاننو دەیانەوێ ئافرەت بکەن بەبووکە شووشە، جائافرەتیکلۆڵ دەبێ هەر جارە بەنەوعێك خۆی بگۆڕێ بۆ چی؟! چونکە مۆدێلەکەی گۆڕاوە پاشان دەبێ ئەم جۆرەیان لەبەر بکات، نەخێر ئەو جار دەبێ ئەوەیان بگۆڕێ؟ بۆ چی؟ چونکە ئەو مۆدێلەش گۆڕاوە، ئیدی بەو جۆرە مەسرەفێکیزۆرو زەوەند لەڕووی ئابوورییەوە، وەپاشانیش هاڕینو

تەدمیرکـردنی شەخصـیەتی ئافـرەت کـەدەبێ تەماشـا بکـات خـەڵك چۆن پێیسەرسـام دەبێ چۆن بەجوانی دەزانی وا لەخۆی بکات، کەهەندێك جاران خـۆ جوانکـردنەکەی پێچـەوانەی فـیطرەتو سروشتیشـیەتی چـونکە خۆجوانکـردن ئەگـەر ئیمتـیدادی جوانـی سروشـتی بێت شتێکی سروشتیو ئاسایی‌یە، بەهەر حاڵ بۆ وێنە: ئافرەت ئەگەر نینۆکی خۆی سوور بکات یان لـێوی سـوور بکـاتو بـەڵام نینۆك ڕەشکردن یان نینۆك زۆر درێژکردن یان پشـتی چاوشـین کـردن، هـتد ئـەو جۆرە دەستکاریی خۆکردنانە پێچەوانەی فیطرەتنو پێچەوانەی جوانی خوا ڕسكو سروشتیە.

چـوار: لـەڕووی فـیکریو فەرهەنگی‌یـەوەك- جـیهانگیریی دەیەوێت دیکـتاتۆری فکیریـی بەسەر دونیادا بەرقەرار بکاتو چەند بیرو بۆچوونێکی تەبەنـنی کردوون هەرکەسێك ئەو بۆچوونو فکیرانە قبووڵ نەکاسزای دەدات: واتـە دەبـێ تـۆ پێناسـەی تـیرۆر بەوشێوەیەی کەئەمەریکا دەیەوێ قبوولێ بکـەی وە ئەگـەر قبوڵی نەکەی ئەوە تووشی سزاو گرفت دەبی، وە دەبێ تۆ ئـەوە قـبووڵ بکەی کە ئەگەر جوولەکە چەکی کۆمەڵ کوژیو ئەتۆمی هەبێ زۆر ڕەوایـە بەڵام ئەگەر پاکستانێك هەیبێ یان شوێنێکی دیکە هەیبێ ئەوە ناڕەوایـە بۆچـی؟! چـونکە ئیسرائیل، ئیسرائیلەو لەخزمەت ئەمەریکادایە، بـەڵام وڵاتێکیئیسـلامی نابـێ چـەکێکی وای هەبێـت کەمایـەی مەترسی جوولەکەو نیگەرانی ئەمەریکاو رۆژئاوابێ، بەڵی ئەگەر بتەوێ نەکەویتە بەر تووڕەیـی ئەمـەریکاو جـیهانگیریی دەبـێ ئـەو شـتە ناهەقیانە بسەلمێنیو قەناعـەت بـەخۆت بێـنی ئەگـەرنا تۆ تووشی سزاو جەزرەبە دەبیو تووشی ئابلۆقـەی ئـابووری دەبـی: بـۆ نموونـە یەکـێك لەو مەسەلانە کە ئەمریکاو رۆژئـاوا وەك بیرۆکـەو قەناعەتـێك تەبەنـنی‌یان کـردوە شـتێکیزۆر بـاوە لەئـەورووپا ئەوەیـە کـە گوایە کاتی خۆی هیتلەر لەشەڕی جیهانی دووەمدا

شـەش ملـیۆن جوولەکەی‌لەفـڕنی غـازدا سـووتاندوەو کوشـتوە؟! جا ئێستا
کەمێژوو نووسە ئەورووپیەکان لەو مەسەلەیان کۆڵیوەتەوەو بۆیان ساغ بۆتەوە
کەراسـت نی‌یەو ئەو مەسەلەیە تەنها بانگەشەیەکی جولەکەکان بوو بۆ زێدە
دەرخسـتنی مەزلوومـیەتی خۆیـانو بـۆ ئـەوەی پاساویان بکەوێتە دەستو
خـەڵك بشـتگیریان بکـاتو وڵاتـێك بـۆ خۆیـان داگیر بکەن، وە ئەوە بوو
کەبەفـیعلی (فەلەسـتین)یـان داگیر کرد، جاهەندێك لەمێژوو نووس‌و بیریارو
فەیلەسوفەکانی‌فەرەنسـی‌و بەریـتانی لەئەنجامی ئەوەدا لەلایەن رژێمەکانی
خۆیانەوە زۆر بەتوندی‌و بێ ڕەحمانە دژایەتی دەکرێن، وەیەکێك لەوانە (بول
راسـینیە)یـە کەکابـرایەکی فەرەنسی‌یە لەساڵی (١٩٥٠)دا کتێبکی نووسی
کەبەعـــەرەبی تەرجەمەکـراوە بەناوونیشـانی (أكذوبـة أوَ لَـيسَ؟!) واتـــە:
درۆیـەکی‌زل ئایـا وانی‌یـە؟!جـا (بول راسینیە) سێ جاران لەسەر ئەو کتێبە
دادگـایی کـرا، بەڵام ئەوە بوو کەسەرەنجام هیچی وای لەسەر ئیسپات نەبوو
کـە مایەی تاوانبارکردنی بێت چونکە شتەکانی مەنتیقی بوونو بەڵگەکانی
راسـت بـوون بـەڵام دوایـی هەرچـۆن بـوو جولەکە توانیان فشار لەدەوڵەتی
فەڕەنسـا بکـەنو قانوونـێکی پـێ دەربکەن کەلە مەودوا هەرکەسێك خەڵك
بخاتە گومانەوە لەبارەی مەسەلەی (هولۆکوست) (المحرقة)ەوە، واتە لەوبارەوە
کە جوولەکە بەملیۆنەها سووتێنراون ئەوە دەبێ دادگایی بکرێ‌و تاوانباریش
بکـرێ وە ئێسـتا ئەوە لەفەڕەنسا قانوونە، بۆیە کاتێك (ڕۆجیە گارودی)یش
کتێبـێکی نووسـی کـەدیارە کتێـبەکەی فەڕەنسـی‌یەو دوایـی بەعـەرەبی
تەرجەمــە کـراوە بـەناوی (الاسـاطير المؤسسـة للدولـة الاسـرائيلية) واتـە:
(ئەفسـانە دامەزرێنەرەکانی دەوڵەتی جوولەکە) لە کتێبەکەی دا باسی ئەوە
دەکـات کەگوایە لەشەڕی جیهانی دووەم داو لەلایەن سوپای نازی‌یەوە شەش
ملـیۆن جوولەکـە سووتێنران، دەڵێ ئەوە وانی‌یە دەوری سەد هەزار کەسێك
لـەو جەنگـەدا لەجوولەکـەکان کـوژران جـا (گـارودی) لەسەر ئەو کتێبەی

دادگایی کراو غەرامەشی لێ ستێنرا، هەروەها یەکێکی دیکە لەوانە (دیفید ئیرفینیج)ە مێژووزانیگەورەی بەریتانی کە (أحمد منصور) لەکەناڵی (الجزیرة)و بەرنامەی (بلا حدود)دا چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ دا کرد، وەپاشان لە (١١/٥/٢٠٠٥)دا (أحمد منصور) لەرۆژنامەی (الشرق)ی قەتەریدا مەقالەیەکی لەسەر بڵاوکردەوە بەناوو نیشانی (من یجرؤ علی الکلام) واتە: کێ دەوێرێ قسەیەك بکات کە جولەکە پێیان ناخۆش بێت؟! وە وتارێکی لەسەر نووسی، جائەو کابرایە ئەو فەیلەسووفە بەریتانییە دەڵێ، ئێستاش لەخۆم دڵنیانیمو جوولەکەکان هەمیشە هەڕەشەم لێدەکەن وە لەووڵاتەکەیخۆشم دا ئابلۆقەم خراوتەسەر وەهیچ کەس دەنگم نابیستێو شتیشم بڵاو ناکەنەوە. بۆچی! بەڵێ لەبەر ئەوەی کەگوتوومە: ئەو جوولەکانەی کەلە جەنگی جیهانیدووەمدا کوژراون نزیکەی سەد هەزارێکنو شەش ملیۆن نابن، وەك جوولەکە دەڵێن!! ئینجا لە کۆتایی قسەکانماندا دەربارەی جیهانگیریی دەمەوێت دووراستی ڕابگەیەنم:

راستی یەکەم: ئێمە وەك مسوڵمان دەبێ ئەو اقیعو حەقیقەتە تاڵە بسەلمێنین، کە ئەوانەی ئەمڕۆ جڵەویجیهانگیرییان بەدەستەوەیە وەدەیانەوێت خۆیان بکەن بەکوێخای دونیا خەڵکێکی لێهاتوو بەتواناںو لەڕووی ماڵو سامانەوەو لەڕووی زانیارییەوەو لەڕووی نەخشە دانانەوەو لەڕووی موخابەراتییەوەو لەڕووی راگەیاندنەوەو لەڕووی چەکیجۆراو جۆری کۆکوژەوە بەکورتی لەگەلێك ڕووەوە خەڵکێکی بەتوانان ئەوە حەقیقەتێکە، بەڵام باوا نەزانین ئەوە پێچەوانەی سوننەتو یاساکانیخوایە، بەڵکو راست موافیقی یاسای خوایە چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾(النجم:٣٩) واتە: ئینسان بەرهەمی نییە مەگەر تواناسەرف بکات، جاهەرچی رۆژئاوا بییەکانن تواناو وزەیان سەرف کردوەو خۆیان ماندووکردوەو شەونخوونیان کێشاوەو خۆیان نارەحەت کردوەو زۆر

جـاران موغـامـەراتـیـان کـردوە، وە ئەمـــەریکا هەروا بەئاسانی نەبووەتە ئەو ئەمەریکایەی کەدەیبینین! بەڵکو یەك قەومیان بەتەواوی قەلاچۆ کرد، کاتی خـۆی ئەمەریکاکـە دامـــەزرا پـێش ئەوەی‌کەبـبێ بەدەوڵـەت ئەمـــەریکا هیندەسـوورەکانیان قـەلا چـۆکرد، دیـارە نالـێم شتێکی‌باشیان کردوە بەڵام مەبەسـتم ئەوەیـە کـەتواناکانیان سەرف کردووە، ئینجا ئایا کارەکەیان حەڵاڵە یان حەرامە، چاکە یان خراپە؟ گرنگ ئەوەیە قوربانییان داوەو خۆیان ماندوو کـردووە، بـەڵام دیـارە بـەزۆری بەباری شەڕدا خۆیان ماندوو کردووە، بەڵام جوهدێکـیان سـەرف کـردوە بۆیـە بەرهەمێکـیان هاتۆتـە دەست، وەخوای پـەروەردگاریش پـێمان دەفـەرموێ: ﴿وَلا تَبْخَسُــوا الــنَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ ﴾ (الاعـــراف: مـــن الآية٨٥) واتە: شتی خەڵکی بەکەم مەگرن، ئێمە نابێ هەرلـێرەوە بڵـێین: ئەمـریکا هـیچ نیـیـە، یـان رۆژئـاوا هیچ نی‌یە وهیچی بەکـەڵك نایـەت، بـەڵکو شـتی زۆرچـاکیان هەیـە لەڕاستی‌دا بەدەسەڵاتن، بـەتوانان، لـێزانن، شـارەزان، فـیداکارن، لێبڕاون، جیددین.هتد وەبێگومان زۆر شتی چاکیان هەیە ئێمە دەتوانین لێیان فێربین‌و زۆر شتی وایان هەیە کە دەتوانـین لێـیان بەهـرەمەند بـین، وەك (هانتگـتۆن)یـش دەڵـی: عالـەمی ئیسـلامی‌و عالەمی رۆژهەڵاتی ئاسیا بەهرەمەند دەبن لەتەکنەلۆژیای ئێمە بـێ ئـەوە کەبێنەسـەر رێـبازەکەمان، دیـارە ئەو پێی ناخۆشەو دەڵێ: ئەوە شـتێکی‌زۆر خـراپە بۆیـە دەڵـێ: پـێش ئـەوەی ئەوان ئەو تەکنەلۆژیاو شتە چـاکانەمان لێ وەربگرن دەبێ سەرکوتیان بکەین، چونکە دەڵێ ئەگەر بێت‌و دەسـتیان لەچـەك‌و لەتەکـنەلۆژیاو شـتە باشەکانی‌ئێمە گیربێت دوایی ئێمە پێیان ناوێرین.

راسـتی دووەم: بەداخـەوە (سیسـتـەمی نوێی جیهانی) کەپێی دەگوترێ (جـیهانگیریی) لەسـەر سـێ کوچـکەیەکی شـووم وەسـتاوە، کـە بریتـیە

لەسامان، دەستەڵات، راگەیاندن، بەتەعبیریقورئان (المال، والقوة، والخداع) ماڵو سامان، دەستەڵاتو هێز، فرو فێڵو چاو بەستەکێو خەڵك فریودان، دکتۆر (عەلی شەریعەتی) خوا لێی خۆش بێ قسەیەکیجوانی هەیە کاتی خۆی دەربارەی شارستانیەتی رۆژئاواگوتوویەتی: لەسەر ئەو سێ کوچکە شوومە بەندە (زێر، زۆر،تەزویر)[٨١] جائەگەر سەرنجی مێژوو بدەین زۆر چاك دەزانین داخۆ چ سیستەمێك ئیستیفادەی لەو سێ کوچکە شوومەکردوە؟ دیارە تەنها سیستەمە طاغووتیەکان چونکە ئەو رژێمە دیکتاتۆریانە بەهۆی زێرەوە خەڵك برسی دەکەنو بەهۆی زۆرەوە خەڵك دەترسێننو بەهۆی تەزیویرەوە خەڵك فریو دەدەن، ئەمڕۆ سەرنج بدەن ئیعلام چ دەورێکی گەورە دەبینێ لە چەواشەکردنیخەڵکدا حەقیان لێ دەکاتە ناحەقو ڕەشیان لێ دەکاتە سپی، وەسەرنج بدەن کە جیهانگیریی چۆن بەهۆیچەكو دەستەڵاتەوە خەڵك دەترسێنێ!! ئێستا رەنگە کەم کەس بوێرێ بڵێ: جیهانگیریی تەنانەت پشتی چاوی برۆیە، ڕەنگە (گلۆبالیزەیشن) فلان شتەی بەکەڵك نەیەت، دیموکراسی لەوانەیە دووسێ شتی تێدا بێ بەکەڵك نەیەت، زۆر کەس جورئەت ناکاتو ناوێرێ هەر بڵێ جەنابی ئەمەریکا ئەو تیرۆرەی تۆ دژی دەوەستی بێ زەحمەت بۆمان پێناسە بکە داخۆ چۆنە تاکو ئەگەر خراپ بێ ئێمەش دژی بینو ئەگەر مەبەستیش لەتیرۆر دیفاع لەخۆکردنو بەرهەڵستی خەڵکێکیمەزلومیش بێت کەتۆ کەیفت پێ نایەت، بۆ چی ئێمە لەخۆوە دوای تۆ بکەوین و بەچەپڵە ڕێزان لەخزمەتتدابینو ببینە کۆرسێك بەبێ ئەوەی کەبزانین داخۆ ئەوە کەتۆ دەیڵێی چییە؟! وە لەقورئاندا خوایکاربەجێ ئاماژە بەوە دەکات کەئەو سیستەمەی لەسەر ئەو سێ کوچکە شوومە بنیات دەنرێ هەمیشە سیستەمێکی فیرعەونیو

---

٨١) دکتۆر عەلی شەریعەتیکەبەفارسی نووسیویەتی گووتویەتی: (زر زور تزویر).

طـاغووتی‌یه، وه‌ك خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: ﴿وَقَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَلَقَـدْ جَـاءَهُمْ مُوسَـى بِالْبَيِّنَاتِ فَاسْـتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ وَمَا كَانُوا سَابِقِينَ﴾(العنكبوت: ٣٩)

وه‌ك ده‌بیـنین ئـه‌م ئایه‌تـه پـیرۆزه باسـی (قـارِوون)مان بۆ ده‌كات كه كابـرایه‌كی سـه‌رمایه‌دار بووه، وه‌باسی فیرعه‌ون ده‌كات كه ده‌سه‌ڵاتدارێكی سیاسـی بـووه، پاشـان باسـی (هامـان) ده‌كـات كه‌وه‌زیـری فیرعه‌ون بووه‌و ته‌گـبیركه‌ری بووه، واته هێزه ئیعلامیه‌كه‌ی بووه، وه ئه‌و سێ‌كوچكه‌یه دژی مـیلله‌تی (مصـر)، دژی (بـه‌نی ئیسـرائیل) بـووه‌و گه‌لی‌میصری به‌گشتی‌و (بـه‌نی ئیسـرائیل)ی به‌تایـبه‌ت ده‌چه‌وسـانده‌وه كـه (موسی) علیه الصلاه والسـلام، چـوو بۆ ئه‌وه‌ی رزگاریان بكات وه‌بێگومان ئه‌و جۆره سیسته‌مه‌ی كه‌ته‌ركـیز ده‌خاته‌سـه‌ر پاره‌و كۆكردنه‌وه‌ی هه‌رچی زیاتر به‌بێ گوێدانه حه‌ڵاڵ وحـه‌رام وه‌به‌وه‌ده‌سـت هێنانی هه‌رچی‌زیاتری ده‌سته‌ڵات به‌بێ گوێدانه ڕازی بـوون‌و نـه‌بوونی خـه‌ڵكی، وه‌په‌یداكـردنی هه‌رچـی زیاتـر وه‌سـائیلی خه‌ڵك چه‌واشـه‌كردن ئـه‌وه له‌ڕاسـتی‌دا سیسـته‌مێكه كـه بـۆ به‌شـه‌ریه‌ت تـاڵاوو نه‌گبه‌تی‌و جگه‌له مه‌ینه‌تی هیچی دیكه‌یان له‌گیرفاندا نی‌یه.

## بەشی دووەم

# جیهانێتی ئیسلام

ئـێمە زیاتـر پانـتایی باسـەکەمان بـۆ جـیهانگیریی تەرخان کرد بەڵام پێویسـتە ئەگـەر بەکورتـیش بـێ باسـی (جیهانێتیی ئیسلام) بکەین، وەك گوتمان (گلۆبالیزەیشن) بریتی‌یە لەجیهانگیریی‌و جیهان خستنە ژێر کۆنترۆلی خـۆ، بـەڵام ئایـا ئیسـلام بـڕوای بـەوە هەیە؟! سەرەتا هەر بەکورتی دەڵێم: ئیسـلام بـڕوای بـەوە هەیـە کە جیهان بۆ خۆی چۆنە دەبێ ئاوا تەعامولی لەگـەڵدا بکـەین، نەیگۆڕین‌و دەستکاری نەکەین‌و خەڵکی جیهان چۆنە ئاوا تـەعامولی لەگـەڵدا بکـەین مەگـەر بەشـێوەی بانگـەوازو ئیقـناع کردن‌و تێگەیاندن‌و لە دەروونەوە بیانگۆڕین، بزانین چۆن:

**یەکـەم:** لەڕوانگەی ئیسلامەوە لەسۆنگەی ئەوەوە کەبوونەوەر بەبێ خوا دروسـت نـەدەبوو وە بـەبێ خـواش بـەڕێوە ناچـی وەئینسـانیش بەشـێکە لەبوونـەوەرو ئەمـیش وەك چـۆن پـەیدابوونی پێویسـتی بەخوایـە (تـبارك وتعالی) بۆ بەڕێوە چوونیشی پێویستی بەخوایە بۆیە دەبێ خوای پەروەردگار وەحـی بـۆ بنـێرێ‌و بەرنامـەی ژیـانی‌بۆ دابنێ، وەك موسی (علیه الصلاه والسـلام) لـەوەڵامی فیرعـەوندا کاتـێك فیرعـەون لێی دەپرسێ دەڵێ (فمن ربکمـا یـا موسـی) پەروەردگارتان کێ‌یە ئەی موسا؟! دیارە فیرعەون خۆی بەپـەروەردگار زانـیوە موسـا پـێی دەڵـێ:﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَـهُ ثُـمَّ هَـدَى﴾ (طه ٥٠) واتـە: پـەروەردگارمان ئەو زاتەیە بوونی بەهـەموو شـتێك داوە پاشـان ڕێنماییشـی کـردووە: (یـانی هـەم دروسـتی کـردووەو هـەم بەرنامەشـی بۆ داناوە چۆن بەڕێوە بچێ) کەواتە فیرعەون تۆ

ئـێمەت نـەخولّقاندوەو حەقیش نی‌یە بەرنامەمان بۆ دابنێی چونکە بەتەنها بەدیهێـنەر مـافی خۆیـەتی کەبەرنامـە بـۆ مەخلووقاتی خۆی دابنی‌و هەر خـوای پـەروەردگار بەرنامـەی بـۆ خۆرو مانگ‌و کەهەکەشان‌و گەردیلەکان داناوەو تەنها ئەویش بۆی هەیە بەرنامە بۆ ژیانی‌مرۆڤ دابنێ.

**دووەم:-** پاشـان بەرنامـەکانی خـوا کـە بـۆ هـیدایەتی ئینسـان‌و بـۆ ڕێکخسـتنی ژیـانی هـاتوون بەپـێی ژیـنگەکان بەپێی قۆناغەکانی مێژوو بەپێ‌ی قۆناغەکانی ژیانی ئینسان هاتوون، کاتێك کەبەشەرییەت ژیانی‌سادە بـووە بەرنامەیەکی‌سـادەی‌بۆ هـاتووە ئیـنجاورده وردە ژیانی‌گەشەی کردوەو ئـالۆز بـووە وردە کـاری تـێداپەیدابووە بەرنامەیـەکی پـڕ وردەکاری‌تری بۆ هـاتووە، بـۆ هەموو مرۆڤایەتی هاتودو ئەو راستیەشی تێدارەچاو کراوە جا هـەندێك کـەس لەرۆژهەلاّت ناسەکان (المستشرقین) گوتوویانە، محمدﷺ هەتا لەشـاری مەککە بووە کە دەستەلاّتی‌نەبووە گوتوویەتی: ئەی قەومەکەم ئەی عەشیرەتەکەم من هاتووم بۆ هیدایەتی ئێوە بەلاّم دوایی کەدەستەلاّتی پەیدا بـووەو چـووە بۆ شاری مەدینە ئەو جار باسی ئەوەی کردووە کەبۆ هیدایەت دانی‌هـەموو عالەم هاتووم!! بەلاّم بێگومان ئەوە راست نیە چونکە زۆربەی ئـەو ئایەتانەی کەباسی (جیهانێتی ئیسلام) (عالمیة الاسلام) دەکەن ئایەتی مـەککین یەکـێك لـەو ئایەتانە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِـيراً وَنَذِيـراً ﴾(سـبأ: من الآية٢٨) واتـە: تۆمان بۆ تێکرای خەلّکی نـاردووە کەدلّخۆشـکەرو ترسـێنەریانبی، هـەروەها لەسوورەتی (الانبیاء)دا کەسـوورِەتێکی‌مەککیە دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ (الانبـیاء:١٠٧)، واتـە: تۆمـان نـەناردووە مەگـەر بە رەحمەت بۆ هەموو جیهانـیان، کەواتـە پێغەمـبەرمان بـۆ تێکرای خەلّکی‌و گەلانی سەر زەوی هـاتوە، دیـارە پێغەمـبەرانی دیکـە (علـیهم الصـلاة والسـلام) زیاتـر بـۆ کۆمەلّگایـەکی دیاری‌کـراوو بـۆ قۆناغـێکی دیاری کراو هاتوون وەك خوای

پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾(المائدة: من الآيـــة٤٨) واتە: بۆ هەركامێكتان بەرنامەيەوكو رێبازێكى ديارىكراومان داناوە، بەڵام دواى ئەوەى خواى پەروەردگارو كاربەجێ زانيويەتى مرۆڤايەتى گەيشـتۆتە قۆناغـێك شايسـتەى ئەوەيـەو دەتوانـێ كە بەهۆى تەكنەلۆژياو پێگەيشـتنى فيكريـيەوە كـارێك بكـات يـەك كۆمەڵگاى يەكگرتوو لەسەر زەوى بنـيات بـنێو وڵاتـە دوورەكـان لەيـەك نزيك بخاتەوەو پێكيانەوە گرێ بدات وەك دەڵێن: دنيا بكاتە دێيەك، خواى پەروەردگار كە ئەوەى لەبەر چاو بـووە دينـێكى نـاردووە كـەبۆ هەمـوومـرۆڤايەتى بشێ، بەڵێ ئەگەر سەرنج بدەيـن بـەڕوونى دەبيـنين كـە ئايـنەكانىديكەى پـێش ئيسلام زياتر دينى قـەومى بوونـەو هەركام لە (هودو صالحو شعيبو لوط و موسىو عيسىو هـتد) علـيهم الصـلاة والسـلام، فەرمويانـە: (يـاقومي) هەركامێكـيان تەنها لەگەڵ نەتەوەى خۆىدا قسەى كردوە، بەڵام پێغەمبەرى كۆتايى (عليه الصـلاة والسـلام) لەبـەر ئـەوەى كەدوايين ئايينو پەيامىخواى پێيە لەگەڵ هـەموو بەشـەريەتدا قسـەى كـردوە، ئينجابابزانين (جيهانێتى ئيسلام) ئەو بـنەماو كۆڵەگـە سـەرەكيانەى كەلەسـەريان وەسـتاوە چين؟! ئەگەر سەرنجى ئايـەتى ژمارە ١٣ى سورەتى (الحجرات)بدەين دەبينين سەرجەم بنەمايەكانى جيهانێـتى ئيسلامى تێدان خواى پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْـنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات:١٣).

## چەند بنەمايەكى جيهانێتى ئيسلام:

**بـنەماى يەكـەم:** خواى پەروەردگار بانگى هەموو بەشەريەت دەكا كە هـەموويان خـوا خولقـاندوونىو يـەك بەديهێنەريان هەيە﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا

﴿خَلَقْنَاكُمْ﴾ ئنجا رەگەزو سروشتی ئینسانەکان یەکێکە، نەك وەك بیردۆزەو سیستەمە نەفامییەکان-بەجیهانگیریشەوە- دەڵێن، جیا جیاو جیاوازن.

**بنەمای دووەم:** ﴿مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى﴾ هەموویان بێ جیاوازیو ئیمتیاز لەیەك نێرو مێ دروست بوونەو یەك دایكو باوكیان هەیە، واتە ئەی ئینسانەکان هەمووتان خوشكو برای یەکترنو هەمووتان وەچەی یەك دایكو باوکنو، راست نییە وەك (ئەفلاتوون) لەکتێبی (کۆماری ئەفلاتوون)دا دەڵێ پاشا زادەکان وەك زێر وانو فەیلەسوفەکان وەك زیوو، پاڵەوانو عەسکەریەکان وەك ئاسنو خەڵکی دیکەش وەك سوالك(حزف)بن!! خوای پەروەردەگار دەفەرموێت: هەمووتان یەك رەگەزو نەژادتان هەیە یەك باوكو دایکتان هەن، ئینجا ئایا کێ مرۆڤایەتی بۆ گەلو تیرەی جۆراو جۆر دابەش کردووە؟!

**بنەمای سێیەم:** ﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ﴾ وە ئێمە کردوومانن بەچەند گەلو تیرەیەك، کەواتە ئەوە خوا ئیرادەی وابووە کەمن کوردبمو ئەو عەرەب بێو ئەو تورك بێو ئەو ئەفغانو ئەوی دیکە فارس وەهەروەها ..هتد، ئا ئەوە ئیرادەی خوایەو کاری خوای کاربەجێیەو، هەر بۆیەش لەروانگەیئیسلامەوە هەرکەسو لایەنێك بەهەر بیانوو پاساوێکەوە بیەوێ ستەم لە گەلو تیرەیەك بکاتو بیان چەوسێنێتەوەو فەرهەنگو کلتووریان بتوێنێتەوەو نیشتیمانیان زەوت بکاتو خێرو بێریان بۆخۆی داگیر بکات، ئەوە پێچەوانەی شەریعەتو ئیرادەیخوا جووڵاوەتەوە، چونکە خوا (جل جلالە) ویستی وابوە کەبەشەرییەت بۆ چەند گەلو تیرەیەك دابەش ببێ، ئینجائایا حیکمەتو ئامانجی ئەو جۆرە دابەش بوونە چییە؟!

**بنەمای چوارەم:** ﴿لِتَعَارَفُوا﴾ تاکو بەیەکتر ئاشنابنو یەکتر بناسن، نەك وەك (فۆکۆیاما) (دەڵێ: دەبێ خەڵك هەموویان لەشارستانێتی

رۆژئـاوادا یاخود راستتر بڵێین ئەمەریکادا بتوێنەوە، (هانتگیتۆن)یش دەڵێ: دەبــێ خەڵك دابپلۆسێنرێ‌و لە ژێر چەکمەی شارستانێتی دا بپلیشێنرێتەوەو لــە ژێـر سـایەی سـەرمایەداری‌دا هـیچ کـەس هـیچ گـەل‌و میللەتێك نابێ خـاوەنی‌بوونی‌خۆی بـبێ! بـەڵام ئیسـلام دەڵــێ ﴿لـتعارفوا﴾ بـۆ ئــەوەی یەکتربناسـن‌و بەیەکتر ئاشنابن، واتە ئیسلام نەتەوەکانی‌وەك خۆیان قبووڵن، بـەڵام دەڵــێ وەرن یەکتر بناسن، هەربۆیە تەماشا دەکەین بەدرێژایی حوکمی ئیسـلام هەرگـیز رۆژێـك لەرۆژان دەستەڵاتدارێکی ئیسلامی کە کەم‌و زۆر بەپـێی شـەریعەت بـەرێوە چـوون، بیریـان لــەوە نەکـردۆتەوە میللەتـێك (جینۆسـاید)بکـەن‌و بتوێنـنەوە یـان زمانی بتوێننەوە، کلتووری بتوێننەوە قــەت رۆژێـك لەرۆژان دەسەڵاتدارێکی‌هەر بیریشی لەوە نەکردۆتەوە، چونکە زانیویانە کەخوای پەوەردگار ئیرادەی وابووە کە میللەتەکان هەموویان، وەك چـەپکە گولـێك، یـان وەك باخـێك گوڵی جۆراو جۆری تێدابێ، نەك هەموو یـەك رەنـگ بێـت، ئیـنجائایا تەرازوو وپێوەری هەڵسەنگاندنی ئینسانەکان چی‌یە؟!

**بـنەمای پێـنجەم:** ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ ئـەوەی لەهــەموو کـەس پارێزکارتـرە، لەهــەموویان لای خـوا بەرێزتـرە، ئینجاسـەرنج بـدەن فەرموویــەتی لــەلای خوابەرێزتــرتان ئــەو کەســەیە کەبەتەقواتــر بێــت، نەیفـەرمووە لەدونـیادا، بـۆ ئـەوەی کـەس لەدونیادا نەڵێ لەبەر ئەوەی من مسوڵمانم، ئاواو ئاوام، بەڵێ ئێمە قەناعەتمان وایە کە ئەوەی مسوڵمان بێت دەچـێتە بەهەشـت‌و ئەوەی نامسوڵمان بێت دەچێتە دۆزەخ، بەڵام نابێ هیچ کـەس مسـوڵمانەتیەکەی بکات بەپاساوی ئەوەی کە لەفڵان کەس بەرێزترە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ (الاسراء: من الآية ٧٠)﴾ واتە: بێگومان رێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە، بەڵێ: سەرجەم ئادەمیزادەکان وەك ئینسان رێزیان لێ گیراوە، دینەکەی هەر چی‌بێ ئینسان لەخودی خۆی‌دا

بەڕێـزەو دەبـێ ڕێـزی لێ بگیرێ، لە (صحیح مسلم)دا هاتوە کەپێغەمبەرﷺ ڕۆژێـك لەشوێنێك دانیشتبوو جەنازەیەکیان بەوێدا هێنا (جەنازەی‌کابرایەکی جوولەکە بوو) لەبەری هەڵسا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ (یا رسول الله إنـه یهـودی) ئـەوە جوولەکەیـە خـۆ مسـوڵمان نی‌یـە، ئـەویش فەرمووی: (أولیسـت نفسـا) ئـەدی نـەفس نی‌یە، ئینسان نی‌یە؟! واتە جوولەکەش بێ مادام ئینسانە بەمردوویی‌و بەزیندوویی من ڕێزی‌لێدەگرم، چونکە خوا ڕێزی لێ نـاوە ئەمـەش بـۆ هـەڵس‌و کـەوتی ژیانی‌دنیایە، بەڵام ڕێزو پلەو پایەی ئینسـان لـەدوارۆژدا پەیوەستە بەتەقواوەو تەقواش بەهەموو کەس وەدەست دێ چـونکە نەپـەیوەندی بەنـێرایەتی‌یەوە هەیـە نەبەمێـیایەتی‌وە نـە بەدەوڵەمـەندی‌و نەبەنەداری‌یـەوە نەبەخوێندەواری‌و نەبەنەخوێندەواری‌یەوە، پـەیوەندی بەهـیچ شـتێکەوە نی‌یە کەئینسان نەتوانێ بەدەستی بهێنێ وەك جیـنس‌و ڕەگـەزو ڕەنـگ‌و زمـان‌و ڕەچـەڵەك‌هـتد، بـەڵکو هەمووکـەس دەتوانـێ تـەقوا پـەیدابکات، ئیـنجا ئیسلام کەویستوویەتی ببێتە سێبەری مـرۆڤایەتی‌و دینـێکی‌خوایی ئینسـانی‌یەو بـۆ هـەموو بەشەریەت هاتووە، بەپێچـەوانەی سیسـتەمە جاهیلـیی‌و طـاغووتیەکانەوە نەهاتوە کەهەندێك لەخـەڵکی بکاتـە خـزمەتکاری هەندێکی دیکەیان‌و هەندێکی لە ژێر پێی هـەندێکی دا بپلیشـینێتەوە، وە نـەهاتوە کەخـەڵك وەك کۆمپانیاو کارگەو شـەریکەیان تەماشـا بکات، کەهەرچی‌زیاتر بەرهەمیان پێ وەدەست بهێنێ هەربۆیـەش لەفتووحاتی ئیسلامی‌دا بە پێچەوانەی تێگەیشتنی زۆر کەسەوە کاتـێك کـە سـوپای ئیسـلام هـاتوەو وڵاتێکیان ئازاد کردوەوئیسلامیان پێ گـەیاندوون، وەخەڵك‌و میللەت کەهاتوون‌و گوتوویانە: ئەرێ چیمان لێ داوا دەکـەن‌و بـۆ چـی هـاتوون؟! مێژوو دەڵێ: گوتوویانە تەنها ئەوەتان لێ داوا دەکەین کەئەم دینەمان لێ وەربگرن، ئینجا ئەگەر دینتان لە ئێمە وەرگرت، ئـەوە ئـێوە وەك ئێمەن (لکم مالنا وعلیکم ما علینا) وە ئەگەر گوتبێتیان:

وەری ناگریﷺ پێیان گوتوون: ئەگەر وەرتان نەگرت قەینا کات، بەڵام دژایەتی ئـەم دیـنـە مەکـەنو سەرانە بدەن، وە وەك پێشتر باسمان کردووە[٨٢]، قسەی بەقووەتی زانایانیش ئەوەیە کەهەموو خاوەن فیکرەیەك، موشریك، مولحید، مەجووسـی، نەصـرانی، جوولەکـە، سـەرانەی لێ وەردەگـیرێو لێی قبووڵ دەکـرێ کـەهاوولاتی بێتو لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا سەرانە بدات بـەڵام ئێستا ماوە نییە ئەو بەڵگە شەرعیانە بهێنمەوە کەراست نیە تەنها جوولەکەو نەصرانی لێیان قبووڵ بکرێ کەسەرانە بدەنو ڕەعیەتو هاوولاتی بـن لەدەوڵەتی ئیسلامدا، بەڵکو هەموو خاوەن دینو فیکرەیەك بۆی هەیە، چـونکە خـوای پەوەردگار ئینسانی بۆیە دروست کردووە کەتاقی بکاتەوە، وە چـۆن تـاقی دەکرێـتەوە ئەگـەر مـەجالی نـەدرێ کافـر بـێ؟! خـوای پـەروەدگاریش فەرموویـەتی: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ (الكهف: من الآية٢٩) واتە: بڵێ هەق لەپەروەردگارتانەوەیە، جاکـێ پێی خۆشە بائیمان بێنێ، کێپێی خۆشە باکافربێ، دیارە کەکافریش بـوو وەك هاوولاتـیەك مـادام لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بێت، ڕێزی لـێدەگیرێ، وەك ئینسـانێك ڕێـز لـە دیـنو موقەددەساتی دەگیرێ تەنانەت خـوای پـەروەردگار دەفـەموێ: ﴿وَلا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾(الأنعام: من الآية١٠٨) واتـە: جنێو بەپەرستراوەکانیان کەلە جیاتی خـوا دەیـان پەرسـتن مـەدەن، جنـێو بەبتو صەنەمەکانیان مەڵێنو قسەی ناشـیرینیان پـێ مەڵێن چونکە ئەو ئینسانە مادام خۆی ئەوەی هەڵبژاردوەو خـوای پـەوەردگار کەخاوەنیەتی ئـەو بـوارەی پـێداوە کەس بۆی نییە ئەو مافـەی لێ زەوت بکـات دیـارد هـیچ کەسـیش بـۆی نییە بەبیانووی کافر بوونـەوە یەخـەی پێ بگرێ چونکە ئەو حیسابو کیتابە تەنها مافی خوایەو

---

٨٢) وەك لەئالقەی (سێیەم)داڕوونمان کردۆتەوە.

لـەدادگای خـوا لەقیامەتدا دەکرێ، چونکە دونیا جێی تاقیکردنەوەیەو نابێ لـێرە ئەنجامەکـەی وەربگیرێـتەوەو لەقـیامەت خوا بۆخۆی وەری دەگێڕێتەوە بـەڵام ئیسـتا دەبـێ هـەموو کەسـێك مـەجالی پـێ بدرێ چ ڕێیەك دەگرێ بیگرێـتە بـەر، وە ئیسـلام هـەرکات دەسـەڵاتی بـوو تەنـیا لـەدوو شتاندا (تدخل)دەکات:

یەکـەم: لـە لابـردنی زوڵمـدا وەك خـوای پەروەردگار ڕوو لەمسوڵمانان دەکـاتو دەفەرمووێ: ﴿وَمَا لَكُمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ﴾ (النســاء: مــن الآيــة٧٥) واتـە: چیتانە بۆ چی لەڕێی خواو چەوساوان دا ناجـەنگن؟! بەڵی ئەگەر ئیسلام دەسەڵاتێکی هەبێو دەوڵەتێکیهەبێ قبووڵ ناکـات هیچ کەسێك زوڵمی لێ بکرێ، بامسوڵمانیش نەبێ، و قبووڵ ناکرێ بچەوسـێنرێتەوە، چـونکە ئیسـلام دەڵێ خوا تبارك وتعالی ئەو خەڵکەی بۆ ئـەوە دروسـت کردووە کەبەندایەتی بۆ بکەن، بۆیە ئەی حوکڕانەکان مەیان چەوسێننەوەو مەیان کەن بەکۆیلەو با ئازاد بن تاکو بزانین بەندایەتی بۆ خوا دەکـەن یـان نایکـەنو بـەوجۆرە تاقی بکرێنەوەو ئیمتیحانی ژیانی دنیایان بدەن.

دووەم: هـەروەها ئیسـلام بـۆ چەسـپاندنی دادگەریش هێز بەکاردێنێ: ﴿وَأُمِـرْتُ لِـأَعْدِلَ بَيْنَكُمْ﴾(الشورى: ١٥) خوای دادگەر بەپێغەمبەری ﷺ فـەرمووە کەبفـەرمویێ: (وَأُمِـرتُ لاعـدل بينكم) واتە فەرمانم پێکراوە کەلەنێوانتاندا دادگەر بم، ئینجا دێینە سەربەشی سێیەمو کۆتایی.

## ( بەراوردێك لەنێوان
## جیهانگیریی رۆژئاواو جیهانێتی ئیسلامدا )[83]

لـە ئـەنجامی ئـەوەدا کەئیسلام دەڵێ: خوا خاوەنی بوونەوەرو ئینسانو ژیانـە، دنـیا جێی تێدا تاقیکردنەوەیە، ئینسان تەنیاجەستە نیەو ڕوحیشە، ئینسـانەکان هـەموو بـرای یـەکترنو لـە بـاوكو دایکێك کەبریتین لە ئادەمو حـەوا، وەدەڵـێ مـادام خواو دینو قیامەت هەبن دەبێ شتەکان هەموویان پەیوەسـت بـن بەئـەخلاقو قیەمەوە، بەڵام رۆژئاوا لەسۆنگەی ئەوەوە کەیان دەڵێ: خوا نییە (سبحانه وتعالی) یان دەڵێ: ئەگەر هەش بێت مافی ئەوەی نییـە کەدەسـت بخاتـە کاروبـاری ئـێمەوە!! وەك کـاتی خـۆی دەیـانگوت: لـەبلووکی سوسـیالیزمو (یەکێـتی سـۆڤیەت)دا دەڵـێن: خـوا نـیە، بـەڵام لەئەوروپاو رۆژئاواو جیهانی کاپیتالیزم دا دەڵێن: خوا هەیە بەڵام ئەو خوایە خۆمـانین، (سـبحان الله عمـا یصـفون)!! هـەروەها جـیهانگیریی رۆژئـاواو جیهانێـتی ئیسـلام لەتێڕوانینیشیاندا بۆ ئینسانو ژیان زۆر جیاوازن چونکە لەڕوانگـەی شارستانیەتی رۆژئاواوە ئینسان هەر جەستەیەو غەریزە ماددیو ئاژەڵییەکانـیەتی، وەلـەبارەی رۆژی دوایـیو قیامەتەوە یان هەر بڕوای پێی نـیە یـان بەڕواڵەت بڕوای پێی هەیە بەڵام هیچ حیسابی بۆناکات، هەروەها لـەو روانگەیـەوە ئینسـانەکانیش یەکسـان نـین[84]، هـەر بۆیـە فەلسەفەی

---

[83] دیارە ئەم بەراوردکردنە زیاتر پێداچوونەوەی هەردووك بەشی یەکەمو دووەمو دووبارە سەرنج دانەوەو زیاتر ناسینیماهیەتی هەرکام لە جیهانگیرییوجیهانێتییە.

[84]هەر چەندە لەئەوروپاو ئەمەریکا زۆر بانگەشە بۆ مافەکانیمرۆڤو یەکسانیو ئازادیی دەکرێ، بەڵام بەکردەوەو لەواقیعدا ئەو ستەمو بێدادیو فەرقو جیاییەی لەوێ هەیە وێنەی لەدنیادازۆر کەمە، وە لەلووت بەرزییو خۆ پێ زۆرییو لافی ئیمتیاز هەبوون لێدانیان بەسەر غەیری خۆشیان داهەرباس ناکرێو وێنەی نیە.

(نیتشــەر)و زۆر لەفەیلەســووفەکانی‌ڕۆژئاوا دەڵــێن: هەرکەسێك بێ هێزو بێ دەســتەڵات بــێ مــافی ژیــانی نــیە، هەربۆیــەش دەبیــنین ساڵی وا هەبووە کــەوڵاتانی ڕۆژئــاوا بەتایــبەتی ئەمەریکا چەندان ملیۆن تەن گەنم‌و دەغڵ‌و دانــی خســتۆتە دەریاکانــەوە کەلــێی زیاد بووە، هەروەها کەڵو پەلی دیکە کەلێــیان زیــاد دەبێ دەیفەوتێنن‌و دەیسووتێنن، لەکاتێکدا کەلە ئەفەریقیاو ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو لەزۆرێك لەوڵاتانی دنیادا ساڵانە ملیۆنەها کەس لەبرسان دەمــرن! چونکە هاندەرێك نیە پاڵیان پێوەبنێ‌و بڵێن: با ئەوانەش لە برسان نەمــرن و وەك ئــێمە مــرۆڤن‌و ئــێمە دونــیامان پــڕ کــردووە لەباســی مافەکانی‌مــرۆڤ، بۆچــی ئــەوەی لــێمان زیــادە لێرە خەساری بکەین بابەلای کەمــەوە هــەر بەرماوەکــەی‌خۆمان بدەیــن بەوان‌و پاشماوەکانی‌خۆمانیانی‌پێ بدەیــن، بــەڵام ڕێــبازو فەلســەفەکانیان دەڵــێن: مــادام توانایان نیەو نەدارو بێچــارەن باهەرنــەژین، وەلــە کاتــێکدا کــە ئینســانێکی ئەمــەریکی (٧٠) بەرانــبەر (١٠٠) بەرانــبەر ئینســانی شوێنێکی دی دەخل‌و‌ واریداتی هەیە، ســۆزو بەزەیی ناجووڵێ بەرانبەر بەکەسانێك کە (نان)ێکیان دەست ناکەوێ؟ بــەڵام هەرگــیز ئــەو جــۆرە دیــاردەو حاڵەتانــە لەئیســلام‌و سیســتەمی حوکمڕانیــیەکەی دا جــێی نابێتەوە، ئینجا وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد هۆکــاری ســەرەکی ئــەو دیاردەیــە دەگەڕێتەوە بۆ لەززەت وەرگرتنی زیاتری مــاددی وبــۆ بــەرژەوەندی تایــبەتی، ئاشکراشــە کەلەســایەی سیســتەمی ســەرمایەداریی‌دا، لەززەت‌و بەرژەوەندی ئەوانەی کەسەرمایەدارن‌و هەبوون‌و خــاوەن دەســەڵاتن تاکە بەرژەوەندییەکە کەڕەچاو بکرێ‌و حیسابی بۆ بکرێ، بــەڵام ئیســلام هەموو شتێك لەڕوانگەی قیەم‌و ئەخلاقەوەو لەڕوانگەی خوو قیامەت‌و بەزەیی‌و ویژدانەوە تەماشا دەکات.

ئێســتاش بــا بــۆ چــاکترو زیاتــر لەیــەك جــیاکردنەوەی ئــەو دوو جۆرە تــێڕوانین‌و ڕێــبازە سەرنجی کتێبی خوا بدەین داخۆ چۆن بۆمان باسی هەرکام

لەو دووو جۆرە ڕێبازە دەكات! خوای پەروەردگار باسی فیرعەونمان بۆ دەكاو باسی (ذو القرنین)یشمان بۆ دەكات وەك دوو نموونە، بۆ شێوەیەك لەجیهانگیریی، وەشێوەیەك لەجیهانێتی(ذو لقەرنەین) كە نموونەی سیستەمیجیهانێتییە خوای پەروەردگار باس دەكات كە سەرەتا تاكو رۆژئاواو پاشان تا رۆژهەلات چووە، واتە هەموو دونیای گرتوە، جائایا ئەو پیاوە كێ بووە؟ هەندێك دەڵێن (ئەسكەدەری مەقدونی) بووە، بەلام زۆربەیان دەڵێن ناگونجێ ذو القرنین (أسكندر المقدوني) بووبێت، چونكە ئەو كابرایەكی بتپەرستو هاوبەش دانەر بووە، بەلام (ذو القرنین) پیاوێكی صالحو خواپەرست بووە، جابەهەر حاڵ بابزانین (ذو القرنین) بەرنامەو سیاسەتیچۆن بووە؟ خوای دادگەر دەفەرموێ:﴿قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَنْ تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَنْ تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْناً﴾(الكهف: من الآية٨٦)واتە: گوتمان ئەی (ذو القرنین)، بۆت هەیە ئەوانەی كەخراپەكارن ئەشكەنجەیان بدەیو ئەوانەش كە چاكە كارن چاكەیان بدەیەوە (ذو القرنین)یش لە بارەی سیاسەت و بەرنامەی مامەڵەكردنی لەگەڵ میللەتانی ژێر ركێفی یەوە دەڵێ: ﴿قَالَ أَمَّا مَنْ ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّه فَيُعَذِّبُهُ عَذَاباً نُكْراً، وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُ جَزَاءً الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْراً﴾ (الكهف: ٨٧-٨٨) واتە: هەركەسێك ستەمو خراپە بكات ئەوە ئێمە لەمەودوا ئەشكەنجەی دەدەین، پاشان دەگێڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو خاوەنیو ئازارێكی سەختی دەدات، بەلام كەسێك ئیمان بێنێو كردەوەی چاك بكات، ئەوە پاداشتی هەرە چاكی لای خوای هەیەو ئێمەش بێگومان لەلایەن خۆمانەوە قسەیەكیخۆشو ئاسانی لەگەڵ دەكەین! وەك پێشتر ئاماژەم بۆ كرد ئیسلام كاتێك دەستەڵاتی هەبێ بەهیچ رەنگیك رێ نادات زوڵمو ستەم بكرێو توند یەخەی دەگرێو لەگەڵی تێك دەگیرێ! بەڵی ئەوە راستیەكە دیان دەقی قورئان جەختیان لەسەر كردۆتەوە. سەرنج بدە چۆن

(ذو القـرنين) نموونەی  حوکمڕانی صالحو پەسەندی لای خوا (تبارك وتعالى) باسـی کوفـری ئـەو مـیللەتانە ناکات کەبێگومان کافر و بێ دینیش بوونە، واتە باسی ئەوە ناکات کەلەسەر کوفرەکەیان لێیان تووڕە بێتو سزایان بدات بـەڵام باسـی زولـمو ستەمو دەست درێژی یەکەیان دەکاتو سزاو جەزرەبەی خۆیشـی لەبەرانـبەریدا دەخاتـەڕوو! بـەڵێ دەسـتەڵاتی ئیسلامیی دەتوانێ لەگـەڵ (کفـر)دا بژیـەتو مـەدار بکـات، بـەڵام ئـەوەی لەگەڵی هەڵناکات (ظـلم)ە، واتـە: دەوڵـەتو کـیانی ئیسـلامیی ڕێ دەدات خـەڵك کافر بێت چـونکە دنـیا جێگای تێدا تاقیکردنەوەی بەندەکانەو دەبێ دەرفەتی ئەوەیان پـێ بـدرێ ئـیمان بێـنن یان نەهێنن، بەڵام دەوڵەتی ئیسلامی ڕێ بەستەمو دەسـتدرێژی نادات، چونکە دنیا بۆ ئەوە دانەنراوە کەفیرعەونو تاغووتەکان کوێخایەتیو ستەمو زۆری تێدابکەن پاشان (ذو القرنين) لە کۆتایی فتوحاتو ئازادکـردنی وڵاتـانو رزگارکـردنی گـەلانی چەوسـاوەو ژێر دەستەدا دەگاتە شوێنێك کە زۆر دوورو پەڕیدە بووە میللەتێکی لێ بووە زۆر بەجێماو بوونو تەنانـەت بەزەحمەت توانیویانە لەقسان حاڵی بن ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَـدَ مِنْ دُونِهِمَا قَوْماً لا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلاً﴾ (الكهف:٩٣)، پاشـان ئەوگەلـە بێچـارەو بەجـێماوە داواکاریـیەك ئاڕاسـتەی حوکمڕانیصـالحو دەستڕۆیشـتوو دەکـەن کـە بریتـیە لـەوەی بەربەست (سد)ێکیان بۆ دروست بکـات لەنـێوان ئەو دوو چیایەدا کە دەکەونە نێوان ئەوانو میللەتی (يأجوج مـأجوج)ەوە کەگەلـێکی هـارو بەد رەفتار بوونە، بۆ ئەوەی لەشەڕو زیانیان سـەلامەت بـن: ﴿قَـالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجاً عَلَى أَنْ تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدّاً﴾(الكهف: ٩٤)، جاجـێی سـەرنج ئەوەیە کەئەو میللەتە بێچارە بۆ (ذو القـرنين) پێش نـیار دەکـەن کـە پـارەو پیـتاکی بـۆ کۆبکەنەوە بۆ مەسرەفو خەرجی ئەو بەربەسـتە! بـەڵام ئایـا (ذو القرنين) ئامادەیە کەوەك جیهانگیریی بەبیانووی

دیفـاع لێکردنـیانەوە هـەر هەقدەستشـیان لیَ وەربگرێـتەوە چ جای هەموو خێرو بێری ولاتیان بەتالان ببات‌و کۆبکاتەوە؟! نەخێر بەڵکو دەڵی ﴿**قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ**﴾ دەڵـێ: ئەوەی کەخوا (جل وعلا) منی تـێدابالاّ دەسـت کردوە چاکترەو پارەو سامانم هەیەو پێویستیم بەپارەی ئێوە نـیە، بـەلاّم بەدەستی‌کرێکار (الایـدي العاملـة) یارمەتـیم بـدەن بۆ ئەوەی بەربەسـتێکتان لەبەیـندا دروسـت بکـەم، وەسەرەنجام بەربەستێکی لەبەیندا دروسـت کـردن، کەواتـە (جیهانێتی‌ئیسـلام) ئـەو سیسـتەمە جیهانیـیەی کەئیسـلام دەیـەوێ دەبـێ ئـاوا بێـت و دژی زوڵم بێ دیفاع لەمەزڵوومان بکـات ئیـنجا بەپارەی خۆیشی دیفاع لەمیللەتە مەزڵوومەکان بکات، نەك وەك ئەمـەریکا کەلەسـاڵی (١٩٩١) دا بـەپارەی حکومەتـە خەلیجییەکان بەحیسـاب هـات سـوپای (صـەددامی) دەرکـرد لەکوێـت بـەلاّم هێـندەی مەسـرەف پـێکردن ئێسـتاش قـەرزداری ئەمەریکان!! واتە نەك تەنها رۆنی خۆیـانی لەسـەری خۆیان دایەوە بگرە زۆر زۆریشی لەسەر قەرزدار بوونەوە، چـونکە ئەگـەر بـایی دۆلارێـك دیفاعی لیَ کردبن، بایی هەزار دۆلار لیێیان بەهەرمـەندە بـووە!! جـا ئـەوە سیاسـەت‌و تێروانینـێکی ماددیانەو جیهان گیرییانەیەو ئەوەی دیکەش سیاسەتێکی ڕەببانییانەو جیهانییانەیە.

وەسیسـتەم‌و سیاسەتی فیرعەونیش نموونەیەکی مێژوویی جیهانگیرییە، جابـزانین فیرعـەون لەسـەر ئەو سیَ کوچکە شوومە (زۆرو زێڕو تەزویر) چی لەخەڵکەکـە دەکـرد؟! خـوای پـەروەردگار دەفەرموێ: ﴿**إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعاً يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَـــاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ**﴾(القصص:٤). واتە: بێگومان فیرعەون لەسـەر زەوی دەسـتەڵاتی پەیداکـرد وە خەڵکەکـەی بـەش بـەش کـرد، هەندێکـیانی دەچەوسـاندنەوە، کورەکانـیانی سـەر دەبـڕیو ئافەرتەکانیانی دەهێشـتەوە، بـێگومـان ئـەو لەخـراپەکاران‌و تـێکدەران بـوو، بەڵێ پەرێزو

بەرهـەمی شوومی ئەو سیستەمە جیهانگیرییە مێژووییەی فیرعەونیش ئاوا بـووە بۆیـە خـەڵك دەبـێ بپرسـێ: بۆچـی خـوای پەروەردگار لەو هەموو شـوێنانەی قورئـاندا بەسـەرهاتی فیرعـەون دەگێڕێـتەوەو بۆچـی هیـندە بەسـەرهاتی (مووسـا) دەگێڕێـتەوە؟! بـێگومان خوای دادگەر دەیەوێ ئێمە (موسـی) (علـیه الصلاة والسلام) بکەینە سەر مەشقی خۆمان، وە دەیەوێ کـە دیکـتاتۆرو طـاغووتەکانـیش پـەند لەفیرعـەون وەربگرن، فیرعونەکان هەرچـەندە دەسـەڵات داربـن سـەرەنجامیان هـەر تێچوونە، مووساو مووسا ئاسـاییانیش هەرچـەندە مـەزلۆومو بـێ دەستو گرفتار بن، بەڵام سەرەنجام بەپـێی سـوننەتی خـوا، مـادام خۆڕاگرو پشوو درێژوو بەردەوام بن هەر سەر دەکـەون، چونکە ئیرادەی خوایان لەپشتەوەیە وەك فەرمووویەتی: ﴿وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾ (القصص:٥).

# بەشی سێیەم

## هەڵوێست وەرگرتنی راستو دروست لەبەرانبەر جیهانگیرییدا

لــە کۆتــایی ئــەم توێژینەوەشدا لەبارەیگلۆبالیزەیشن (عولمة) وە دەڵێم: هەڵوێستیشــەرعی و هەڵوێســتی راســتو دروست بەبۆچوونی ئێمە لەبارەی جیهانگیرییــەوە ئەوەیــە کەئــێمە جــیهانگیری هــەموو بەیــەك چاو تەماشا نەکــەینو بەتــەرازوی شــەرع هەڵیســەنگێنین و چــاکەو خــێرەکەی لەلایەك دابنــێینو نەگــبەتیو شەڕەکەشــی لەلایەك دابنێینو بڵێین: تەئیدی ئەو خێرو چــاکانەت دەکــەینو دەســت خۆشیشــی لێ بکــەین ئنجا بوێرانەش بەرانبەر بەخراپەکانیشــی بلــێن: مــاڵی قەڵــب ســەر بەخاوەنــیەتی، وەبڵێین: جەنابی ئەمــەریکا! تــۆ دەتــەوێ لــە بابۆڵــە خواردنەوە تا سەییارە دروست کردن و ..... کەئێمە ئەوەشمان نیە لەهەمووشتێکدا شوێن تۆ بکەوین!! نەخێر من نــانی خــۆم بەشــێوەی خــۆم دەخــۆم، بۆچــی دەبێتۆ (هەمبەرگرو ساندویچو بیــتزاو نازانم چیو شێوەی بابۆڵە خواردنیشم بۆ بێنیێ؟! بۆچی ئێمە تا ئێستا نــەمان زانــیوە بەلای کەمەوە نان بخۆین؟! تۆ بۆچی دەتەوێ تەنانەت لەجلو بــەرگ پۆشینو عادەت و نەریتو ژیانیڕۆژانەو تەنانەت لەئاو خواردنەوەشدا وەك تــۆ بکــەین؟! بۆچــی ئــێمە تائێســتا بنــیادەم نــەبووینو کلــتوورو فەرهەنگێکمان نەبوودو دینو قیەمێکمان نەبووە؟! بەڵێ دەبێ بەئەمەریکاو رۆژئــاوا بڵــێین: ئەوانــەی خــۆت بــۆ خــۆت، تۆ فەرهەنگو کلتووری خۆت، عــادەتو نەریــتی خــۆت بۆچــی لەســەر ئــێمەفەرز دەکــەی؟ شــتی خــۆت کەتایــبەتمەندی خۆتە بۆ خۆت بەلام تەکنەلۆژیایەکەت کەبەرهەمی سەرجەم

بەشـەرییەتەو بەتنـیا هـی تـۆ نـیە، چـونکە کـاتی خـۆی بەپـێی[٨٥] خۆی تەکـنۆلۆژیاو بـەرەو پـێش چـوونی پیشەسـازیو زانسـتی سروشـتی لەسەر دەسـتی زانـاو شـارەزا مسـوڵمانەکان بنـیات نـراوە دیارە دیسان ئەوانیش بەتـەنێ هـی خۆیـان نەبووەو ئیستیفادەیان کرد لەشارستانێتی ڕۆمو فارسو یۆنـانو کتێبەکانـیان تەرجەمە کردن، بەڵام بێگومان زیادەیخۆشیانیان زۆر خستەسـەری، وە ئـەو تەکـنۆلۆژیایە بەرهـەمو کەلـەپوورێکی گشـتییەو هـەموومان بـەشمان پێـیەوەیە، بـەڵێ بابەڕاشـکاوییو بوێـرانە بـەرۆژئاواو جیهانگیرییەکەی بڵێین؛ چاکەو خێرەکانت بەسەرچاو، بەڵام شەڕو خراپەکانت عـادەتو نەریـتی خـۆت، بـیردۆزەو فەلسـفەی پووچـی خۆت بۆ خۆت، تۆ کەپـیاو لەپـیاو مـارە دەکەی، ئەوە لای ئێمە شتێکی نامەعقووڵە، یان ژن لەگـەڵ ژن، وەکـچ پـێش ئـەوەی شـوو بکـات لای ئـێوە سێ چوار منداڵی دەبێـتو دەوڵەتـیش ناچـارە بەخـێوی بکـات!! ئـا ئـەو شـتانە عـادەتو شایسـتەیخۆتانو بەکـەڵکی ئـێمە نایـەن چـونکە دیـنمان ڕێمـان نـاداو عەقڵیشمان پەسندی ناکات!

بـەڵێ هەڵوێسـتی شـەرعیانەو ژیرانە لەبەرانبەر جیهانگیریدا ئەوەیە کـە: خـێرەکەی لێ وەربگـرینو شەڕەکەشی بەسەر سەری دابدەینەوە، تەنها ئـەوە شتێکی شەرعییانەو عـاقڵانەیە، نەك وەك هەندێك فەقیر حاڵی بەهەڵە چووپێمان وابێ دەبێ لەهەموو شتێك دا تەسلیمی بین یان هەموو شتێکیان ڕەفـز بکـەینو بەشـەڕەکەیانەوە خێرەکەشـیان ڕەفـز بکـەین، وەك چـۆن بابەخـێرەکەیانەوە شەڕەکەشـیان قبووڵ نەکەین، ئینجائێمە باهەر تەماشای خـەڵکی ئـەورووپا بکـەین: دەبیـنین زۆر لەخـەڵکی رۆژئـاوا زۆر نارەزایەو چـەندە بـێزارە لـەو واقـیعی گەندەڵی جیهانگیرییە، چونکە دەزانن سەری

٨٥) واتە: لەقەدەر ئەوساو بەوگوێرەیئەوکاتە.

بـەکویێ دەگـات وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ أَهْلِهَا﴾ ئـێمە ئەگـەر هـەر تەماشـای ئـەوان بکـەین دەبیـنین خۆیـان چەندان خۆپیشاندان دەکـەنو چەندان کتێب دەنووسن لەسەر (جیهانگیریی) ئەگەر هەر شتەکانی خۆیانـیش بخوێنیـنەوە خێرو شەڕو چاكو خراپی جیهانگیریی‌مان تاڕادەیەك بـۆ مـەعلووم دەبـێ بـەکورتی: بائـێمە وەك دارکەری شەوێ هەمووی ڕەفز نەکـەین وە هەموویشـی قبووڵ نەکەین، بەڵکو لەبێژینگی بدەین بەبێژینگی عەقڵو شەرع.

خـوای بەخشـەرو بەبـەزەیی بەکـەڕەمی بـێ سـنووری خۆی میللەتانی مسـوڵمان بەگشـتیو میللەتی مسوڵمانی کوردستان بەتایبەت زیاترو چاکتر بخاتـە سـەر جـادەی شـەریعەتو بیپارێزێ لەشەڕو زیانەکانی جیهانگیریی، وەتۆفیقیشـمان بـدات کەلەخـێرو چـاکەکانیبەهەرمەند بـین بەشـێوەیەکی شەرعییانەی گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندیەکانماندا.

## ئالقەی (٥)

# دیموکراسیی لەبەر تیشکی عەقڵو شەرعدا

الحمد الله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن والاه

ئامادەبوانی بەڕێز!

ئێوارە کۆڕی ئەمڕۆمان وەك مامۆستا تۆفیق کەریم ئاماژەی بۆ کرد لەبارەی دیموکراسییەوەیە، بەناوو نیشانی (دیموکڕاسی لەبەر تیشکی عەقڵو شەرعدا).

واتە ئێمە لەم ئێوارە کۆڕەماندا دەمانەوێ هەم تیشکی عەقڵو هەم شەرعیش بخەینە سەر دیموکڕاسی بۆ ئەوەی دیموکراسی هەم وەك خۆی لەواقیع دا چۆنە ئاوا بیناسینو هەم لەتەرازووی شەرعیشدا هەڵی سەنگێنین.

وە بەڕاستی ئێمە وەك خەڵکی کوردستان کە لەم بەشە کوردستانەی سەر بەعێراق دا بەرەو گۆڕانکارییەکی گەورە دەچین، جێی خۆیەتی کە لەم هەلو مەرجەدا هەموو لایەکمان هەوڵبدەین زۆر بەڕوونیو راشکاوی هەڵوێستو بیرو بۆچونی خۆمان لەبارەی ئەو بابەتو مەسەلە باوانەی کەکاریگەرییان لەسەر ئاکاموچارەنووسی میللەتەکەمان هەیە، بخەینەڕوو.

جا ئێمە وەك ئیسلامیی دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەی وردو قووڵمان لەبارەی ئایینو بەرنامەی خوای بێ وێنەوە کردووە -وێڕای حوکمی ئیمانو عەقیدە- لەهەمو ڕوویێکەوە ڕاستییەکانی ئیسلامو شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێمان بۆ ڕوون بۆتەوەو زۆر بەدڵنیاییو پشت ئەستوورییەوە لەبارەی دینەکەمانەوە دەڵێین: ئیسلام هیچ شتێکی تێدا نیە.

لەگـەڵ عـەقڵو فیطرەت دا دژو پێچەوانە بێت، یان لەگەڵ بەرژەوەندییەکی ڕاستەقینەی تاكو کۆمەڵدا تێك بگیرێ

وە تـەنها ئـەوەش بەدڵسۆزیی بۆ میللەتو وڵاتمان دەزانین کەبێ پەردە بەڕاشـکاویی هەڵوێسـتو بـیرو بۆچـوونیخۆمان دەربـارەی هـەر بابـەتو مەسـەلەیەکی گـرنگ و پەیوەندیدار بە چارەنووسی هەموو لایەکەوە بخەینە ڕوو، جـا یەکـێك لـە مەسـەلە هـەرە باوەکـانی ئەم ڕۆژگارەمان بریتیە لە مەسـەلەی (دیموکراسـیی). کەبەگشـتی لـەبارەی دیموکراسی یەوە سێ جۆرە هەڵوێست هەن.

١- هەڵوێسـتێك کـە دیموکڕاسیی بەکوڵكو پێستەوە قبووڵەو پێی وایە هیچ جۆرە هەڵەو کەمو کوڕییەکی تێدانیەو بەفری بێ پەڵەیە!

٢- وە هەڵوێسـتێك کـە پێچـەوانەی یەکەمـەو دەڵـێ: دیموکراسیی یەکجار خـراپ و زیانبەخشـەو بـە هـیچ جۆرێـك خـێری پـێوە نیەو بە کەڵکی هیچ نایەت!

٣- هەڵوێســتی ســێیەمیش ئەوەیــە کــەدەڵێ: دیموکڕاســی بــیردۆزەو ئەزموونـێکی بەشـەرە لـەبواری حوکمڕانـیی داو هـەم لایـەنی چاكو هەم خراپیشـی هـەنو ناگونجێ بەموتڵەقی قبووڵ یان ڕەفز بکرێ! جا دیارە ئێمە هەڵوێسـتی سـێیەمان بـەلاوە ڕاسـتو پەسـەندەو خوا پشتیوان بێ لەم بڕە توێژیـنەوەو هەڵسـەنگاندنە شـان دا دیموکڕاسـی بژار دەکەینو لە بێژینگ دەدەینو (کا)و (دان)ی لەیەك جیا دەکەینەوە.

بابەتەکەشمان لەم پێنج تەوەرەدا پێشکەش دەکەین:

یەکەم: پێناسەی دیموکڕاسیو بنەما سەرەکییەکانی.

دووەم: سەرگوزشتەی دیموکڕاسیو کەیو چۆن و لەکوێ سەری هەڵدا؟!

سێیەم: سەرنج دانی دیموکڕاسی لەبەر تیشکی عەقڵ دا.

چوارەم: هەڵسەنگاندنی دیموکڕاسی لە تەرازووی شەرعدا.

پێنجەم: ئەنجامگیریی.

سەرەتا پێویستە ئەوەش بڵێم:

کە ئێمە ئەگەر بمانەوێ هەقی پێویست بدەینە هەرکام لەو پێنج تەوەرەیە بێگومان پێویستیان بەکاتێکیزۆر زیاتر دەکات، بۆیە دەبێ هەموو لایەك بزانن کە ئێمە زۆ بە پوختیو گوشراوی بابەتەکەمان دەخەینەڕوو، وەهەموو شتێك نالێین بەڵکو تەنها ئەو شتانەی کەگوتنیان پێویست ترەو بۆمان دەلوێ باسیان دەکەین:

## یەکەم : پێناسەو بنەماکانی دیموکراسی:-

لەبارەیپێناسەی وشەی (دیموکراسی)یەوە زۆر شت گوتراوەو گەلێك پێناسەی جۆراو جۆر لەوبارەوە لەکتێبو سەرچاوەکاندا هاتوون، بەڵام ئێمە لێرەدا هەر بەکورتی دەڵێین:

وشەی دیموکراسی (Democracy) وشەیەکی ئاوێتە (کلمة مرکبة) یەو لەئەسڵ دا ئیغریقییەو لەهەردووك وشەی دیمۆس (Demos) کە بەمانای گەل (شعب) دێو کراتۆس (kratos) کە بەمانای حوکم دێ، پێکهاتووە.

وەك زاراوەیەکی سیاسیش بریتیە لە:

(حوکمی گەل بەهۆی گەلەوەو لەپێناوی بەرژەوەندی گەل دا) کەواتە: دیموکراسی ئەو شێوەو سیستەمەی حوکمڕانییە کەخەڵكو میللەت تێیداخاوەنی دەستەڵاتە، چ لەڕووی یاسادانانو چ لەڕووی هەڵبژاردنی بەرپرسانو کارپێ سپاردنیانو، چ لەڕووی دەستەڵاتی دادگاییو لەڕووی دەزگاکانیچاودێریو لێپرسینەوەی کاربەدەستو حوکمڕانانەوە.

هەروەها لەبارەی بنەمایەکانی دیموکراسیشەوە دیسان گەلێك شت گوتراوەو هەندێك لە لێکۆڵەرەوان (٧-١٠) بنەمایان بۆ دیموکراسی ژماردوون، بەڵام پێم وایە ئەم چوار بنەمایەی دیموکراسی تێکڕای بنەمایەکانی دیکەی دەگرنە خۆیانو سەرجەم دیموکراسیخوازانیش لەسەریان کۆكو تەبان

### ١- باڵا دەستیی گەل (حاکمیة الشعب):

کە مەبەست پێی هەمەکار بوونیخەڵكو میللەتە لەهەموو ڕووەکانی یاسادانان (السلطة التشریعیة)و دیاریکردنو کارپێ سپاردنیکاربەدەستان (السلطة التنفیذیة) ودادگا (القضاء)دوە، واتە : ئەم بنەمایە دەڵێ

دەبێ‌گەلو میللەت دەستەلاتی ڕەها (السلط المط[redacted]ی هەبێت چۆنی پێ باش بوو، وەچی پێ‌خۆش بوو وا بڕیار بدات.

شایانی‌باسیشە کەئەم بنەمای یەکەمە بەبڕبڕەی پشتی دیموکڕاسی‌و گەورەترین‌و گرنگترین بنەمای دیموکڕاسی دادەنرێ‌و بنەمایەکانی‌دیکە هەموویان ڕیشەیان دێتەوە سەر ئەم بەردی بناغەیەی دیموکراسی.

**٢- سەروەریی یاسا (سیادة القانون):**

مەبەست پێی مل کەچی هەموولایەکە بە حوکمڕان‌و ڕەعییەتەوە بەدەستوورو یاساوە، کەدەستوور بەزۆری لەڕێی ڕاپرسی گشتی (الاستفتاء العام)ەوە پەیدا دەبێ‌و یاساکان (القوانین)یش لەلایەن ئەنجوومەنی یاسادانان (مجلس التشریع)ەوە دادەنرێن.

**٣- مافەکانی مرۆڤ‌و ئازادییە گشتی‌یەکان (حقوق الانسان والحریات العامة):-**

مەبەستیش لەمافەکانی مرۆڤ یان ئازادییە گشتی‌یەکان، ئەوەیە کە هاوولاتیان هەم ئازاد (حر) بن‌و هەم یەکسانیش بن، جا ئازادیی زۆر بوار دەگرێتەوە بەلام ئەم چوار بوارە سەرجەم دیموکڕاسیخوازەکان لەسەریان یەکدەنگن، ئازادیی کەسایەتی (الحریە الشخصیة)و، ئازادیی کۆمەلایەتی‌و، ئازادیی ئابووری‌و،ئازادیی سیاسی.

یەکسانییش دیسان زۆر شت دەگرێتەوە، بەلام لەم چوار ڕووەوە هەموو لایەك لەسەریان کۆکن: یەکسانی لەبەرانبەر یاساداو، لەبەردەم دادگاداو، لەڕووی ئەرك پێ سپێرانەوەو لەڕووی ئەرکەکانی سەرشانەوە.

**٤- لەیەك جیاكردنەوەی دستەلاّتەكان لە یەكتری (الفصل بين السلطات)**

کـە مەبەسـت پێیان هەرسێك دەستەلاّتی: یاسادانانو جیٚبەجیٚكردنو دادگا (التشريعية والتنفيذية والقضائية)ن.

دیـارە وەك پێشتریش گوتمان: هەم لەبارەی پێناسەی (دیموكراسی) یەوەو هــەم لــەبارەی بنەماو پێكهێنەرەكانیەوە دەگونجیٚگەلیك شت بگوتریٚ، بەلاّم ئەوەی لێرەدا گوتمان پوختەی ئەو قسەو باسانەیەو هەموو لایەكیش لەسەری كۆكو تەبان.

بــەم ئەندازەیەش كۆتایی بە خالّی یەكەمی بابەتەكەمان دێنیٖو دەچینە ســەر تــەوەرەو خــالّی دووەمــی بابەتەكــەمان كەبریتــیە لەبەســەرهاتو سەرگوزشــتەی پــەیدابوونی (دیموكراسـی)، شایانی باسیشە كە ئێمە قسەو باسو بۆ چوونو هەلّسەنگاندنی خۆمان لەبارەی دیموكراسییەوە هەلّدەگرین بــۆ خالّــەكانی داهــاتوو، بۆیــە لێرەدا تەنها باسی مەسەلەكان دەكەین وەك خۆیان.

## دووەم : دیموکڕاسی کەی و چۆن سەری هەڵدا :-

ئایا ئەو دیموکڕاسی یەی کەئێستا وەك سیستەمێکی حوکمڕانی هەیە لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە هەر بەو شێوەیە بووە یان بەجۆرێکی دیکە بووەو پاشان وردە وردەو پلە پلە گۆڕانی بەسەردا هاتووەو گەشەی‌کردووە هەتا سەری بەم سیماو سروشتەی ئێستای گەیشتووە؟!

هەندێك کەس وادەزانێ کەدیموکڕاسی هەرلەسەرەتاوە بەوشێوەو چۆنیەتیەی کەئێستا هەیە هەر وابووە!

بەلاّم بەراستی دیموکڕاسی وەك هەر بیردۆزەو بۆ چوونو ئەزموونێکی دیکەی مرۆڤ لەسەرەتاوە شێوەیەکی‌زۆر سادەو جیاوازی لەوەی ئێستای هەبووەو پاشان وردە وردە گەشەی‌کردوەو گۆڕانی بەسەرداهاتووەو کەمو زیادی تێدا کراوە،هەتا سەرەنجام لەسەر ئەو شێوەو چۆنیەتیەی ئێستاقەراری گرتوە، وەبێگومان ئێستاش بەردەوام لە گۆڕانو کەمو زیادی دایەو، بگرە ئێستاش دیموکراسی بەگوێرەی گۆڕانو جیاوازی ژینگەو کۆمەلّگایەکان شێوەو دیمەنی‌جۆراو جۆری بەخۆیەوە گرتوون!

بۆیەش ئاماژەم بۆ ئەو مەسەلەیە کرد تاکو هیچ کەس وانەزانێ کەدیموکڕاسی-وەك سیستەمی حوکمڕانی ئیسلام- لەچەند بنەماو پێکهێنەرێکی چەسپاوو نەگۆڕ پێکهاتوەو ناگونجێ گۆڕانکاریی چاك‌و خراپی بەسەردا بهێنرێ‌و لەئەنجامی ئارەزوو و بەرژەوەندیی جەماوەرو دەستەلاّتدارانەوە کارێکی بەسەر بهێنرێ کە ڕاست پێچەوانەی جەوهەرو نیوەرۆکی خۆی بێت‌و بکرێتە بازیچە (العوبة) یەکی شوومو بێ‌خێر!!

ئەگەر لەڕووی مێژووییەوە تەماشای دیموکراسی بکەین دەبینین کەوەك کتێبەکانی مێژوو ئەو سەرچاوانەی کەباسی ڕەگو ڕیشەی دیموکراسی دەکەن

لــە قوولایــی مــێژوودا دەڵێن: یەکەمین میللەتێك کە بەو شێوازو سیستەمە وڵاتیان بەڕێوە بردوە، (ئیغریقی)یەکان بوون کە لەهەردووك شاری (یۆنان)ی ئێســتادا (ئــەثینــاو ئیسبارطة) کەئەوکات هەر شارێك دەوڵەتێك بووە، لەو دوو شــارەدا بــۆ یەکــەمین جــار ئــەزموونی دیموکڕاسی بەشێوەیەکی سادەی ئەوکاتــە، ئــەو سیســتەمە کاری پێکراوە، بەڵام سەرچاوە مێژووییەکان باس دەکــەن کــە دیموکڕاســیەتی ئەو کاتە دیموکڕاسیەتی ڕاستەوخۆ (الدیمقراطـیة المباشـرة) بــووە، واتــە خەڵك هەمووی لەگۆڕەپانێکدا کۆبوونەتەوەو بڕیاریان لەسەر هەر مەسەلەیەکی گرنگو چارەنووسساز داوە نەك لەڕێی پەرلەمانو ئەنجوومەنــێکەوە کەمــیللەت هــەڵی دەبژێــرێو دوایــی ڕاو مافــەکانیخۆی تەســلیمی ئــەو ئەنجوومەنــە دەکــات، بــەڵکو لەدیموکڕاسی ئەوکاتەدا خەڵك هەموو جارێ بۆ هەر مەسەلەیەکی گرنگ کۆبوونەتەوەو بڕیاریان داوە.

بــەڵام پێویســتە بزانــرێ کــە لە دیموکراسیەتی یۆناندا نەئافرەتان مافی ڕەئــی دانو ڕادەربڕینــیان هــەبووە وە نەکۆیلەکانیش، کە ئافرەتان ئاشکرایە نــیوەی کۆمــەڵگا بــوون بــەلای کەمەوە کۆیلەکانیش هەندێك جاران زۆر لە خەڵکە ئازادەکە زیاتر بوون!

بەڵێ هەر لەو سەرەتایەوە (دیموکڕاسی) بەشێوەیەکیئاوا هاتوە! کەواتە ئــەو دیموکراســیەی کەخــەڵك ئــەو هــەموو خەونو خەیاڵە شیرینانەی پێوە دەبیــنن، لەســەرتاوە بــەو جۆرە نەبووە ئنجا دوای ئەوە یەکەمین ئەزموونی دیموکراســی لەمــێژوودا لەبــەین چووبەهۆی لەبەین چوونی ئەو دوو شارەوەو لەبــەین چوونی ئەو دوو دەوڵەتەوە لەیۆنانی کۆندا، ئەزموونی دیموکڕاسیش یەکجاری سەری ناوەتەوە. لەو کاتدا.

پاش کۆتایی پێ هاتنی ئەو یەکەمین ئەزموونەی دیموکراسی لەیۆناندا سەرجەم ولاّتانی ئەوروپاو رۆژئاواش بەگشتی بەیۆنانیشەوە، هەم پێش هاتنی (عیسی) علیه الصلاه والسلامو هەم دوای هاتنیشی، سیستەمو حوکمی دەرەبەگایەتی: (الاقطاعیة)یان تێدا حاکم بووە.

وە لەژێر تینو فشاری (قیصر)و پادشاکانی ئەو کاتەدا هەر بە ماوەیەکی کەم دوای بلاّوبوونەوەی ئایینی (مسیح) علیه السلام وبەهۆی تەنازول کردنی جیلەکانی دوای جیلی(حواریین) لەبانگەوازکارەکان، ئایینی (عیسی) گۆڕاو شێوێنراو لەنێوەڕۆکی خۆی خالّی بۆوەو تەسلیمی ئیرادەی طاغووتییانەی قەیصەرو پادشاو دەرەبەگە چەوسێنەرەکان بوو، وە بەزمانی عیساشەوە علیه السلام ئەو دروشمەیان بەرز کردەوە: (دع ما لله لله وما لقیصر لقیصر) ئەوەی عایدی خوایە بۆ خوای لێگەرێو ئەوەش هی قەیصەرە بۆ قەیصەری واز لێ بێنە!

مەبەستیش لەم درووشمە ئەوە بوو کەبەرەسمیو بەناوی دینەوە لەیەك دابڕانو جیایی دینو ژین ڕابگەیەندرێ! بۆیە زۆر لەمێژوونووسو لێکۆلّەرەوان ئەو قسەیەی نەصرانییەکان بەزاری عیساوە دەیگێڕنەوە بەدرۆو بوختانێکی هەلّبەستراوی دادەنێن، چونکە هیچ ماقوولّ نییە عیسایەك علیه السلام کەبۆ ئەوە نێرراوە خەلّکی فێری بەندایەتی کردن بۆ خوا بکات ژیانو گوزەرانیان بەپێی بەرنامەو ڕێبازی خوا ڕێك بخات ﴿وَمُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ، إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ (آل عمران: ٥٠-٥١) .

بەهیچ جۆرێكو لەژێر هیچ فشارێك دا دەستبەرداری ئەو راستیە گرنگو گەورەیەی ئاینەکی ببێ، کەلەڕاستیدا جەوهەرو کاکلّی دینەکەی پێك دێنێ!!

بەڵێ بەڕێزان! هەر لە زووەوە نەصرانیەت تەنازولی بۆسیستەمی طاغووتیيانەی دەرەبەگایەتی ژێر ڕکیفی قەیصەرو پادشا دیکتاتۆرەکان کردو لەجیاتی ئەوەی ئەوان بگۆڕێو چاك بکاتو ڕاست بکاتەوە، بۆ خۆی لەسۆنگەی لاوازیی‌و خۆڕانەگریی پێشەواو دەمڕاستەکانیەوە- گۆڕاو شێواو خوار بوو!

جا هەر چەندە ئەوە بەڵایەکی گەورەو بوو کەبەسەر ئایینی مەسیحیەت هات کە ئیقراریێ‌کرد هەقی بەسەر ژیانو گوزەرانی خەڵکەوە نیە! بەڵام بەڵاو گرفتی لەوە گەورەتری ئەو ئایینە ئەوە بوو کەدواتر پێشەواو ریش سپی‌یەکانی وەك قەرەبوو کردنەوەیەکی ئەو دوور خرانەوەیەی ئایینەکەیانەوە لەگۆڕەپانی ژیانو گوزەران هەڵسان بەدورستکردنی چینی ئەکلیرۆس واتە چینی پیاوانی‌ئایینی: (طبقة رجال الدين).

کە لە ڕاستی‌دا ئەو کارە داهێنان (إبتداع)ێکی‌زۆر شوومو خراپ بوو، وەئاکامو ئەنجامی یەکجار زیانبەخشی لێکەوتنەوە، کەلەئاڵقەی دووەمو لەباسی چۆنیەتی‌سەرهەڵدانی ڕێچکەی بێ دینایەتی (سیکۆلاریزم)دا تاڕادەیەك ئاماژەمان بۆ کردوونو لێرەدا دووبارەیان ناکەمەوە.

بەڵێ پاپاو قەشەکان ئەو ڕێزو حورمەتەی کەخەڵكو میللەت لێی دەگرتن کەڵکی خراپیان لێوەرگرتو (إستغلال)یانکرد بۆ بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیانو خۆیان لەخەڵكو جەماوەر کردە چینێکی جیاواز کە بە درێژایی مێژووی وڵاتانی رۆژئاوا وردە وردە گەشەی کردو پەرەی ستاند تا وای لێهات کەنەك هەر توانای پێشبڕکەو مل بەملە (منافسة)و گوریس پچڕکێنەی لەگەڵ قەیصەرو پادشاکان دا هەبێت، بگرە بەسەریشیان دا زاڵ بێتو بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆشیەوە!

بەڵام بەداخەوە ئەو چینی ئەکلیرۆسە دەستەڵاتەکەی خۆی بۆ سەرخستنو پیادەکردنی ئایین بەکارنەهێنا، بەڵکو بۆ دابین کردنی بەرژەوەندییە

پێغەمبەرانیش هەتا خەڵك ئیمانی پێ نەهێنابن‌و تا جەماوەریان لەگەڵ دا نەبوو بێت جاری حوكمی ئیسلامییان نەداوە، ئەگەر نا لە پێغەمبەران بترازێ (علیهم الصلاة والسلام) هەموو خەلیفەو دەستەڵاتدارە شەرعییەكان خەڵك هەڵی بژاردوون، وە حوكمڕانانێك بیانووی شەرعییەتیان هەبێ دەبێت گەل هەڵیان بژێرێ، جا ئەگەر بەدیلی دیموكڕاسی دیكتاتۆریەت‌و سیوكراسیەت‌و ئیرستۆكراسییەت‌و ئەو شتانە بێ، ئەوە بەتەئكید دیموكراسی لە چاو ئەوان بە حەوت ئاوان شۆراوەتەوەو، ئەوان زۆر لەدیموكراسی خراپترن!

ئنجا ئێمە بۆ نرخاندن و هەڵسەنگاندنی دیموكڕاسی‌و هەرجۆرە ڕێچكەو بیرۆدۆزەیەكی دیكەش دەبێ وریا بین‌و هەق‌و ناهەق تێكەڵ نەكەین، دادگەرانە لە بێژینگی بدەین‌و (كا) و (دان)ی لەیەك جیا بكەینەوەو، بۆ ڕاست‌و هەق حیسابی هەق‌و بۆ هەڵەو ناهەقیش حیسابی ناهەق بكەین، باسەرنج بدەین چۆن خوای كاربەجێ‌و دادگەر ڕووی دواندن (خطاب) لەئەهلی كیتاب دەكات‌و لەسەر ئەوە سەرزەنشتیان دەكات كە بۆچی هەق‌و ناهەق تێكەڵ دەكەن؟! دەفەرموێت: ﴿**يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ**﴾(آل عمران: من الآية٧١)، یان دەفەرموێ: ﴿**وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ**﴾(البقرة: من الآية٤٢) واتە: وە هەق‌و باطیل تێكەڵ مەكەن، موشكیلەی بیردۆزەو ڕێچەكەكان ئەوەیە كەچاك‌و خراپ تێكەڵ دەكەن، حەق‌و باطل تیكەڵ دەكەن، بەڵام ئێمە پێویستە هەم هەقەكەیان ببینین، وە هەم باطیلە كەشیان ببینین خوای دادگەر دەفەرموێت: ﴿**وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا**﴾(المائدة: من الآية٨) واتە: با ڕق هەڵسانتان لەكۆمەڵێك واتان لێنەكات كە نادادگەربن.

ئیسلام ئاوا شوێن كەوتووانی خۆی ڕادەهێنێ، نەك بڵێی فلان كەس تۆ هیچ شتێكت بەكەڵك نایەت!! ئەوە حوكمێكی عاتیفییە، چونكە هیچ

کەسێك نیـیـە هـیـچ شـتێکی بەکـەڵك نەیەتو،هیچ فیکرەیەك نیـیە هیچ شـتێکی باشـی تـێدا نەبێـت، بـۆ نموونـە: (سۆسـیالیزم) کـەبۆ خـۆی لـە کاردانــەوەی ســەرمایەداریی (کاپیتالــیزمدا) پــەیدا بــوو و لەکاردانــەوەی چەوسـاندنەوەی چـینی کـرێکار سەری هەڵدا، چۆن هیچی بەکەڵك نایەت؟!! بـێگومان شـتی باشـی تـێدایە، بـەڵام فەلسـەفەکەیو کـرۆکەکەی بەکەڵك نایــەت، هەروەها دیموکراسیەتیش فەلسەفەکەیو کاکڵەکەی بەکەڵك نایەت، کەبریتـیە لـەوەی دیاریکـردنی حەڵاڵو حەڕام دەداتە دەست خەڵك! کە ئەوە پیسـترینو خـراپترین لایەنی سەلبی دیموکراسیەتە کەلە ئەنجامی ئەوەدا چی ڕوو دەدات؟ نموونەیـەك دێـنمەوە: لەهـەمو دونیادا باوە بۆیە لێرەش باسی بکـەین شـتێکی سـادەیە کـە لـە پەرلەمانـەکانی ئـەورووپادا موناقەشـە دەکرێـتو لەسـەر (تەلەفزیۆن)ەکان بانگەشە دەکرێ کەخێزانی یەك خانەیی دروسـت بکەن یانی پیاوێكو پیاوێك ببنە هاوسەری یەکتری، یان ئافرەتێكو ئافرەتـێك!! ئا ئەوە لەپەرلەمان قەرار دەدرێ!! دیارە وەختێك حەڵاڵو حەڕام دیـاری کـردنو قیەم دیاری کردن عایدی میللەت بێت ئەومیللەتە چۆنی پێ خـۆش بـوو.. وا دەکـات، (کلنتۆن) کاتی خۆی وەك هەمووتان ئاگادارن بۆ (پـروپاگەندەی هەڵـبژاردن) نێربازیی بە ڕەوا دانا لەنێو سوپای ئەمریکی دا بـۆ ئـەوەی ڕەئـی زیاتـر بێـنێ!! تەماشـا بکەن مرۆڤ کەخوای نەناسی، وە کەپەیوەسـت نەبوو بەحەڵاڵو حەرامێك کەخوا دەکات، دیارە چۆن ئارەزووی بێـت وا دەکـات ئەگـەر بڵـێن: نـێربازیی پێویسـتە بـۆ ئەوەی ڕەئی زیاتر وەدەسـت بێـنی، ئـەوە ڕەوای دەکات، وە ئەگەر بڵێن: (ڕیبا) ڕەوا بکەن بۆ ئـەوەی سـەرمایەدارەکان خۆشـیان بوێت وا دەکەن، وە ئەگەر قازانج لەوەدا بێـت کەبـەبێ بەڵگـە (قـودس) بەپایەتەختی قەوارەی (ئیسرائیل) دابنرێت (ئـاخیر پـێم نالـێی کۆنگرێسـی ئەمـەریکی چ پـەیوەندی هەیە بەوڵاتێکی

دیکەوە؟) ئەوە لەوێ ڕا قودس بەپایتەختی قەوارەی جوولەکە دیاری دەکات بۆ ئەوەی (لۆبی) جوولەکە لەخۆ ڕازی بکات!!

دووەم: شووڕای ئیسلامی یەکسان نی‌یە بەدیموکڕاسی:- بەداخەوە هەندێك خەڵکی ئیسلامیی وا حاڵی بووە کە ئیسلامیش هەر دیموکڕاسییە!! بەڵام بێگومان شووڕای ئیسلامی لەگەڵ دیموکڕاسی زۆر جیایە، چونکە شوورا لەئیسلام دا ئەوەیە کەمسوڵمانان ڕاوێژ دەکەن و پرس‌و ڕا بەیەکتر دەکەن‌و لێ دەکۆڵنەوە،بەڵام هەمووی لە چوارچێوەی شەریعەتداو لەبەر تیشکی (قورئان‌و سوننەت)دا نەك شەریعەت لەولا دابنێن‌و گوێی پێ نەدەن ئینجا بە کەیفی خۆیان حەڵاڵ‌و حەرام دیاری بکەن!

هی وا هەیە دەڵێ میللەتێکی مسوڵمان ئەگەر دیموکڕاسیەت جێ‌بەجێ بکات خۆ هەر دەبێ بەپێی شەریعەت بێت! ئێمەش دەڵێین: ئاخر ئەوکاتە پێی ناگوترێت دیموکڕاسی، یەکێك لەوانە (دکتۆر یوسف القرضاوي)، کەمن ڕێزم بۆی هەیە بەڕاستی نووسەرێکی بلیمەت‌و زانایەکی گەورەی ئیسلامە خوا پاداشتی بداتەوەو کتێبی زۆر بەسوودی هەن، بەڵام بەڕاستی لەمەسەلەی دیموکڕاسی دا پێم وایە بەهەڵەدا چووە، بۆ وێنە لەکتێبێکی دا بەناوی (من فقه الدولة في الاسلام) ص ٣٧ دەڵێت: ئیسلام لەگەڵ جەوهەری دیموکڕاسیدا هیچ ناکۆکی نی‌یە، چونکە جەوهەری دیموکڕاسی، یانی‌ماف بۆ خەڵك دیاری بکرێت‌و سوڵتە بەدەستی میللەتەوە بێت‌و هەڵبژاردن بکرێ‌و خەڵك ئازادی بیروڕای‌هەبێت‌و، بەڵام ئێمە لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ ئەو شتانە هەندێك میکانیزمی دیموکڕاسین‌و لەخودی خۆیاندا شتی باشیشن، بەڵام بەمەرجێك کە بخرێنە سەر ئەصلێکی ڕاست‌و باش‌و سوودی خراپیان لێ وەرنەگیرێ، بەڵام بەڕاستی جەهەری دیموکڕاسی ئەو شتانە نین، بەڵکو کاکڵ‌و هەناوو جەوهەری دیموکڕاسی (حوکمی گەل)ە ئەوەیە

کەخەڵكو جەماوەر بۆ خۆی حەڵاڵو حەرام و خێرو شەڕو بەکورتی بەرنامەی ژیـانی خۆی دابنێ، بێ ئەوەی هیچ پرسو رایەك بەخواو پێغەمبەری خواﷺو بـەدین بکـات! ئا ئەوەیە جەوهەری دیموکراسی ئینجا کاتێکیش دیموکڕاسی پابـەند بکـرێ بەشــەریعەتەوەو وای لێ بکرێ کە بەموو لێی لانەدات، ئەوە ئەوکاتــە پـێی ناگوترێ دیموکراسی، وە ڕاستیش نیە وای پێ بگوترێ چونکە لانەدان لە بەرنامەو شەریعەتی خوا حوکمی خوا (حكم الله)یە نەك حوکمی گەل (حكم الشعب).

هــەروەها نـاو لێگۆڕیـنی دیموکراسیش وەك هەندێك لە ئیسلامی‌یەکان پێـیان باشــە بگوتــرێ: (شووڕاکڕاســی) شـتێکی هەڵەو بێ پاساوە، چونکە ئەگــەر ئــەوەی کەمومارەســە دەکــرێ بــەناوی دیموکڕاســییەوە لــەڕووی دیاریکــردنی حــەڵاڵو حــەڕامو ســنوورەکانەوە پابــەند بــێ بەشــەریعەتو حوکمیخـواوە ئەوە لەدیموکراسی شۆراوەو بۆتە ئیسلام: بۆیە راست نیە پێی بگوتــرێ دیموکڕاســی، وە ئەگــەر گوێــش بەشەریعەتو حوکمی خوا نەداتو بگەڕێــتەوە بــۆ ڕای جەماوەرو خەڵك ئەوە هەر دیموکڕاسییەو غەدرو هەڵەیە هەر ناوێکی دیکەی لێ بنرێ!.

سێیەم: لەم خاڵەدا ئەم سێ راستیە دەخەمەڕوو:-

یــەك: ئیســلام بەدیلــە بــۆ دیموکراســیو هــەر ڕێچــکەو ڕێبازێکی دیکەش، چــونکە ئیســلام لایەنــە چــاكو ئیجابیــیەکانی هــەموویانی لــەخۆیدا کۆکردۆتەوەو لەهەڵەو کەمو کوڕییەکانیشیان دوورە، جا هەرچەندە قسەکردن لــەبارەی سیستەمی سیاسی ئیسلام (الـنظام السياسي في الإسلام) پێویستی بــەکاتو شــوێنێکی تایــبەتیو تەرخان کراو هەیەو خوا یاربێ لە داهاتوودا پــێی هەڵدەســتین، بــەڵام هـــەر بـــەکورتی ئاماژەیـــەك بـــۆ بـــنەما سەرەکییەکانیدەکەین، کە دەتوانین بڵێین ئەم حەوتەن:

١- حوكمڕانیەتی باڵا (الحاكمية العليا) تەنها هی خوایە تبارك وتعالى.
٢- سەروەریی بۆ شەریعەتی خوایە (السيادة لشريعة الله).
٣- دەستەڵات هی خەڵكو میللەتە: (السلطة للشعب).
٤- ڕاوێژ بناغەی كاروباری بەڕێوەبردنە (الشورى أساس إدارة الامور).
٥- خەڵكی بۆ دابین كرانی ڕێزو مافی ئازادیی‌دا یەكسانن (مساواة الناس في الكرامة والحقوق والحرية).
٦- فەرمانبەریی تەنها لەسنووری شەرع دایە : (الطاعة فی حدود الشرع فقط).
٧- هەموو لایەك بەرپرسیارنو فەرمان بەچاكەو ڕێگرتن لەخراپەو هەقبێژییو چاودێرییو لێپرسینەوەو راستكردنەوەی بەرپرسانو لەكاتی پێویست دا لادانیان، مافێكی‌شەرعیو بگرە ئەركێكی پێویستی سەرشانی سەرجەم هاووڵاتیانە.
دوو: ئیسلام سەرجەم خاڵە بەهێزو ئیجابی‌یەكانی دیموكراسی گرتوونە نێو خۆی بەڵام بەشێوەیەكی چاكترو بەدووریش لەكەمو كورییەكانیان، وەلەخاڵە خراپو بێ هێزەكانیشی بەریە بەتایبەت جەوهەرو نێوەڕۆكەكەی كەبریتیە لە جیاتی خوا بەپەرستراوادانانی ئینسان (تألیه الانسان) كەلە پەرلەمانو ئەنجوومەنێك داخۆی دەنوێنێ كەبەبێ ئیزنی خوا بەرنامەو دەستوورو یاساكانی ژیان بۆ خەڵكی دادەنێ!
وەلە ڕاستی‌دا لایەنە چاكەكانی دیموكراسی كەبریتین لەمیكانیزم (ألية)ەكانی، لەسۆنگەی ئەو جەهەرو نێوەڕۆكو ڕووحە شیركییەیەوە، وەك كۆمەڵە سەربازێكی باشی یەخسیری دەستی طاغعووتو دیكتاتۆرێكیان لێ دێتو لەجیاتی خێرو چاكە شەڕو زیانیان لێ دەكەوێتەوە، بەڵام ئیسلام

چـونکە ئـەو میکانــیزمە باشــانە پەیوەسـت دەکـات بەچـەند بــنەڕەتو سـنوورێکی مەحکەمــەوە، کەڕێــیان لــێدەگرنو دەیانپارێزن لەو تێکچوونو گەڵندەڵ بوونە،لەو سەرەنجامە شوومە پارێزراوە.

سـێ: نکوولّـی لـەوە ناکـرێ کـە سیستەمی حوکمڕانی ئیسلام پاش چاخی زێڕیــنی خـۆی کەسـەردەمی پێغەمــبەری خوا ﷺو خەلیفە راشیدەکانیەتی، لەسـۆنگەی نـەمانی شـووراوە بـەهۆی سـەپاندی سیسـتەمی دەسـتەڵاتی تاکڕەوێـتی (نظـام السـلطة الفردية)یەوە. کەپێغەمبەری خواﷺ ناوی ليناوە: (ملكـاً جبرياً) یان (ملك عضوض)وە کەلە رۆژگاری موعاويەی کوڕی ئەبوو سـوفیانەوە دەسـتی پـێ کـرد، میکانـیزمە ئیداریــیەکانی وەك پێویسـت گەشەیان نەکردوە، بە پێچەوانەی دیموکڕاسییەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی :

أ- مسـولّمان دەبـێ هەمیشــە بەدوا شتی چاكو بەسووددا بگەڕێ، (الحكمة ضالة المؤمن أينما وجدها فهو أحق بها).

ب- هـەم پێغەمــبەری خواﷺو هەم خەلیفە راشیدەکانی بەتایبەت (عمر بن الخطاب) خوا لەهەموویان ڕازی بێت، لەرۆژگاری خۆیاندا لەڕووی ئیدارییەوە لەدەولّـەتی فـارسو رۆم بەهرەیان وەرگرتوەو گەلێك شت لەوانەوە فێربوون. بێ ئەوەی هەست بەهیچ جۆرە سەغڵەتی‌یەك بکەن.

ج- زۆر لــەو گەشــەکردنو بەرەو پێش چوونە سیاسییو ئیداریو زانستییەی ئێستای رۆژئاوا لەسەرەتاوە بەرهەمی رەنگدانەوەو کارتێکردنی شارستانێتی ئیســلامیی بووەو، کورد گوتەنی: رۆنی خۆمانە لەسەری خۆمانی دەدەنەوە، بەدان پێداهێنانی خەلّکێکی بەویژدانی خۆیان ، بۆیە:

بەهرە لێوەرگرتنیان نەك هەر ڕەوا (مباح) بگرە فەرزیشە!

ئەمــە کورتەیــەکی گوشــراو بــوو لەبارەی دیموکڕاسییەوە لەبەر تیشکی عــەقڵ‌و شــەرعدا، هــیوادارم توانیــبم لەقەددەر ئەم دەرفەتە هەقی خۆی پێ بدەم.

والحمد لله رب العالمين

وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه وسلم ومن سار بسيرته واهتدى بهديه

# دوو ئالقه چاوپێكەوتنی
# بەرنامەی سۆراغ
# سەبارەت بە دیموكراسی

# دیموكراسی و دیكتاتۆریی
# و
# هەڵوێستی ئیسلامییانە

## بەشی یەکەم

خوێنەری بەڕێز !

ئەم چەند لاپەڕەش کە هەر دەربارەی مەسەلەی (دیموکراسی)ین دەقی چاوپێکەوتنێکی دوو ئالقەیی تەلەفزیۆنی کۆمەڵی ئیسلامییە کە لە بەرنامەی (سۆراغ) و لایەن بەڕێز مامۆستا (تۆفیق کەریم)ەوە لەگەڵ بەندەدا کراوە، لە رۆژی (١١ ی رمضان ١٤٣٣ك- ١٦ / ١٢ / ٢٠٠٢) دا لە ئەحمەدئاواو، بە باشمان زانی کە بۆ،تێر و تەسەلترکردنی لێکۆڵینەوەکەمان لە بارەی دیموکراسییەوە بیانخەینە گەڵ ئەم زنجیرە باسە :

مامۆستا تۆفیق : سەرەتا بەخێرهاتنێکی گەرمت دەکەین- مامۆستا عەلی- خۆشحاڵین بە دیدارت ، بۆ چونە ناو باسەکەش دەمەوێ بەم شێوەیە دەست پێبکەین کە دیارە جەنابت گلەییت هەیە لە ئیسلامییەکان کە تا ئێستا ناتوانن وتاری سیاسی خۆیان سەبارەت بە کێشەکان و کۆمەڵێ بیروبۆچوون و تەصەوورات هەبێ کە بە راشکاوانە رەئیی خۆیان بڵێن بە تایبەتی لە مەسەلەی دیموکراسیەت، پێم خۆشە ئەم بابەتە کە ناونیشانێکمان بۆ داناوە بە ناوی (دیموکراسیەت و دیکتاتۆریەت و هەڵوێستی ئیسلامیانە بەرامبەریان) ، جەنابت زۆر بە کورتی پێناسەیەکی هەردوو زاراوەکەمان بۆ بکەیت واتە (دیموکراسیەت) و (دیکتاتۆریە) :

+ بەڵێ ، بسم الله الرحمن الرحيم : الحمدلله و الصلاة والسلام على رسول الله محمد و اله و صحبه و من اهتدى بهداه (ربّنا اتنا من لدنك رحمة و هيء لنا من أمرنا رشدا)
پێشەکی زۆر سوپاستان دەکەم و دەست خۆشیتان لێدەکەم بۆ هەڵبژاردنی ئەو بابەتە چونکە لە ڕاستیدا ئیسلام بۆ هەر پرسیارێك وەڵامی خۆی هەیە، وە بۆ هەر کێشەو گیروگرفتێك چارەسەری خۆی هەیە، بەڵام ئەوە کە مسوڵمانان ئایا دەتوانن ئەوەی لە ئیسلامدا هەیە هەڵی هێنجن و بیخەنەڕوو وە کێشەو گرفتی کۆمەڵگاکەیانی پێ چارەسەر بکەن و وەڵامی پرسیارەکانی پێ بدەنەوە یان نا ؟! ئەوە مسوڵمانان خۆیانن بەڵام ئیسلام لە خودی خۆیدا مادام بەرنامەی تێر و تەواوی خودایە و بۆ ڕێکخستنی ژیانی بەشەر هاتووە بە درێژایی زەمان بە پانایی زەمین، دیارە دەبێ ئەوەی لە باران دا هەبێت و لە توانایدا هەبێت .

دەربارەی دیموکراسی، ئێمە پێش تریش کۆڕێکمان لەوبارەوە بەست وە ئەوەی کە لێرەدا بگونجێ بە کورتی بیڵێم دەربارەی پێناسەی دیموکراسی هەر پێناسە باوەکەیەتی کە دەڵێ ( دیموکراسی بریتی‌یە لە حوکمی گەل بۆ گەل وە لە پێناوی بەرژەوەندی گەلدا) ( حکم الشعب للشعب من أجل الشعب) دیارە هەر خودی وشەکەش کە لە دوو وشەی یۆنانی : دیمۆس ، کراتۆس . (دیمۆس) واتە : گەل، نەتەوە، (کراتۆس) واتە : حوکم ، کەواتە مانای وشەکە دەبێتە (حوکمی گەل) بەڵام ئەگەر بویستریێ ڕوونتر پێناسەی بکرێ دەبێ بگوترێ (دیموکراسی) :- بریتی‌یە لە سیستەمێکی حوکمڕانی و ڕێبازێکی فەلسەفەی کە بە بێ لەبەرچاوگرتنی خوا (جل جلالە) وە بە بێ لەبەرچاوگرتنی دینێك کە

خـوا ناردوویـەتی، وە بـەبێ لەبەرچـاوگرتنی ڕێ ڕوونـی پێغەمـبەران (علـیهم الصـلاة و السـلام) هـەر لـە خـودی گەل و میللەت سیسـتەمی حوکـم و چۆنیەتی بەڕێوەبـردنی دەوڵـەت و میللەت هەڵ دەهێنجرێ و وەردەگـیرێ، دیـارە ئـەویش چـەند بـنەمایەکی هەیـە کـە گرنگترینیان بریتی‌یە لە

١- باڵا دەسـتێتی گەل (حاکمیە الشـعب)

٢- سـەروەریی دەسـتوور و یاسا (سـیادە الدسـتور و القانون)

٣- دەبێ سـێ دەسـەڵاتەکان لەیەك جیابن

٤- زۆریـنە حوکـم دەکـەن بەسـەر کەمیـنەدا بـەڵام کەمیـنەش مـافی ڕادەربڕینی دەبێ

٥- دابـین کـردنی ئازادی‌یەکان و دابین کردنی مافە ئینسـانیەکان ماف و ئـازادی بـیروڕا، ئـازادی دەربـڕین، ئـازادی شـەخصـی ، ئـازادی سـیاسـی و ئابووری و کۆمەلایەتی هتد...

ئەوە بە کورتی پێناسـەی دیموکراسـی.

- پێچـــەوانەی دیموکراســـیەت مەســـەلەی (اســـتبدادیە-دیکتاتوریە)تە ؟

+ دیکـتاتوریەت وە (ئیسـتبدادیەت) دیـارە وشـەی دیکـتاتۆری‌یەت وشـەیەکی بـیانی‌یە لـە عـەرەبی‌دا (الفردانـیة، الحکـم الفـردي) وە لـە کوردیدا بە (تاك ڕەویی) پێناسـە کراوە.

(عـبدالرحمن) ی کەواکـیـبی زیاتـر لـە (١٠٠) سـاڵ لەمەوپـێش کتـێبی (طـبائع الاسـتبداد و مصـارع الاسـتبعاد)ی داناوە کە بە درێژی باسی ئـەو شـێوە حوکمڕانیە دەکات و باسـی زیانەکانی و شـوێنەوارە خراپ و شـوومەکانی کردووە.

دیاره حوکمی دیکتاتۆری حوکمی تاکه، حوکمی یەك دەسەڵاتداره کە هەم یاساش دادەنێ هەم جێبەجێکردنیشی لەبەر دەست دایە هەم گەلێك دەسەڵاتی دادگاشی هەر لەبەر دەستدایە واتە هەر سێ دەسەڵاتەکانی دەوڵەت لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، ئەوە بە کورتی پێناسەی دیکتاتۆری بوو.

– مامۆستا گیان لە پێناسەی دیموکراسیەتدا فەرمووت : بە بێ حیساب کردن بۆ بەرنامەی خوایی ، جا من دەڵێم: لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام بەرنامەیەکی خوایی و سەربەخۆیە بەڵام بێگومان بەرنامەکان چ ئاسمانی بن چ ئەرزی هەرچۆن بن خاڵی هاوبەشیان لە نێواندا هەر هەن. مەبەستم لەوەیە ئایا ئیسلام لە دیموکراسیەوە نزیکتر بووە یان لە دیکتاتۆریەتەوە؟

+ لێرەدا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەت یاخود تیشك خستنە سەر ئەو مەسەلەیە واتە دووری و نزیکی ئیسلام یان ڕاستتر بڵێین سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی لە دیموکراسی و دیکتاتۆرییەوە پێم باشە، دوو جۆر سەرنج لەو مەسەلەیە بدەین. هەم سەرنجێکی مێژوویی و هەم لە ڕوانگەی دەقە شەرعی‌یەکانیشەوە، دیارە مێژووی ئیسلامیش ئەو کاتەی کە مسوڵمانان بە شەریعەتی خواوە پابەند بوون کەم و زۆر هەر پەیوەست بووە بە دەقە شەرعی‌یەکانەوە بەڵام وەختێك کە مسوڵمانان لە شەرع لایان دا ئەوە مێژووی مسوڵمانانە نەك مێژووی ئیسلام ، واتە مسوڵمانان وایان ڕەفتار کردووە بەڵام ئایا چەند وەفادار بوون بۆ دینەکەیان و چەندە پابەند بوون بە دینەکەیانەوە !! ئەوە شتێکی دیکەیە، کەواتە ڕەوا نی‌یە هەڵەو کەموکوڕی و لادانی مسوڵمانان لەسەر ئیسلام حیساب بکرێ!

وەك پێشـتر باسـم كرد دیموكراسـی لەوەدا خولاسە دەبێتەوە كە هەموو شتێك بخرێتە دەستی گەل، بەڵێ هەموو شت خستنە دەستی میللەت و خەڵك و جەماوەر، بەهێزترین خاڵیانە و كۆكەرەوەترین خاڵی دیموكراسـی‌یە بـۆ هـەموو بـنەماكانی دیكـەی چـونكە ئـەوانی دیكـەی هـەمووی دەگەڕێنەوە بـۆ ئەم و لەسەر ئەو بناغەیە بنیات دەنرێن، جا بـێگومان دیموكراسـی خـاڵی هاوبەشـی زۆرن لەگـەڵ سیسـتەمی حوكمڕانی ئیسـلامدا چـونكە لـە دیموكراسـی‌دا كۆمەڵگاو میللەت هەم دەستور و یاساكانی ژیانی خۆی دیاری دەكات بە هۆی هەڵبژاردنی ئەو لایەنـەوە كـە یاسـاكان دادەنـێ واتـە (پەرلـەمان) كـە دەسـتەلاتی یاسادانان (السـلطة التشـریعیة)ی بە دەستە، وە هەم ئەو كۆمەڵەش كـە یاسـاكان (پراكتـیك) جێبەجێ دەكەن واتە (السـلطة التنفیذیة) وە هـەم دەسـتەڵاتی دادوەری (السلطة القضائیة) یش، چونكە ئەمیش چ پەرلـەمان هەڵیـبژێرێ چ ڕاسـتەوخۆ بەڕاپرسـی (اسـتفتاء)ی خـەڵك هەڵبژێررێ دیسـان ئـەویش دەگەڕێتەوە بۆ خەڵك و میللەت، دەجا لە ئیسـلامیشـدا و لـە سیسـتەمی حوكمڕانی ئیسـلامیشـدا ئـەوەی لـێ دەربچـێ كـە خـوای پـەروەردگار بۆ خۆی دیاری كردووە بۆ بەندەكانی كـە كۆمەڵـێك (اصـول و ضـوابط)ن و پێـیان دەگوتـرێ (شریعة) ئەوانە دیارە لـە پێغەمبەرەوە (علـیە الصـلاة والسـلام) تا خوارێ هیچ كەس بـۆی نی‌یـە دەسـتكاریان بكات وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ (الجاثیة ١٨)

ئاشـكرایە كـە ئـەم (خطـاب) و دواندنـە لەگـەڵ پێغەمـبەردایە (علـیە الصـلاة والسـلام): دەفەرموێ : ((ئێمە تۆمان دانا لەسەر شـەریعەتێك كـە لـە لایـەن خۆمانـەوە بۆمـان ناردوویـت شـوێنی بكـەوە شـوێنی

ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن) کەواتە پێغەمبەریش (علیە الصلاة والسلام) لە بەرانبەر شوێن کەوتنی شەریعەت دا هیچ مافی سەر پشك بوون و هەڵبژاردنی نی یە و دەبێ شوێنی بکەوێ، جا غەیری ئەوە کە خوا فەرموویەتی : بۆ وێنە چۆنیەتی پیادەکردنی ئەو شەریعەتە و چۆنیەتی هەڵبژاردنی کاربەدەستان، پاشان چاودێری کردنی کاربەدەیتان داخۆ تا چ ڕاددەیەك پابەندن بە شەریعەتەوە، پاشان چۆنێتی ئیدارەکردنی وڵات و بەرژەوەندییەکان چۆن دابین بکرێن و زەرەرەکان چۆن دوور بخرێنەوە و چۆن وڵات بەرەو پێشەوە ببرێت و بەختەوەری چۆن بۆ خەڵك دابین بکرێت چ بۆ تاك چ بۆ کۆمەڵ ...هتد؟! ئەوە هەمووی لە ئیسلامدا دەچێتە دەستی خەڵك و میللەت بەڵام خەڵك و میللەت لەژێر سایە و بازنەی شەریعەتی خوادا، بۆیەش خوای پەروەردگار شەریعەتێکی ناردووە کە دەبێت لە پێغەمبەرەوە (علیە الصلاة والسلام) یان ئەو کەسەی کە جێنیشینی پێغەمبەرە، کە خەلیفە یان ئەمیری مسوڵمانانی پێدەگوترێ، یان سەرۆك کۆماری پێدەگوترێ، مەلیکی پێدەگوترێ، سوڵتانی پێدەگوترێ، هەر نازناوێکی هەیە گرنگ نی یە، گرنگ نێوەڕۆکەکەیەتی. لەوەوە تا خوارێ (الراعي و الرعیة) حوکمڕان و میللەت دەبێ هەموویان پابەندبن بەو شەریعەتەوە هیچ کەس لە سەرووی ئەو شەریعەتەوە نی یە، کەواتە زۆربەی ئەو خاڵانەی کە لە دیموکراسیەت دان کە ئێمە زیاتر وەك (میکانیزم) تەماشایان دەکەین ئیسلام هیچ گرفت و کێشەی لەگەڵیان نی یە، بەڵام ئەوەی کە ئیسلام ڕەفزی دەکات کاکڵ و جەوهەری دیموکراسی یە کە بریتی یە لەوەی یاسادانان بە موتڵەقی بخرێتە دەستی میللەت، ئیسلام دەڵێ: ئەو شتە تەنها شایسەی خوایە و دەبێ بەس هی خوا بێ (جل جلالە)

وەك فەرموویەتی : ﴿ إِنْ الْحُكْمُ إلاّ لِلَّـهِ ﴾( یوسف الآیة ٦٧) ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنْ الدِّینِ مَا لَمْ یَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ ﴾ (الشوری من الآیـة ٢١) شـەرع دانـان و حوكـم دانـان حـەلاڵ و حەرام چاك و خراپ دیاریكردن لە ئەصلّ دا هی خوای پەروەردگارە، وە ئەوە كە زانایانی ئیسلام و پسپۆڕانی شـەریعەتیش بۆیـان هەیە ئیجتیهاد بكەن و یاسا هەڵبهێنجن بـە تایبەت لـە بوارەكـانی سیاسـی و ئیداری و ئابووریدا، ئـەوە بـە یاسـا دانانـێكی جوزئـی و بەنددار (مقید)ەوە لە چوارچێوە و لەبەر ڕۆشـنیایی شـەریعەت دایە.

– مامۆسـتا جەنابـت فـەرمووت لـە بـواری میكانیزم دا ئیسلام خاڵی هاوبەشی زۆرە لەگەڵ دیموكراسـیدا.

+ بەڵـێ .

– لـە دیموكراسـیدا هـیچ كـەس بـۆی نیـیە تـا سـەر حاكم بێ . كە كەسـی یەكەم بێ لە وڵاتدا و بە پێی یاساكانی وڵاتان یان دوو ساڵ یان چوار ساڵ هەیە پێنج ساڵ و زیاتریش بۆی هەیە بمێنێتەوە .

+ راسـتە.

– بـەڵام كـوا لـە ئیسـلامدا وایـە ؟ بـۆ نموونـە: تەماشا دەكەین هەر چوار خەلیفەكان تا كۆتایی ژیانیان حوكمڕان بوون!

+ بـەڵـێ ڕاسـتە هـەر چـواریان ماونەتـەوە تـا یـان شـەهید بـوون یان وەفاتـیان كـردووە، جـا وەڵامـی ئـەوە بـەو شـێوەیەیە كـە ئێسـتا من دەیخەمـە ڕوو، دیموكراسـی چـەند ئالـیەت و چەند مفرەداتێكی هەیە، كـە جەوهەرەكـەی لەگـەڵ شـەریعەت دا ناگونجـێ ئەوەش كە ماف بە پەرلـەمان دەدات، یـان ڕاسـتتر بڵـێین : مـاف بـە خـەڵك دەدات كـە پەرلەمانێك هەڵبژێرن و ئەو پەرلەمانەش مافی پێدەدرێ كە بە كەیفی خـۆی چـۆنی پـێ چـاك بـوو قەدەغەكان دیاری بكات و فەڕزەكانیش و

ئـەو شـتانەی کـە موبـاحن دیاری‌یـان بکـات و بـە کورتـی سـەرجەم سنوورەکان دیـاری بکـات بـێ گـوێ دانـە شەرعی خوا ، ئاشکرایە ئەم خاڵـە لەگـەڵ ئـەوەدا کـە دەبـێ تـەنها و تەنها خوای کاربەجێ بەرنامە دانـەر و حـاکمی مـوطلـــەق بێـت زۆر بـە تونـدی دژ دەوەسـتێ و تێك دەگیـرێ، بەڵام غەیری ئەوە بۆ وێنە مەسـەلەی دەستاودەست کردنی دەســـەڵات هەڵـبژاردن ئـەوە کـە زۆریـنە قســەی دەخـوات بەسـەر کەمیـنەدا لـە ســەرجەم ئـەو مەسـەلە ئیجتـیهادیانەدا کـە مشـتومڕ هەڵگـرن و زانـا و پســپۆڕان ڕای جیاجـیایان لـە بارەیانـەوە دەبــێ هـەروەها مەسـەلەی مافـەکانی مرۆڤ و ئازادیەکان ئەوانە هەموویان کە چـــەند مفــرەدەیەکی دیموکراســیـن، لـــە سیســـتەمی حوکمــڕانی ئیسـلامیشـدا زۆر بـە ڕاشـکاوی دانـیان پـێدا هێنراوە، ئێسـتا بێینەوە سەر ئەو مەسەلەی کە بریتی‌یە لە ماوەی حوکمڕانی (مدة الحکم) دیارە ئـەوە لـە ئیسـلامدا نـە دیاری کراوە چەند بێ و نەدیاریش کراوە چەند نـەبێ، واتـە نەگوتـراوە دەبـێ حەتمـەن تـا مـردن بابـای حوکمـڕان لـە شـوێنی خـۆی بـێ و نەگوتراویشــە دوو ڕۆژ بێ یاخود ساڵێك یان چوار سـاڵ بـێ یـان دە سـاڵ بـێ بـەڵکو ئـەم مەسەلەیە یەکێکە لەو مەسەلە موبـاح و مشــتومڕ هەڵگـرانە کـە بـۆ ئیجتـیهاد و ڕەئـی و تێڕوانیـنی پسـپۆڕانی میللەت و بۆ ڕای خەڵك و جەماوەر بەجێهێڵـراوە.

– مامۆسـتا ! ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (( علیکم بسنتي و ســنتة خلفـاء الراشــدین مـن بعـدی)) ، ئایـا ژیـانی ئـەوان نابـێ بـە بەرنامە بۆ ئێمە ! !

+ نەخـێر ژیانی ئەوان خوا لێیان ڕازی بێت نابێتە شەرعێکی پابەندکەر (مُلــزِم) بـۆ ئـێمە چـونکە ئەوانـیش ئیجتـیهادیان کـردووە بـۆ ئـەو مەسەلانەی کەدەقی شەرعی ڕوونیان لەسەر نی‌یە چونکە جاری وا بوە

ئیمامی ئەبوبەکر شتێکی کردووە بەڵام ئیمامی عومەر (خوا لێیان رازی بێ) رەخنەی لێگرتووە، دوایی کە ئیمامی عومەر دەستەڵاتی کەوتۆتە دەست بەو شێوەیەی کە خۆی پێی چاك بووە کاری کردووە ئینجا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە فەرموویەتی (( علیكم بسنتي و سنتة خلفاء الراشدین من بعدی)) بە گشتی رێبازی خەلیفە راشیدەکان بۆ ئێمە سەر مەشقە نەك تاك تاکی شتەکان؟ چونکە ئەگەر لە مەسەلەیەکدا کە ئەبوبەکر و عومەر ( (خوا لێیان رازی بێ) کەوتونەتە کێشەوە دەبێ رای کامیان بکەینە رێبەر؟ یان ئەگەر لە مەسەلەیەکدا چواریان کەوتبنە کێشەوە چۆن بکەین و رای کامیان بکەینە رێباز ؟

خۆ نابێ رای هەر چواریان لە یەك کاتدا جێبەجێ بکەین؟! کەواتە ئێمە تەنیا دەقە شەرعییەکان دەمانبەستنەوە و راو ئیجتهادی زانایان و ئیجتیهادی پێشەوایان هەتا ئەگەر خەلیفە راشیدەکانیش بن خوا لێیان رازی بێت هەروەکو ئیجتیهاد تەماشا دەکرێن بەڵام بە گشتی رێبازی ئەو چوار خەلیفە راشیدە بۆ ئێمە سەر مەشقە بەڵام مەرج نییە لە هەموو شتێك دا بۆ ئێمە مُلزِم بێت، هەڵبەتە پێغەمبەر خواش ﷺ کە فەرموویەتی : (( ... وَمَن یَعیش منكُمْ فسیرى إختلافاً كَثیراً فَعَلَیكُم بِسُنتي و سنة الخلفاء الراشدین المهدیین من بعدي عضوا علیها بالنواجذ)) (رواه ابو داود و أحمد و إبن ماجة و غیرهم و الحدیث صحیح .

واتە: ... هەر کامێکتان تەمەنی هەبێت و لە ژیاندا بەردەوام بێت ئەوە بێگومان کێشە و مشت و مڕ و راجیایی زۆر لە ناو ئوممەت دا دەبینێ ، جا ئێوە رێبازی من و رێبازی جێنشینە سەر راستە

هـیدایەتدراوەکانم بگـرن، مەهـێڵن لـە دەسـتتان دەربچـێ ئەگـەر بـە ددانەکانیشـتان گرتبێتان.

کەواتـە لـە سـیاقی فەرمایشـتەکەوە دەزانـین کـە مەبەسـتی پێغەمـبەری خـواﷺ ئەوەیـە کـە لە کاتی ڕاجیایی و مشـت و مڕی نێو ئوممـەت دا ڕێـبازی خەلـیفە ڕاشـیدەکان تـەرازووی هـەق و ناهـەق و سـەنگی مەحەکـە، کـە بریـتی بـووە لـە : هەڵبژێررانـیان لـە لایـەن ئوممەتـەوە بە ڕاوێژ و بەیعەت پێکردنیان و پابەندی موو بە موویان بە شـەریعەتەوەو ڕاوێژکردنـیان بـە خـەڵك و ڕەخـنە قبووڵکردنـیان و بـە دادگـەری ڕەفتارکردنـیان و دەسـت وەرنەدانە خەزێنەی ماڵ و... هتد.

ئیـنجا لـە مەسـەلەی ماوەی حوکمڕانیشـدا کە دیموکراسـی دەڵێ ئەوە با چوار ساڵ بێ یان پێنج ساڵ بێ یان شـەش ساڵ بێ یان دوو دەورە بـێ یـان چـەند بـێ خـۆ ئـەوە ئایەت نیـیە نەگونجێ دەستکاری بکرێ دیارە ئەبوبەکر خوا لـێی ڕازی بێ دوو ساڵ و سـێ مانگ خەلیفە بووە مسـوڵمانان خۆزگـەیان خواسـتووە کە دە سـاڵیش حوکمڕانیان بوایە، ئیـنجا وەك چۆن سیسـتەمی دیموکراسـی ڕۆژئـاوایی بـۆی هەیـە بڵـێ دەبـێ یـەك خـول (دورة)ی حوکمـڕانی چـوار سـاڵ بێـت، سیسـتەمی حوکمڕانیی ئیسـلامیش بۆی هەیە بڵێ با دەورەکە دە ساڵ بێت، وە با سـێ دەورە هەڵـبژێررێ، گـرنگ ئەوەیـە هەڵـبژاردنەکە لـە لایـەن میللەتەوە بێت جا ئایا میللەت بۆ پێنج ساڵ دادیدەنێ یان بۆ دە ساڵ دایدەنـێ یـان بـۆ هەشـت سـاڵ دایدەنـێ یـان بـۆ دەورەیەکـەیان دوو دەورە یـان بـۆ سـێ دەورەیـە دیارە کەس ناتوانێ بڵێ حەتمەن دەبێ هـەر بـەو شـێوەیە بێ چونکە دیموکراسـی بە هەموو موفرەدەکانیەوە ئەزموونی خەڵکی ئەورووپایە لە بواری حوکمڕانی داو ئەگەر سیسـتەمی حوکمی ئیسـلامیش بەو شێوەیە کە خیلافەی ڕاشـیدە لەسەری بنیات

نرا، بەردەوام بوایە، ئەوە بە تەئکید ئێستا لە جیاتی ئەوە کە چوار ئەزموونی حوکمڕانیمان هەبێ واتە (ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی) (خوا لێیان رازی بێ) هەروەها (عومەری کوڕی عبدولعەزیز) کە ئەویش بە پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدی ئیسلام دادەنرێ لە لایەن زۆرینەی زانایانەوە، ئەوە ئێستا دەیان شێوەی حوکمڕانیان دەبوو هەموشیان لە چوارچێوەی شەریعەت داو هەمووشیان بە میکانیزمی ڕاوێژ (آلیة الشوری) چونکە ئا ئەو مەسەلانە هەموویان ئەو هەڵبژادن و حوکمی زۆرینە دەستاو دەست پێکردن و.. هتد. هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەصڵی ڕاوێژ ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ﴾ (الشوری من الآیة٣٨) با کاروبارتان بە ڕاوێژ بێت .

– مامۆستا لە بواری ئالیەتەکاندا ئەمجار مەسەلەی هەڵبژاردن دێتە پێشێ.

+ بەڵێ .

– ئەگەر سەیری مێژووی ئیسلامی بکەین هەڵبژاردن زۆر کەم بوە ئایا هەر لە ئەصڵدا هەڵبژاردن هەیە یاخود خەلیفە بۆی هەیە وەصیەت بکات بۆ دوای خۆی و یەکێکی دیکە دابنێ ئایا وایە؟ یاخود میللەت خۆیان بۆیان هەیە خەلیفە هەڵبژێرن؟!

+ خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ﴾ (الشوری من الآیة٣٨) واتە : کاروباری ئیمانداران بە ڕاوێژە شایانی باسە ئەم ئارستە قورئانیە لە ئایەتێکدا هاتووە کە بەم شێوەیەیە : ﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ﴾ (الشوری ٣٨).

لێرەدا چوار وەصــف بۆ مسـولمانان دیـاری دەکـات دەفەرموێ: ئەوانـەی کە بە دەم بانگی پەروەردگاریانەوە دەچن ئەمە وەك حالەتی گشتی‌یان، ئینجا سێ کردەوە و خەسلەتیان دەخاتە ڕوو یەکەمیان (و أقـاموا الصـلاة) نوێـژ بـەرپا دەکـەن، دیـارە نوێـژ بـناغەی لایـەنی مەعـنەوی‌یە و تـاکی مســـولمان و مـیللەت و کۆمەلگایـەکی مســـولمان دەبـێ پـەیوەندی ڕووحـی و مەعـنەوی لەگـەل خوای خۆیدا هەبێ و بۆ پـەروەردگاری سـەجدە و رکوع بەرێ، دیارە نوێژ گەورەترین دروشمی مسـولمانانە وەك تـاك و چ وەك کۆمـەل، پاشـان دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ من الآية ٣٨) وە کاروباریـان لـە نێو خۆیاندا بە ڕاوێژە، ئەمـەش بـناغەی کاروبـاری کۆمەلایـەتی و چالاکی سـیاسـیانە، ﴿وَمِمَّا رَزَقْـــنَاهُمْ يُـــنْفِقُونَ﴾ وە لـەوەی پـێمان داون دەبەخشــن. ئەمـەش دروشمی لایەنی ئابووری‌یە، واتە ئەو سێ بوار و لایەنە: لایەنی ڕووحی و لایـەنی کۆمەلایـەتی و سیاسی ، وە لایەنی ئابووری ژیان و گوزەرانی تــاك و کۆمــەلی مســـولمانان دەبــێ بــەو شــێوەیە بــێ کــە خـــوای پـەروەردگار دیـاری کـردووە و لەسـەر ئـەو سـێ بنەمایە بنیات بنرێ. لێرەدا کـە ﴿وَأَمْــرُهُمْ شُــورَى بَيْنَهُمْ﴾ کەوتۆتـە نـێوان ﴿ وَ أقاموا الصلاةَ﴾ و﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ ئـەوەی لـێ دەفامرێتەوە کە وەك چۆن نوێـژ بەرپا کردن و زەکات و مال بەخشـین پێویست و واجبـن بە هــەمان شـێوە مەشـــوەرەت کردنـیش واجـبـە جـا لــە ســـەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مەسەلەی ڕاوێژکردن زۆر چاك جێبەجێ کراوە و یەکێك لـە هـاوەلان (خـوا لـێـیان رازی بـێ) دەگێڕیتەوەو دەفەرموێ : ( کان رسـول الله ﷺ أكثر الـناس مشـورة باصـحابه) واتـە: پێغەمبەری خوا ﷺ لـە هــەموو کـەس زیاتـر ڕاوێـژی بـە هـاوەلانی کـردووە، وە ئەگـەر

تەماشای سیرەی پێغەمبەر ﷺ بکەین دەبینین کە هەر شتێك دەقی لەسەر نەبووبێت و لە بارەیەوە وەحی بۆ نەهاتبێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە هاوەڵانی کردووە و پابەندیش بووە بە ڕەئی زۆرینەوە.

– فەرمووت ڕاویژکردن هەبوو بەڵام ئایا پابەندی بە ڕای زۆرینەوە چۆنە؟! واتە ئایا مەشوەرەت هەر ڕا وەرگرتنە یان بۆ پێوە پابەند بوونیشە؟!

+ لەو بارەیەوەوردە کێشەیەك هەیە لە نێوانی زانایاندا کە ئایا ئەنجامی ڕاوێژ پابەندکەریشە یان بەس بەرچاو ڕوون کەرەوەیە؟! (الشورى هل مُلزِم أم مُعلِم؟!)

بەڵام بە ڕاستی ئەگەر ئینسان تەماشای ئایەتەکان بکات مەسەلەکە زۆر ڕوونە چونکە خوای کاربەجێ ڕاوێژکردنی خستووەتە نێوان نوێژ و زەکاتەوە تاکو بزانین کە ئەگەر نوێژ ڕوکنێکی عیبادیی‌یەو زەکات ڕوکنێکی ئیقتیصادیی‌یە، شوڕاش پایەیەکی سیاسیی‌یە ئەوە لە لایەك، پاشان خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ(علیه الصلاة والسلام) (و شاورهم في الامر) وەك دەبینین بە ئەمر پێی فەرموێ : ڕاوێژیان پێ‌بکە لە کاروباردا.

– بەڵام مامۆستا ! ئێمە وترا خیلافێك لەو بارەوە هەیە. یەعنی هەر کام لەم ئایەتانە بە پێی دوو تەفسیری جیا شوورا دەکەن بە (معلم) یان (مُلزِم) ئینجا بۆ نمونە لە ڕۆژگاری ئەبووبەکردا کە جەنابت زۆر وەصفی ئەبووبەکر دەکەیت (خوا لێی ڕازی بێ) چاکترین کەسیشە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینین ئەو خەلفە ڕاشیدە لە جەنگی (ردة) دا هەرچەندە زۆربەی هاوەڵان ڕەئیان وابوو کە شەڕیان لەگەڵ نەکرێ، بەڵام ئەبووبەکر ڕەزای خوای لێ‌بێ فەرمووی ئەگەر بە تەنهاش بووبێ من خۆم ئەو جەنگە دەکەم!

+ بەڵێ ئەوە زانایان بۆ ئەو مەسەلەیە دوو جۆر وەڵامیان هەیە: یەکەم ئەوەیە کە ئەبووبەکر ڕەزای خوای لێ بێ (نص)ی بە دەستەوە بووە ئەویش ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾ (التوبة من الاية ٥) هەروەها لە سورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ ﴾ (التوبة من الاية ١١) واتە: ئەگەر نەگەڕانەوە و نوێژیان نەکرد و زەکاتیان نەدا براتان نین لە دیندا، لە ئایەتەکەی تردا دەفەرموێ: ﴿فخلوا سبيلهم﴾ یەعنی بە پێچەوانەوە ئەگەر نوێژیان نەکرد و زەکاتیان نەدا لێیان مەگەڕێن، چونکە نوێژی فەرز هەقی خوایە زەکاتیش هەقی خەڵکە! جا ئەبووبەکر (خوا لێی ڕازی بێ) دەقی قورئانی بەدەستەوە بوو وە فەرمووی خوای پەروەردگار نوێژ و زەکاتی بە یەکەوە باس کردوون منیش لە هیچ کەسێك قبووڵ ناکەم لە یەکیان جیابکاتەوە، نوێژ هەقی خوایە و زەکات هەقی خەڵکە، ئیدی هاوەڵانیش (خوا لێیان ڕازی بێ) دوای ئەوەی ئەبوبەکر ئاماژەی بۆ ئەو ئایەتانە کردوو ئەم فەرمایشتەی بۆ باس کردن کە دەفەرموێ: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا اله الاّ الله و أني رسول الله فإن قالوها عصموا مني دمائهم و أموالهم الاّ بحقها و حسابهم على الله) (رواه البخاري).

واتە: فەرمانم پێکراوە کە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نییە و منیش پێغەمبەری خوام، جا ئەگەر ئەوەیان گوت. ئەوە خوێن و ماڵی خۆیانیان لە من پاراستووە مەگەر بە هەقی شەرعی وە لێپرسینەوەیان لەسەر خوایە. (دیارە ئەو

کاتـە سـەرانە(جـزیە) دیـاری نەکـراوە یـان پێغەمـبەری خـوا ﷺ بەوە ئیکتفای کردووە کە لە فەرمایشتەکانی دیکەی دا باسی کردووە.

شـایانی باسـیشـە لـە هـەندێك ڕیوایـەتدا هـاتووە کە هاوەڵان (خوا لـێیـان ڕازی بـێ) ئـەو فـەرموودەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە لە بەرانبەر قسـەی ئەبوبەکـردا (خـوا لـێی ڕازی بـێ)، ئیـنجا ئەبوبەکـریش لـە وەڵامـیان دا فەرموویـەتی: (الا بحقهـا و الـزكاة مـن حقهـا) واتـە: پـاش شـایەتمان هێـنان دروسـت نییـە جـەنگ لـە دژی ئەو کەسانە بکرێ کە خۆیـان بـە مسـوڵمان دادەنـێن، مەگـەر بـە چـواندنی فەرزێك کە هەقی شایەتمانە و دەبێ جێبەجێ بکرێ و زەکاتیش یەکێکە لە هەقەکانی ..

دیارە ژمارەیەکی زۆریش لەوانەی کە خەلیفەی یەکەم (خوا لـێی ڕازی بێ) لـە جـەنگی هەڵگەڕانـەوە (حرب الردة)دا جەنگی لە دژ بەرپاکردن کەسـانێك بـوون کـە دەیـانگوت مسوڵمانین بەڵام زەکات نادەین!

هـەندێك لـە مـێژووزانەکان نـاوی جەنگەکـەیان بـە (قـتال مانعي الزكاة) جەنگی دژی زەکات نەدەرەکان ناوزەد کردووە.

- یەعنی (نص) بەدەستەوە بوو.

+ (نـص) بەدەسـتەوە بـوو ئەمـە وەڵامـێك، وەڵامـی دووەم ئەوەیە کە دەڵـێن ئەبوبەکـر (خـوا لـێی ڕازی بـێ) هـاوەڵانی ئیقنـاع کردوو هاتنە سـەر ڕایەکـەی ئەبوبەکـر، واتـە: ئەوانـەی کـە دەڵـێن ئەبوبەکـر دەقـی بەدەسـتەوە نـەبووە، دەڵێن: ئەبوبەکر لە پێش دا عومەری ئیقناع کرد (خـوا لـێیـان ڕازی بـێ) بـەوە عومـەر فەرموویەتی: کە زانیم ئەبوبەکر لەسـەر ئـەو ڕایـە سـوورە خـوای پەروەردگار دڵی منیشی بۆ گوشاد و واڵا کرد، ئینجا دیارە ئەصحابیش لەسەر ئەو ڕایە سوورە متمانەیان بە ئەبوبەکـر و عومەر هەبوو، ئەوانیش هاتوونە سەر ڕایەکەی ئەو دووانە، بـۆ مەسـەلەی شـوڕاش مـن ڕەئیم وایە کە ئەو ڕایە بەڵگەدارتر و بەهێز

تره كه دەڵێ: ئەنجامی شورا پابەند كەرە چونكە ئەگەر تەماشای دەقەكانی قورئان و سوننەت بكەین وە ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەر و چوار خەلیفەكانی بكەین (علیه الصلاة والسلام) دەبینین هیچ كاتێك نەبووە كە مسوڵمانان شتێكیان خستبێتە ڕاوێژەوەو پاشان ڕای زۆربە لە لایەك بێت و بە لای كەمینەدا شكابنەوە و ڕای زۆربەیان فەرامۆش كردبێ!

- مامۆستا فەرمووت لە مێژووی ئیسلام دا شتی وا نەبووە ڕای زۆربە پشت گوێ بخرێ، ئایا دیلەكانی جەنگی بەدر زۆرینە ڕەئیان وانەبوو بەر بدرێن؟!

+ بەڵێ وا پێدەچی.

- بەڵام هەندێك ڕایان جیاواز بوو.

+ بەڵێ وابوو كە دیارترینیان عومەری كوڕی خەتتاب بوو (خوا لێی ڕازی بێ).

- جا ئایا پێغەمبەری خواﷺ بە پێی ڕای زۆرینەی كرد یان نا؟!

+ بە پێی ڕای زۆرینەی كرد تا ئەو كاتەی هیچ دەقێكی قورئان لەو بارەیەوە نەهاتبۆ خوارێ وە مەجالی ڕاوێژ و ئیجتهادی تێدا هەبوو كە ئەوە مەسەلەیەكی زۆر گرنگە ئێمە بۆچی دەڵێین: زۆرجار دیموكراسی خەڵك توشی زۆر كاری سەقەت و خراپ دەكات چونكە هیچ شتێك ناهێڵێتەوە بۆ خوای پەروەردگار! بەڵام زانایانی ئیسلام وەك بنچینەیەكی شەرعی (قاعدة شرعیة) گوتوویانە (لا اجتهاد في معرض النص) یان (لا اجتهاد في مقابل النص) بەڵێ مادام خوای پەروەردگار شتێكی فەرموو بێت یان پێغەمبەری خوا ﷺ شتێكی فەرموو بێت، تازە ئەگەر خەڵك خۆی بە مسوڵمان بزانێت مەجالیان بۆ نەماوەتەوە كە ڕایەكی تر بڵێین: وەك خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ

لِمُؤْمِـــنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمْ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْـــرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً مُبِينًا ﴾ (الاحزاب ٣٦)

واتـه: هـیچ پـیاوێکی بـڕوادار و هـیچ ئافرەتێکی بڕوادار بۆیان نی‌یە کە خـــوای پـــەروەردگار و پێغەمـــبەری خـــواﷺ بڕیارێکـــیان دا تێـــیدا سـەرپشـــك بـــن بـــەڵکو دەبـــێ جێبەجـێی بکـەن، وە هـــەر کەسـێك سەرپێچـی خـواو پێغەمـبەرەکەی بکـات ئـەوە بـە شـێوەیەکی ڕوون و بێچەند و چوون سـەرگەردان بووە.

- مامۆسـتا پرسـیارەکە دووبـارە دەکەمەوە: باشە ئەگەر دەقەکان ئـەوها لات ڕوونن خۆ ئێمە گومانمان لەوەدا نی‌یە کە تا زانایان نزیك تر بووبـن لـە ڕۆژگـاری پێغەمـبەری خـواﷺ زیاتـر و چـاکتر لـە دەقـەکان تێگەیشـتوون، بەڵام زۆر باس لەوە دەکرێ کە دەبێ ئێمە بە تێڕوانینی سـەلەفی ئایـەت و حـەدیس و دەقـە شـەرعی‌یەکان سـەیر بکـەین بـە درێژایـی مـێژووی ئیسلامی یاخود مێژووی سیاسی ئیسلامی ئایا بۆچی ئـەو حەقـیقەتە کـە ئێسـتا لای جەنابـت حەقیقەتـێکە لـە خـەڵکی گوم بـووە؟! یەعـنی ئـیش کردن بە زۆرینە و بە ڕاوێژ سەیر دەکەی هەر لە ســـەردەمی ئەمەوی‌یـــەکان و عەباســـیەکان ئەمـــەی کـــە جەنابـــت ئەفەرمووی، نازانین حەقیقەتێکی دیار نی‌یە؟!

+ مـن ئێسـتا وەڵامـی ئـەو پرسـیارەت عـەرز دەکـەم: جارێ ئەوە کە زۆریـنە لـە ئیسـلام دا ڕێزی تایبەتی بۆ ڕەئی‌یان دانراوە لە کاتێك دایە کە (نەص) نەبێ ، بەڵام کاتێك کە خوا شتێکی فەرموو، لە بەرانبەری‌دا زۆریـنە و کەمیـنە نی‌یـە، چـونکە تاك و میللەت مادام خۆی بە بەندەی خـوا زانی دیارە لە شـتە ڕوون و بەڵگە نەویسـتەکانی ئیمانە کە خوا لە هـەموو کـەس زاناتـرە و لـە هەموو کەس بە تواناترە و لە هەموو کەس کاربەجێتـرە و لـە هـەموو کـەس بە بەزەیی‌ترە، کەواتە کاتێك کە خوا

شتێك بفەرموێ دەبێ هەموو لایەك بۆی تەسلیم بن وە ئەگەر لە شتێك دا لێی حاڵی نەبوون دەبێ زیاتر لێی ورد بنەوە و عەقڵی خۆیان (متهم) بکەن کە عەقڵیان تێی نەگەیشتوە نەك لە دەقەکاندا بکەونە دوو دڵیەوە مادام بڕوایان وایە کە خوا ناردوویەتی یان پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموویەتی: وە بە نسبەت ئەوەشەوە کە تۆ فەرمووت دەڵێم: دیارە خوای پەروەردگار ئەوە کە خەڵك مل کەچ دەبن بۆ شەریعەت پێوەی پابەند دەبن یان نا (اختیار) ی داوەتە دەست خۆیان و خوای پەروەردگار مەلائیکەی نەناردووە کە ملی خەڵکی بسورێنن کە بە تۆبزی و بە زۆر بیانخەنە سەر جادەی شەرع چ ئەوەی کە هەر ئیمانی پێناهێنێ وە چ ئەوەی کە بە لاری مسوڵمانەتیەکەی دەکات، چونکە خوای پەروەردگار ژیانی دونیای هەڵخستوە بۆ تێدا تاقیکردنەوەی بەندەکان وەك فەرموویەتی: ﴿ الـــَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ (الملك من الآية ٢) .

واتەك خوا ژیان و مردنی ڕەخساندوون تاکو تاقیتان بکاتەوە داخۆ کامتان کردەوەی چاکترە، مرۆڤەکان ڕێیان پێدراوە کە هەر لە ئەصڵ دا بکەونە سەر جادەی شەرع یان وەك فەرموویەتی: ﴿ وَهَدَيْـــنَاهُ النَّجْدَيْنِ ﴾ (البلد ١٠)

ئەوە لە لایەك، پاشان کە دەکەونە سەر جادەی شەرعیش واتە مسوڵمان دەبن دیسان بواریان پێدراوە واتە ئیرادەیان زۆری لێنەکراوەو جەبری لێنەکراوە بەڵکو ئیرادەیەکی ئازادیان هەیە داخۆ تا چ ئەندازەیەك و چ نسبەتێك پابەند دەبن بە شەرعەوە ئاشکراشە ئەو کاتەی کە مسوڵمانان بڕواداری باشن پابەندی باشیش دەبن و

کاتێکیش کە عەقیدەو ئیمانەکەیان لاواز دەبێ پابەندی‌یەکەشیان لاواز دەبێ بە تایبەتی ئەوانەیان کە دەستەڵاتدارن، جا لە سەردەمی پێغەمبەری خواﷺ وە خەلیفە ڕاشیدەکانی‌دا (خوا لێیان ڕازی بێ) بەو شێوەیە بووە کە باسمان کرد، جارێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە پێغەمبەری خوایە و خۆی ناردوویەتی، ئینجا هەرکام لە (ئەبوبەکر، عومەر، عثمان، عەلی) هەر چواریان خەڵك هەڵیان بژاردوون، بەڵام هەندێك کەس لەوە حاڵی نابێ ئەوەی کە ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێ) وەسیەتی کردووە کە لە دوای خۆی (عومەر) خەلیفە بێ ڕەزای خوای لێبێ ، بەڵام زانایانی ئیسلام هەموویان دەڵێن ئەوە بەس کاندید(ترشیح) بووە، چونکە بێگومان ئەگەر هاتباو مسوڵمانان دوایی بەیعەتیان بە عومەر نەکردبایە ئایا تەنها بەو پێشنیارکردن (ترشیح)ەی وی دەبوو بە خەلیفە (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەروەها (عثمان) و(عەلی) یش هەروا (خوا لێیان ڕازی بێ) چونکە (عەلی) لە یەکێك لە وتارەکانی (نهج البلاغة) دا کە بەڵگە دێنێتەوە لەسەر شەرعیەتی حوکمڕانێتی و خەلیفایەتی‌یەکەی خۆی لە بەرانبەر معاویەدا دەڵێ: ئەوانەی منیان هەڵبژاردووە بە خەلیفە هەر ئەوانەن کە (ئەبوبەکر و عومەر و عثمان) یان هەڵبژاردووە واتە: نوێنەرانی میللەت کە لە زاراوەی فیقهی‌دا پێیان دەگوترێ: (أهل الحل و العقد) وە بە زاراوەی ئەمڕۆ (مجلس الشوری) کەواتە هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بناغەی شوورا دانراون و نوێنەرانی میللەت هەڵیان بژاردوون.

بەڵام دوای ئەوەی کە سەردەمی جێنشینایەتی سەر ڕاستانە (الخلافة الراشدة) بەسەر دەچێ و لە سەردەم و ڕۆژگاری حوکمڕانە میراتیە ئەمەوییەکان بەملاوە لادان (إنحراف) لەو مەسەلەیەدا کراوە

هەرچەندە بێگومان ئەو دەقە شەرعیانە (النصوص الشرعية) هەر هەبوون!! هەربۆیەش کاتێك کە (معاویە) خوا لێی رازی بێ دەیەوێ بەیعەت بە زۆر وەربگرێ لە مسوڵمانان بۆ (یەزیدی) کوڕی! واتە: جارێ بۆ خۆی هەر زیندووە کە بە زۆر بەیعەت وەردەگرێ لە مسوڵمانان بۆ ئەوەی (یەزید) لە دوای خۆی ببێ بە حوکمران!!

دیارە ئێمە گومانی چاك بە معاویە دەبەین ناڵێین (معاوية) حەتمەن نیازو مەبەستی خراپی هەبووە، بەڵکو لەوانەیە بە ئیجتهادی خۆی بۆ چاکەی بووبێ و نیازی چاك بووبێ و گوتبێتی ئەگەر مسوڵمانان بەر لەوەی بمرم حوکمڕانێکیان هەبێ چاکترەو موشکیلەیان بۆ دروست نابێ؟! بەڵام بە تەئکید لە ئیجتیهادە کەیدا نەی پێکاوەو بە تەئکید ئەو ڕەفتارەی لادانێك بوو لە ڕێبازی ئیسلام و ڕێ و شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکانی، هەر بۆیەش (عبدالرحمن بن ابی بکر) ڕوو بە معاویە گوتی: ئایا حوکمڕانێتی ئیسلامی پادشایەتی ڕۆمەکانە هەر هیرەقلێك ڕۆیی یەکی دیکەبێ؟!

جا دیارە قسەکەی (عبدالرحمن) دەربڕی هەست و نەستی سەرجەم مسوڵمانان بووە وە بە تەئکید مسوڵمانان زانیویانە کە ئەوە حاڵەتێکی سەیر و نائاسایی و حاڵەتێکی نا شەرعیيەو بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ ئەو هەڵوێست و ڕەفتار و لادانە مەحکووم کراوە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (خلافة النبوة ثلاثون سنة ثم يؤت الله ملكه من يشاء) (امام احمد، ترمذی، نسائي، ابوداود) گێڕاویانەتەوە پێغەمبەر ﷺ بە ڕوونی دەفەرمووێ: جێنشینایەتی پێغەمبەرایەتی (٣٠) ساڵ دەبێ، جا با تەماشا بکەین دوو (٢) ساڵ و سێ مانگی ئەبوبەکر خوا لێی رازی بێت دە (١٠) ساڵ و شەش مانگی ئیمامی عومەر خوا لێی رازی بێت ، پاشان (١٢) ساڵی عثمان

خـوا لــێ‌ی رازی بێـت، لەگـەڵ (٤) ساڵ و نۆ مانگی ئیمامی عەلـی خوا لــێ‌ی رازی بێـت، لەگـەڵ شـەش مـانگی (حسـن)ی کـوڕی عەلـی (خوا لێیـان رازی بــێ) ئــەو پێـنج کەسـە (دیـارە حەسـەن بـە فیعـلی خەلـیفایەتی بـۆ نەکرا بـەڵام ئـەو پێنج خەلیفانە مسوڵمانان بۆ خۆیان هەڵـیان بـژاردن، کـە مـاوەی حوکمەکـەیان (٣٠) سـاڵی ڕێکـە، ئیـنجا حوکمڕانی دوای ئەوان چی‌یەو چۆنە؟!

پێغەمـبەر ﷺ دەفـەرمووێ: (ثم یؤت الله ملکە من یشـاء) واتە: پاشان خـوا پادشـایەتی دەدا بـە هـەر کەسێك کـە بیەوێ! (ثـم یکـون ملکـا عضوضـاً) یـان دەفـەرموێ: (ثـم یکـون ملکـا جبـریاً) (عضوضاً) واتە: شــتێك بـە تۆبـزی و بـەزۆر بـیگری و (جـبری)یـش یـانی خۆسـەپاندن، کەواتـە ئەمانـە دەقـەکان بوون، بەڵام ئایا دەقەکان خۆیان کاردەکەن، ئـەدی نابـێ خـەڵکی جێبـەجێیان بکـەن؟ لـێرەدا بـۆ ڕوون بوونەوەی مەبەسـت لـەو بارەیـەوە بەسـەرهاتێك بگێڕمەوە: لە شـەڕی (صفین) جەیشـی معاویـە کـە زانـیان خەریکـە بدۆڕێـن قورئانیان بەرز کردەوەو گوتـیان بـا قورئـان حەکـەم بـێ ئـیدی جەماعـەتی (خەوارج) فشـاریان خسـتە سـەر خەلـیفە– عـەلی – و گوتـیان: دەبـێ شــەڕەکە ڕابگـری چـونکە سـوپای بەرانبەر دەڵێن : دەبێ قورئان حەکەم بێت جا (عەلی) خـوا لــێ‌ی رازی بـێ فەرمووی: ئێوە کۆمەڵێکی نەزانن بەڵێ هەر دەبێ قورئـان حەکـەم بێـت و تـەنها خـوا (حـاکم)ە قسـەکە: هەقـە بەڵام بۆ مەبەسـتێکی بـەتاڵ بەکاردێ (کلمة حق ارید بها باطل) چونکە خۆ خوا خۆی نایەتە خوار لێرە ببێ بە حاکم!!

قورئـان حاکمـەو خـوا حاکمـە بـەڵام لـە ڕێـی خەڵکـەوە حاکمیەتەکەی جێبـەجێ دەبـێ، مسـوڵمانان هـەبن و حوکمـەکانی قورئـان جێبـەجێ بکەن، وە بە دەسـتەکانی خۆیان هەڵی‌بژێرن.

- باشـــه مامۆســـتا گـيان كەواتـــه ئـــەو شـــتانەی كـــه لـــه ديموكراسـيەتدا هەيـە لـە دەسـتاو دەسـت پێكردنی دەسـەڵاتە (تداول السـلطة) . وەك هەڵبژاردن وە ئـیش كـردن بـە ڕاوێژ و وەرگرتنی ڕای زۆربـە و دابـين كـردنی ئازادیـەكان ئەمانـە هـەموويان لە ئيسلامدا هەن كەواتـە لـە ڕووی سيسـتەمی حوكمـەوە ناكـرێ بڵێـين: سيسـتەمی فەرمان ڕەوايی لە ئيسـلامدا بريتیيە لە ديموكراسـی؟!

+ نەخـێر وە دەمـەوێ لـێرەدا ئامـاژە بـۆ ئەمـە بكـەم كـە بەداخـەوە هـەندێك لـە خـەڵكی ئيسلاميمان هەيە كە من ڕێزم بۆ هەموو خوشك و بـرايەكی مسـوڵمان هەيـە بەڵام ڕێزگرتنم بۆيان ڕێم لـێناگرێ كە ئەگەر ناتەواوی‌يـەك و كەموكوڕيـەك لـە قسـەيەكی و لە هەڵوێستێكيدا ببينم پيشـــانی بـدەم و بـيخەمە ڕوو، جـا دەڵـێم بەداخـەوە لـە خـەڵكی ئيسـلاميمان هەيـە كـە لـە ژێـر فشـار و لـە ژێـر تاووتيـنی ئـەو هێرشـە ڕاگەياندنـەی وە ئـەو هێرشـە سياسـی و ئـابووری و عەسكەری‌يەی كە ڕۆژئـاوا بـە سـەرۆكايەتی (ئەمـەريكا) دەيكاتـە سـەر عالەمی ئيسلامی حاڵەتـێكی بـەزين و تێشـكانی دەروونی‌يـان بـۆ دروسـت بـووە و لەبـەردەم ئەم زاراوەو سيستەمانەدا كە ئێسـتا ڕەواجيان هەيە سام و هەيبەتێكی زۆريان لـێدەكەن وە تەواو شـەرميان لـێدەكەن!!

بۆ وێنە كە باسـی مافی مرۆڤ دەكرێت يان باسی عەلمانيەت يان باسی ديموكراسـی دەكـرێ يـان باسـی (گلۆباليزەيشـن) (العولمـة) دەكـرێ، ئەوانـە دەيانـەوێ هەرچۆن بێ مل بە ئايەت و حەديسەكان بسوڕێنن و لەگـەڵ هـەموو ئـەو زاراوە و بـيردۆزانەدا بيانگونجێـنن، كـە باسی هەر شتێك دەكرێ دەيانەوێ هەرچۆن بێ و بە (تأويل) و پينە و پەڕۆش بێ بڵێين: كاكە ئيسـلاميش هەروايە! ئا ئەوە بێگومان جۆرێك لە بەزين و تێشـكانی دەروونی‌يـە، جـارێ ديموكراسـی ماوەی (٢٠٠- ٣٠٠) ساڵێكە

لە ئەوروپا وەکو سیستەمی حوکم کاری پێدەکرێ بەڵام ئیسلام ( ١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش وەکو سیستەمی حوکمڕانی کاری پێکراوە زۆر بە سەرکەتووییش کاری پێکراوە، وە ئەگەر دیموکراسی لەسەر ئاستی وڵاتێك و دەوڵەتێك کاری پێدەکرێ ئەو کاتە سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ وە لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانی دا لەسەر ئاستی چەندان دەوڵەتی ئێستا کاروباری پێ بەڕێوەبراوەو سەرپەرشتی تێکڕای ئوممەتی ئیسلامی بە هەموو نەتەوە و تیرە جیاجیاکانیەوە کردوە کەواتە:

یەکەم : لە ڕووی زەمەنیەوە ئیسلام زۆر لە پێش دیموکراسیەو دەبێ بڵێین: دیموکراسیش فلان شتەی تێدا هەیە کە لە ئیسلام دەچێ نەك ئیسلام فلان شتەی لە هی دیموکراسی دەچێ ! ! واتە دەبێ دیموکراسی هەڵسەنگێنین بە ئیسلام، وە دەبێ دیموکراسی خۆی قیاس بکات لەگەڵ ئیسلام واتە دەبێ بەژن و باڵای ئیسلام ببینێت ئنجا دیموکراسی خۆی پێ بگرێ ئاخۆ تا کوێی دێ؟ !

دووەم : ئێمە ناتوانین بڵێین سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی سیستەمی حوکمڕانی دیموکراسیە، چونکە خوای پەروەردگار ناوی لە ئاین و بەرنامەی خۆی ناوە: (ئیسلام) (و رضيت لكم الاسلام دينا) واتە: وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆ هەڵبژرادوون، ئنجا وەك دوایی باسی دەکەم بە ڕاستی دیموکراسیەتیش دینە، بەرنامەیە، پەیڕەوە، ڕێبازە، بەڵێ ناوی ئاین و بەرنامەکەی خوا (تبارك و تعالى) ئیسلامە و خواش ئەو ناوەی لێناوە وەك فەرموویەتی: ﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا ﴾ (المائدة من الاية ٣) وە فەرمووشیەتی : ﴿ وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ ﴾ (آل عمران من الآية ٨٥)

سێیەم: خاڵەکانی پێك گەیشتن (نقاط الالتقاء)ی ئیسلام و دیموکراسی لە میکانیزمەکانی دایە، بەڵام جەوهەر و کرۆکی دیموکراسی کە بریتی‌یە لە حوکم دان بە گەل و حوکم سپاردنی موتڵەق و بێمەرج بە میللەت کە بە کەیفی خۆی چاکە و خراپە و حەڵاڵ و حەرام دیاری بکات و ئاداب و ڕێ و ڕەسمەکان دیاری بکات، ئا ئەوە وەك باسمان کرد دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەوەدا کە دەبێ خوای پەروەردگار حاکمی ڕەها (مطلق) بێت، وە دیارە ئەمیش ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە خوا بە یەکگرتن (توحید)ەوە هەیە و مەسەلەیەکی ڕیشەیی ئیمان و عەقیدەیە.

- مامۆستا گیان! سەبارەت بەو خاڵەی جەنابت باست کرد، دیارە پێت وایە کە دیموکراسیەت کۆمەڵێ خاڵی ئیجابی تێدایە.

+ بەڵێ، بەڵام پێشم وایە بە شێوەیەکی چاکتر لە ئیسلام دا هەن.

- باشە ئەدی ئایا لایەنە خراپەکانی دیموکراسیەت لای جەنابت کامانەن ئایا ئەو خاڵە جەوهەری‌یەیە کە حەڵاڵ و حەرام دیاری‌کردن بدرێتە دەستی گەل؟!.

+ بەڵێ بێگومان ئەو مەسەلەیە کە جەوهەر و کاکڵی دیموکراسیەتە خراپترین پێکهێنەرەکەیشیەتی، چونکە وەك پێشتریش ئاماژەم پێکرد یەکسەر لەگەڵ ئیمان و عەقیدە دژ دەوەستێ چونکە ئیمان و عەقیدە بناغەی ئیسلامە و کاکڵ و نێوەڕۆکی عەقیدەش خوا بە یەکگرتنە (توحید الله) و فەرمانڕەوایەتی خوا (حاکمیة الله)ش پەیوەستە بە هەر کام لە دوو بەشە گەورەکەی خوا بە یەکگرتن واتە: خوا بە یەکگرتن لە پەروەردگارێتی (توحید الله في الربوبية) و خوا بە یەکگرتن لە پەرستراوێتی (توحید الله في الألوهية)دا، هەر بۆیەش خوای بەرز و مەزن دان پێداهێنان بە یاسا دانان ( الاقرار بالتشريع)ی

بۆ غەیری خوا بە هاوبەش بۆ خوا دانان (الأشراك بالله) داناوە وەك فەرموویەتی: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنْ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ ﴾(الشـــورى من الاية ٢١) واتـە: یان ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن کە بەرنامەیەکیان بۆ داناون خوا مۆڵەتی نەداوە؟! ئێستاش پاش ئەم ڕوونکـردنەوەیە بـە چـاکی دەزانم هـەندێك قسـە لـە زانـای نـاودار (د.یوسـف قرضـاوی) یـەوە بهێنمەوە، دیارە من ڕێزی زۆرم بۆ دکتۆر (د.یوسـف قرضـاوی) هەیـەو بـە زانایـەکی خـزمەتگوزاری ئیسـلامی دەزانم، بـەڵام وەك گوتـراوە: (لكل جواد كبوة)، من هەڵوێستی ناوبراو لـە بـارەی دیموکراسـیەوە بـە هەڵـە دەزانم کـە لـە کتێبی ( من فقـه الدولـة في الاســلام) ل (٣٢)دا دەڵـێ: (الواقـع ان الـذي يـتأمل جوهـر الديمقراطية يجد انه من صميم الاسلام واته : (بەڕاستی هەر کەسێك سـەرنج لـە جەوهـەری دیموکراسـی بـدات دەزانێ کە لە ناخ و کاکڵەی ئیسلامەوەیە!!

− دیارە تۆ بە پێچەوانەوە دەڵێی !

+ بـەڵێ مـن بـە عەکسـەوە دەڵـێم و پێشـتریش تـا ڕادەیـەك ڕوونم کـردەوە، بـەڵام مـن هـەر لـە قسـەکانی (دکتۆر یوسـف) خـۆی بـۆت دێـنمەوە کـە قسـەکانی خـۆی هەڵدەوەشـێنێتەوە! بـەڵام بـا جـارێ قسـەکانی لـەو بارەیـەوە بهێنمەوە کە وەك بەڵگە بۆ ئیسـپاتی قسـەی پێشـووی کـردوونی کـە گوایە جەوهەری دیموکراسی و ئیسلام پێکەوە کۆك و تەبان، گوتوویەتی: (ان جوهر الديمقراطية بعيدا عن التعريفات و المصطلحات الاكاديمية هو ان يختار الناس من يحكمهم و يسوس امرهم وان لا يفرض عليهم حاكم يكرهونه أو نظام يكرهونه و ان يكون لهم حق محاسبة الحاكم اذا أخطأ و حق عزله وتغيره إذا انحرف و ان لا يساق

الـناس رغـم انوفهـم الى اتجاهـات أو مـناهج اقتصـادية أو اجتماعـية أو ثقافية أو سياسية لا يعرفونها و لا يرضون عنها).

واتــه: بـێگومان نـێوەڕۆکی دیموکراســی دوور لــه پێناســه و زاراوه ئەکادیمیەکان ئەوەیە کە خەڵکی حوکمڕان و سەرپەرشتیارانی خۆیان هەڵبژێرن، وە حوکمڕانێکیان بەسەردا نەسەپێنرێ کە حەز لە چارەی ناکەن یان ڕژێمێك کە پێی قایل نین، وە کە مافی لێپرسینەوەی حوکمڕانی خۆیانیان هەبێ هەر کاتێك هەڵەی کرد، وە بۆیان هەبێ کە لە کاتی لادانیدا لای بەرن یان بیگۆڕن، وە کە خەڵکی بەرەو هەندێك ڕێڕەو و بەرنامەی ئابووریی و کۆمەلایەتی و کلتووریی و سیاسی ڕاپێچ نەکرێن کە پێیان ئاشنا نین و نایانەوێن.

بەڵێ دکتۆر یوسف قرضاوي ئا ئەو شتانەی بە جەوهەری دیموکراسی داناون بەڵام بەڕاستی ئەو شتانە هەموویان لە بازنەی میکانیزمەکان (آلیات) ی دیموکراسیدان و جەوهەر و کاکڵەی نین، ڕاستیشە ئەو شتانە مادام بە شەریعەتەوە بەسترابنەوە هیچ جۆرە ناکۆکی و تێك گیرانێکیان لەگەڵ سیستەمی حوکمڕانی ئیسلام دا نیە.

دواتر دکتۆر یوسف قرضاوي هەر لەو کتێبەیدا کە باسمان کرد : (من فقه الدولة في الاسلام) لە لاپەڕە (٣٦)دا ئەو قسانەی پێشووی هەڵدەوەشێنێتەوە و دەڵێ:

(كما ان الديمقراطية الغربية على مالها من محاسن لا تحكمها أصول [illegible] و لا تضبط سيرها فتستطيع باسم ممثلي الشعب ان تلغي الفا[illegible] تقرر الرذائل و ان تقنن المظالم و ان تحلل الحرام و ان تحرم الحلال، [illegible] في البرلمان الانجليزى: انه يستطيع ان يقرر أي شيء الا ان يحول الرجل الى إمرأة أو المرأة الى رجل).

واتـه: هـەروەها دیموکراسـی ڕۆژئـاوایی وێـڕای چـاکەکانی، کۆمەڵـە بـنەمایەکی نـین کـە بیبەسـتنەوە و کۆنـترۆڵی بکـەن، بۆیـە بـە نـاوی نوێـنەرانی گەلـەوە دەتوانـێ خەسـڵەت و بـەها بـەرزەکان هەڵوەشـێنێتەوە و بـریار لەسـەر خـو و خدە نزمەکان بدات و ستەم و خـراپەکان بخاتـە چوارچێوەی یاسـاوە، وە دەتوانـێ حـەرام حـەڵاڵ و حـەڵاڵ قەدەغـە بکـات! تەنانـەت لـە بـارەی پارلـەمانی ئینگلیزییەوە گوتـراوە: دەتوانـێ هەموو شتێك بكات و بڕیار بدات جگە لە پیاوکردنە ژن و ژن کردنە پیاو!

جـا مـن نازانم دکتۆر (یوسف) مادام دەزانێ، دیموکراسـی دەتوانێ چـاکەکان بـنەبڕ بکـات و خراپەکان بکاتە یاساو حەرام حەڵاڵ و حەڵاڵ حـەرام بکـات چـۆن چـۆنی ڕێـی بـە خـۆی داوە کـە بڵـێ: جەوهـەری دیموکراسـی لەگەڵ ئیسـلامدا دژ و ناکۆك نیە!!

پاشـان دکـتۆر یوسـف قرضـاوي لەسـەر ڕەخنەلێگرتـنی دیموکراسـی بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

(و لهـذا رأيـنا الديمقراطـية الامريكية تبيح الخمر شرباو صناعة و اتجارا بـرغم مـا ثبـت مـن اضـرارها الماديـة و المعـنوية عـلى الأفراد و الأسر و المجـتمعات، و عـلى الاقتصـاد و الاخـلاق و وجدنـا بعـض الديمقراطـيات الغربية يبيح زواج الرجال بالرجال و النساء بالنساء.

ان الديمقراطـية الغربـية تسـتطيع ان تـتحلل مـن أي شـيء حـتى مـن الديمقراطـية نفسـها بأغلبـية خاصـة أو باسـتفتاء شعبي أو بغير ذلك من الحـيل، حتى قال أحد حكام العرب يوما: ان للديمقراطية أنيابا و مخالب و أنها يمكن أن تكون اشرس من الدكتاتورية!!)

واتـە: هەربۆیـەش دیموکراسـی ئەمـەریکاییمان بیـنی کـە خواردنـەوە دروسـتکردن و بازرگـانی پێوەکردنی شەڕابی بەڕەوا داناوە هەرچەندە

زیانـە مـاددی و مەعنەوی‌یەکانیشـی بـۆ سەر تاك و خێزان و کۆمەڵگا و بـۆ سـەر ئـابووریی و ڕەوشــت و خـوو ســەلمێنراون، وە بینـیمان کـە هـەندێك لـە دیموکراسـی‌یەکانی ڕۆژئاوا شووکردنی پیاو بە پیاوو ژن بە ژنی بەڕەوا داناوە!

بـێگومان دیموکراسـی ڕۆژئـاوا دەتوانـێ دەسـتبەرداری هەموو شـتێك ببێ تەنانەت خۆیشـی! بە هۆی زۆرینەیەکی تایبەت یان ڕاپرسـی‌یەکی خـەڵکی یـان هەر فێڵێکی دیکەوە! تەنانەت یەکێك لە دەسـتەڵاتدارانی عـارەب ڕۆژێکـیان گوتوویـەتی: بێگومان دیموکراسی کەڵبە و چڕنووکی تیـژی هەن و دەنگونجێ لە دیکتاتۆری دڕتر بێت!

کەواتە :

وەك بینـیمان دکـتۆر (یوسـف) سـەرەنجام هاتەوەسـەر ئـەوە کە ئەو میکانـیزمە باشـانەی کـە لـە دیموکراسـی‌دا هـەن ئیسـلام هیچ کێشەو گرفـتی لەگەڵیان نیە، بەڵێ هەر ئەو میکانیزمە چاکانە بە هۆی کاکڵ و جەوهەرە شیرکی‌یەکەی دیموکراسـی‌یەوە کە بریتی‌یە لە: (مافی حەڵاڵ کـردن و حـەڕام کـردن بە غەیری خوادان)، بەڵێ ئەو میکانیزمە چاکانە بـە هـۆی ئـەو جەوهـەر و ڕووحـە پیسـەوە، وەك وەسیلەیەکی باش بە دەسـتی بابایـەکی خـراپەکار و سـتەمکارەوە سـەرەنجام دەبـنە خـزمەتکاری خـراپەکاران و بەرژەوەندی‌یـە سـتەمکارانە و ناشـەرعی‌یەکانی دیکـتاتۆر و سـەرمایەدارە بێویژدانەکانیان پێ‌دابین و مسۆگەر دەکرێن!

دیارە هـەر لێرەشـەوە سـادەیی ئـەو کەسـانەمان بـۆ دەردەکـەوێ کە پێـیان وایـە دیموکراسـی و (شوری) ی ئیسلامی یەك شتن!! لە حاڵێك دا کـە جـیاوازیان ئاسمـان و ڕێسـمانە و چـونکە دیموکراسـی دەسـتی پەرلەمان و نوێنەرانی میللەت ئازاد و ئاوەڵا دەکات بۆ هەر یاسادانان و

هەر بڕیاردانێك كە حەزی لێبێت بەبێ ڕەچاوكردن و گوێپێدانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ و دین و شەرعیەت و قیامەت و قیەم و ئەخلاق و ویژدان!

بەلاّم وەك پێشتریش گوتمان (شورای) و (اجتهاد) لە ئیسلام دا شەریعەتی خوا دەستی گرتوون و دەستی بەستوون لە ئاست هەر بڕیار و یاسایەك دا كە پێچەوانەی دەقێكی شەریعەت بێت. بگرە لە ئیسلامدا تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ لە بەرامبەر شەریعەتدا هیچ مافێكی پێنەدراوە بێجگە لە جێبەجێكردن (تطبیق)، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تُطِعْ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ، وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ (الاحزاب ٢،١) .

واتە : ئەی پێغەمبەر پارێز لە خوا بكە و فەرمانبەری كافران و مونافیقان مەكە، بێگومان خوا زانا و كاربەجێیە، وە شوێن ئەو بەرنامەیە بكەوە كە لە پەروەردگارتەوە بۆت دەنێررێ، بێگومان خوا بەوەی دەیكەن شارەزایە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنْ الأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ (الجاثية ١٨) واتە : پاشان تۆمان خستە سەر بەرنامەیەك لە ئایینی خۆمان، دەجا شوێنی بكەوە و مەكەوە دوای ئارەزووی ئەوانە كە نازانن.

هەروەها فەرموویەتی﴿ وَأَنْ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ﴾ (المائدة من الآية ٤٩)

واتە : وە بەوەی كە خوا ناردوویەتە خوارێ حوكمیان لە نێوان دا بكەو بە دوای ئارەزووەكانیان مەكەوە...

- حەز دەکەم قسەی کۆتاییت لەو بارەوە ببیستم !

+ لە کۆتاییدا دەڵێم:

بێگومان سیستەمی حوکمڕانی لە ئیسلامدا سەرجەم ئەو میکانیزم و لایەنە ئیجابیانەی کە لە دیموکراسیدا هەن گرتوونیە نێو خۆی یان دەتوانێ بیانگرێتە خۆی، ئەمە لە لایەکەوەو ، لە لایەکی دیکەشەوە لە سۆنگەی ئەوەوە کە سیستەمی حوکمڕانی لە ئیسلامدا، وەك سەرجەم یاساو سیستەمەکانی دیکەی بە چوارچێوەی شەریعەتەوە بەستراونەوە، ئەو بەڵاو گرفتانەی کە بەسەر دیموکراسی هاتوون و دێن لێیان پارێزراوو سەلامەتە، بەڵێ سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی لە سایەو بەرەکەتی ئەو بنەماو کۆڵەکە گرنگانەی کە شەریعەت دیاری کردوون کە گرنگترینیان و گەورەترینیان بریتیە لە تەنها خوا (تبارك و تعالیٰ) بە فەرمانڕەوای ڕەها(الحاكم المطلق) زانین و سەروەریی ڕەها (السيادە المطلقة) لەسەر شەریعەت (دەقەکانی قورئان و سوننەت) تاپۆکردن، بەڵێ سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامیی لە بەرەکەتی شەریعەتەوەو لە سایەی خۆ دوورگرتن لە بە پەرستراو دانان (تالیە)ی غەیری خوا، بە پێچەوانەی دیموکراسییەوە هەرگیز نابێتە بازیچە (العوبة) بە دەست سەرمایەدار و خاوەن بەرژەوەندییە ناشەرعییە ملهوڕەکانەوە کە بیکەنە چەرخ و فەلەك هەر جارە بە لایەك دا بیسووڕێنن و بەرژەوەندییە ستەمکارانەکانی خۆیانی پێ دابین بکەن.

مامۆستا گیان لە کۆتاییدا خوا پاداشتت بداتەوە، هەرچەندە پرسیارەکانم جارێ تەواو نەبوون، بەڵام ئەوانەی ماون بۆ ئاڵقەیەکی دیکەیان دادەنێم.

+ باشە بەسەر چاو، خوا پاداشتی ئێوەش بداتەوە.

## بەشی دووەم :

خۆشحاڵین کە لە ئەلقەیەکی نوێی بەرنامەی (سۆراغ دا بە یەك دەگەینەوە ، بەو هیوایەی بتوانین تەواوکەری بەرنامەی پێشتوو بین سەبارەت بەو بابەتەی کە لەگەڵ جەنابی (مامۆستا عەلی باپیر/ ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی)دا سازمان دابوو لە بارەی (دیموکراسیەت و دیکتاتۆریەت و هەڵوێستی ئیسلامی‌یانە لە بەرانبەریان)دا

- بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر !خۆشحالین بۆ جارێکی تر بە دیدارت شاد دەبین و بەخێر بێن سەرچاوان ، حەز دەکەم لەو قسەیەی (د.یوسف القرضاوی)یەوە دەست پێ‌بکەینەوە. کە جەنابت گلەییت لێی کردو فەرمووت: ناکۆکی (تناقض)یەك لە قسەکانی‌دا هەیە. هەڵبەتە ناوبراو ئالیەتی دیموکراسیەتی بەجەوهەر حیساب کردووە، واتە قەزیەیەك هەیە کە جەوهەری‌یە لە دیموکراسیەت دا نەیکات بە ئالیەت، وە بە پێچەوانەشەوە فەمووت: لە لاپەڕە (٢٧) کتێبی (من فقه الدولة في الاسلام) باس لە دیموکراسیەت دەکات کە حەڵاڵ حەرام دەکات و حەرامیش حەڵاڵ دەکات، بەڵام من ئەوەم تێدا خوێندۆتەوە کە ئەو ئەڵێ: دیموکراسیەتی رۆژئاوایی ئاوایە. ئیتر وا تێگەیشتم لە(د . یوسف القرضاوی) رەحمەتی خوای لێ‌بێ، کە ئێمە ئەتوانین دیموکراسیەتی شەرقی یاخود دیموکراسیەتی ئیسلامیمان هەبێ، بەڵام ئەو دیموکراسیەتەی کە ئێمە پیادەی دەکەین لە مەسەلەی تەشریع دا نەبێ کە حەرام حەڵاڵ بکات و حەڵاڵ حەرام کات، دیارە ئەو مەسەلانە کە (نص)ی لەسەرە ئێمە هیچ قسەیان تێدا ناکەین، بەڵام تەنها لەو

میکانیزمانەی سوودمەند دەبین، بۆیە ئێمە ئەڵێین: دیموکراسیەتێکی ئیسلامی.

+ (بسم الله الرحمن الرحیم و بە نستعین، زۆر سوپاستان دەکەم بۆ ئەم دیدارە لەو بارەیەوە کە ئایا ئێمە لە کاتێك دا لە شەرع لانەدەین دەنگونجێ بڵێین: (دیموکراسی)ین ؟ نێوەرۆکی پرسیارەکەشت لە ڕاستیدا ئەوەیە کە باسم کرد کە بێگومان بۆ هەڵسەنگاندنی هەر شتێك پێویستە سەرەتا وەك خۆی بیناسین وە بە تایبەت ئەگەر ئەو مەسەلەیە لە شوێنێك دا پراکتیك کرابێ دەبێ بەو شێوەیەی کە لەو شوێنەدا پیادە کراوەو بۆتە واقیعێك دەبێ لەبەر ڕۆشنایی بوونی واقیعیانەیدا سەرنجیبدەین. واتە پێویستە لەبەر ڕۆشنایی بوونی واقیعیانەی ئەو شتەدا پێناسەی بکەین، جا ئەگەر تەماشای دیموکراسی بکەین چ دەبینین؟! جارێ من زۆر بە ڕاشکاوی دەڵێم وە هەموو ئەوانەش کە بە ئینصافەوە قسەیان کردەو قسە دەکەن دەبارەی دیموکراسی، دەڵێن تا ئەو وڵاتانەی ئێستا لە جیهانی کە ناوی لێنراوە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (چونکە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بە نسبەت بەریتانیاوە، واتە ئێران و زۆربەی عالەمی عەرەبی دەبێتە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست واتە بە نسبەت ئەوانەوە نێوەڕاستە، دیارە ڕۆژهەڵاتی دوورتر هەیە و ئەولاش هەیە، بە هەر حاڵ ئەوە ناوێکە کاتی خۆی ئیمپراتۆری بەریتانی بەسەر بەشێك لە عالەمی ئیسلامیدا بڕیوە) یان لە عالەمی عەرەبی یان عالەمی ئیسلامیی دان کە بانگەشەی دیموکراسییان کردوە هەموو ئەوانەی کە ئینصافیان هەیە دەڵێن: دیموکراسی وەك حەقیقەت لەو شوێنانە وجوودی نیە بەڵکو هەر ناوەو نێوەرۆکی نیە، بەڵام خۆ هیچ کەس ناتوانێ ئینکاری بکات کە دیموکراسی لە ئەمەریکا و فەڕەنسا و بەریتانیادا هەیە، لە وڵاتانی

ڕۆژئـاوا بـه گشــتی هەیـه، بـا تەماشـا بکـەین داخـۆ دیموکراسـی لـەو شــوێنانەدا چـۆنه ئـا ئـەوه دیموکراســی‌یه، نـەك تـۆ بلـێی ناهـێڵم دیموکراسی له شەرع لا بدات و بۆ دڵی مسـوڵمانان بکات و ناهێڵم هیچ شـتێکی تـێدابێ کـه پێچـەوانەی قورئـان و سـوننەت بێ و ناویشـی لـێ دەنـێم دیموکراســی! ! چـونکه ئـەو کاتـه تـۆ بوخـتان بـه دیموکراسی دەکـەی، ئەگـەرنا ئـەوه دیموکراسـی نیه، بەڵکو ئەوه ئیسـلامه، ئینجا ئەگــەر بگوتــرێ: ئــەدی ئــەوه نــیه میکانــیزمەکانی دیموکراســی بەکارهێــنراون! ! لــه وەڵام دا دەڵــێین: لــه ڕاســتی‌دا میکانــیزمی سیسـتەمی حوکمـڕانی دیموکراسـیماڵی کەس نیه، چونکه میکانیزمی حوکمـڕانی وەك مەسـائیلی ئـیداری مـاڵی کـەس نـیه و کەلـەپوورێکی بەشـەریەتەو ئێسـتا لـه دەسـتی ڕۆژئـاوا دایـەو ڕۆژێك له ڕۆژهەڵات له دەستی مسوڵمانان دابووه.

هــەندێك کــەس دەڵــێن شــووڕا (شــوری)ی ئیســلام یەعــنی دیموکراســیی! ! بـەڵام بـێگومان شـووڕاو دیموکراسـیی جـیاوازی‌یان هەیـه، جـیاوازی‌یەکی زۆر و ڕیشـەییش، چـونکه شـووڕای ئیســلامیی پابـەنده بـه شـەریعەتەوه، بەڵام دیموکراسی ڕۆژئاوا پابەند نیه به هیچ شـتێکەوه.

- بەڵام ئایا دیموکراسـی پابەند نیه به دەسـتوورەوە؟

+ بـا، بـەڵام دەسـتوورێکیش کـه هـەر مـیللەت دایدەنێ، کەواته وەکو دەڵـێ: هـەموو ئاوەکـان لـه کـەنداو کۆدەبـنەوه، هـەمووی دەچـێتەوه دەسـتی مـیللەت، جا میللەت چۆنی پێ باش بوو ئاوا دەکاو بڕیار دەدا (د. یوسـف قرضاوي)یش لەو بارەوه گوتوویەتـی : (من هنا یمتاز نظام الشــوری الـذي تقـوم علـیه الدولـة المســلمة لأن للشــوری حـدوداً الا تتعداها: فعقائد الاسلام بأیمانه، و أرکانه العملیة، و أسسه الأخلاقیة، و

أحكامه القطعية، و هي المقومات الأساسية التي ارتضاها المجتمع و أقام عليها نظام حياته لا مجال فيها للشورى)[88] .

بەڵێ شووڕای ئیسلامیی جیاوازییەکەی ئەوەیە لەگەڵ دیموکراسی ڕۆژئاوادا کە شووڕا لە ئیسلام دا لە شتێك دایە کە دەقی لەسەر نەبێ، وە شووڕاو ئیجتیهاد لە ئیسلام دا لە چوارچێوەی شەریعەت دایە، جا وەك مامۆستا(یوسف) دەڵێ: سیستەمی شووڕا کە دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر بنیات دەنرێ چەند سنورێکی هەن کە نابێ ئەو سنوورانە ببەزێنرێن و شەریعەت چەند قەدەغەیەکی دیاری کردوون نابێ ئەو قەدەغانە بشکێنرێن بۆ وێنە: عەقیدەو ئیمانییەکان و پایە و بنەڕەتە کردەییەکانی وەك: (نوێژ و زەکات و ڕۆژوو حەج و جیهاد ...) هەروەها بنچینە و بنەما ئەخلاقییەکان، وە یاسا قەطعییەکان بۆ وێنە: سوو (ربا) حەڕامە، (دزیی) حەڕامە، ئەوە بە هیچ کەس دەستکاری ناکرێ، هەزار ساڵ خەڵك کۆببێتەوە هەڵبژاردن بکات و پەرلەمان دابینشێ ئەگەر خۆی بە مسوڵمان بزانێ نابێ قسە لەوە بکات کە خوا بڕیویەتەوە، خوا دەفەرموێ حەڕامە کەواتە حەڕامە! هەروەها شتێکیشی حەلاڵ کردوە بە هەمان شێوە، بۆ وێنە: پیاوێك بۆی هەیە زیاتر لە ژنێك بهێنی لە سنووری شەرع داو بە ئادابی شەرعیەوە، ئیدی ئەوە (٥٠) پەرلەمان کۆببێتەوە، ئەگەر خۆی بە مسوڵمان بزانێ نابێ باسی قەدەغەکردنی بکات، هەر کەسێك تاك یان کۆمەڵ خۆی بە مسوڵمان بزانێ نابێ شتێك کە خوای پەروەردگار حەلاڵی کردووە لە خەڵکی قەدەغە بکات یان شتێك کە خوا لە خەڵکی قەدەغە کردوە بۆ خەڵکی ڕەوای بکات!

---

(٨٨) بڕوانە ( فقه الدولة في الاسلام ) ص ٣٧.

جا قسـەیەکی (د . یوسف القرضـاوي) زۆر جوانـه دەڵـێ: (و لا یملك بـرلمان و لا حكومـة إلغاء شـيء منها، لأن ما اثبته الله لا ينفيه الأنسان و ما نفاه الله لا يثبته الانسان)[٨٩]

واتـه: پەرلـەمان و حکوومـەت لـه ئیسـلامدا ناتوانـێ هـیچ شـتێك لەغو بکاتـەوەو لابـبات، وە ناتوانـێ هـیچ شـتێك بـریار بـدات کـه شــەرع قەدەغەی کردوه.

ئێسـتاش پـێم وایـه زۆر بـاش ناکۆکی و پێکەوە دژیی (تناقض)ی قسـەکانی دکـتۆر (یوسـف القرضـاوي) دەرکـەوت، چونکه لە لایەکەوە دەڵـێ: جەوهـەر و کـرۆکی دیموکراسـیی لەگـەڵ ئیسـلام دا ڕێکەو، له لایـەکی دیکەشـەوە دەڵـێ: دیموکراسـی بە هۆی نەبوونی چوارچێوەی شـێرازەیەکەوە کـە بیـپارێزێ لـە لادان (انحراف) سـەری لـە شتی زۆر خراپ و ناقۆڵا و ناماقووڵەوە دەردەچێ!!

- مامۆسـتا گیان لـه کاتـێك دا جەنابـت ئەفـەرمووی کـه ئەبێ ئێمه پابـەند بــبن بــه دەق (نــص) شــەرعیەکانەوە، ژیانــیش لــه گۆڕانکاریيەکی بەردەوام دایه.

+ بەڵـێ!

- وەکـو هـەمووومان ئاگـادارین سـاڵ بـۆ سـاڵ جـیاوازی هەیە و لەوە دەچـێ ئــەوم ســاڵ و چــوار ســاڵیتر زۆر جــیاوازی هــەبێ، دەقــه شـەرعیەکانیش (١٤٢٠) هەزار و چوار سەدو بیست ساڵه ماوەنەوە بۆ ئـێمه، ئـەم گۆڕانکاری‌یانـە، پێویسـتمان بـه کۆمەڵـێك شـت هەیـه کە داهێـنانە، ئەگـەر ئـێمه پابەند بین بە دەقە شـەرعیەکانەوە ئایا ئەوە نابێـته فاصیله و دیوارێـك لـه نـێوان ئـێمه و ئـەو گۆڕانکاری‌یانـەی لـە

(٨٩) سـەرچاوەی پێشـوو ، هەمان لاپەڕە

جیهاندا هەیە؟! بە کورتی دەتەوێ بڵێی: چۆن دینێکی وەستاو بە فریای ژیانێکی گۆڕاو دەکەوێت؟! چونکە عەلمانییەکان زۆرجار ئەوە دەڵێن: دیارە تۆش لەسەر زاری ئەوان ئەم پرسیارەت کردوە، جا عەلمانیەکان دەڵێن: دین (دۆگما)یەو دینێکی (دۆگما) و (جامد) و وەستاویش چۆن فریای ژیانێکی گۆڕاو دەکەوێت؟!

- بەڵێ ئەو پرسیارە پرسیاری عەلمانییەکانە، جا ئایا وەڵامەکەی چۆنە؟!

+ وەڵامەکەی بەو شێویەیە کە ئیسلام هەموو سیستەمەکانی حوکمڕانی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی و جیهادیی و عیبادی و ئەخلاقییەکەی، خوای پەروەردگار (جل جلاله) کە دایناوە (کینونة)ی مرۆڤ و سروشت و فیطرەتی ئینسانی لەبەرچاو گرتوە چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵ، بۆ وێنە: ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە عەقیدە و ئیمانەوە هەیە یاخود پەیوەندییان بە عیبادەت و ئەخلاقەوە هەیە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو سێیانە هەر سێکیان هەم عەقیدە و هەم عیبادەت و هەم ئەخلاق پەیوەندییان بە ڕووحی ئینسان و بە جەوهەری مرۆڤەوە هەیە، کە بێگومان ئەویش حەقیقەتێکی نەگۆڕ و چەسپاوە، دەبینین خوای پەروەردگار یاسای نەگۆڕی بۆ داناون، بۆ وێنە لە بواری ئیمان و عەقیدەدا: خوای پەروەردگار تاك و تەنهایەو ئەوە ناویەتی و ئەوە سیفەتی و خوا ئاوا لەگەڵ بەندەکانیدا ڕەفتار دەکات، هەروەها پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کێن و فریشتەکان چۆنن و قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ ...هتد ئەمانە هیچیان دەستکاری ناکرێن، بۆچی؟! چونکە پەیوەندییان بە کۆمەڵێك ڕاستییەوە هەیە کە لە (وجود)دا ڕیشەیان قووڵە و ناگۆڕێن، وە لە فیطرەتی ئینسان دا ناگۆڕێن، وە لەبواری عیبادەت، ئینسان

چۆن بەندایەتی بۆ خوا بکات؟! ئەوە تەنها خوا دەیزانێ و هەر خۆی دیاریی کردوە، من نموونەیەکت بۆ بهێنمەوە: (دەست نوێژ) کە شتێکی زۆر بچووکە لە عیبادەت دا، خوای پەروەردگار دەست نوێژی بۆ پێغەمبەریش ﷺ بەجێنەهێشتووە، بەڵێ پێغەمبەریش لە سوننەتی عەمەلیی خۆیدا فەرموویەتی دەست نوێژ ئاواو ئاوا بگرن، بەڵام خوای پەروەردگار لە ئایەتێکی سوورەتی (المائدة) دا هەموو پایەکانی دەست نوێژی ڕوون کردوونەوە کە بێگومان شتێکی زۆر جوزئییە بۆچی؟! چونکە مەسەلەی عیبادەت لە سەرووی ئاست و بڕستی عەقڵەوەیە، ئایا چۆن تەعامول لەگەڵ خودا (جل جلالە) دەکرێ چۆن بەندایەتی بۆ خوا دەکرێ؟! بەس خوا دەزانێ هەر بۆیەش خۆی دیاریی کردووە، خوای پەروەردگار دەربارەی دەست نوێژ دەفەرموی: ﴿ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ ﴾ ( المائدة من الآية ٦)

زانایانی شەرع زان دەڵێن: دەست نوێژ شەش (٦) پایەی هەن بەم شێویە: (نیەت) ، شۆردنی دەموچاو، شۆردنی دەستەکان لەگەڵ ئانیشکەکان، مەسح کردنی سەر هەمووی یان هەندێکی، شۆردنی هەردوو پێ لەگەڵ گوێزینگەکانی پێ، وە ڕیز (ترتیب)، جا خوای کاربەجێ بە ڕیز هەر شەش (٦) پایەکانی لەم ئایەتەدا باس کردوون.

بەڵێ مەسەلەکانی عیبادەت و بەندایەتیی خوای پەروەردگار هەمووی لە قورئان دا باس کردوون، پاشان پێغەمبەریش ﷺ بە درێژی ڕوونی کردوونەوە و هیچیان بۆ ئیجتیهاد و هەڵهێنجانی زانایان بەجێنەهێشتراوە، مەسەلەی ئەخلاقیش هەر وایە، بۆ وێنە: (ڕاستی)

شتی چاکە، (ئەمانەت پاراستن) شتی باشە، (داوێن پاکی) شتی باشە، بۆیە فەرزن، بەڵام (درۆ ، زوڵم ، خوێن ڕێژی) خراپن بۆیە حەرام و قەدەغەن و گۆڕانیان بەسەردا نایەت، چونکە ئەوانە پەیوەندییان بە سروشت (فطرة) و پێکهاتە (کینونة)ی بەشەرەوە هەیە، بەڵام ...

– ئەدی ئەگەر زۆرینەی ئەو خەڵکە شتێکی داواکرد کە پێچەوانەی ئیسلام بێت وەك داوێن پیسی، کە داوێن پاکی لە ئیسلام دا ئەمیەت و گرنگی‌یەکی تەواوی هەیە، بەڵام ئایا ئێستا زۆرینەی ئەو خەڵکە باوەڕی بە داوێن پاکی هەیە؟

+ کاك تۆفیق! دوو شت هەن نابێ تێکەڵ بکرێن: فیطرەت هەیە و عادەت هەیە، جا ئایا جیاوازیی نێوان فیطرەت و عادەت چی‌یە؟ عادەت ئەوەیە کە لە نێو کۆمەڵێك دا هەیە و لە نێو کۆمەڵێکی دیکەدا نیە، بەڵام فیطرەت قەت (استثناء)ی تێدا نیەو لە نێو هەموو خەڵك دا دەبێت، شتی فیطری چونکە پەیوەندیی بە سروشتی ئینسانەوە هەیە هەموو ئینسانەکان تێیدا بەشدارن، بەڵام شتی عادەتی لە شوێنێك هەیە و لە شوێنێکی دیکە نیە، ئەوە کە ئەو ڕووتی و بەرەڵڵایی و بێبەندوباریی و داڕووخانی ئەخلاقی کە لە ڕۆژئاوا هەیە، هەڵقولاوی فیطرەتی ساغ و عادەتێکی خراپە و سەری هەڵداوە، چونکە کاتی خۆی خۆیشیان نەیان بووە و ئێستا خۆیشیان لێی بێزارن، کەواتە ئەوە عادەتێکی خراپە و هیچ پەیوەندی بە فیطرەتەوە نیە و بگرە بە پێچەوانەی فیطرەتیشە!

– مامۆستا کابرایەکی سەد (١٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا ئەگەر دیتبای نامەحرەمێك لەگەڵ خێزانی‌دا وەستاوە ئەوە چ هەرایەکی گەورەی دروست دەکرد؟ بەس من باس لە ئەورووپا ناکەم لە کوردستانی

خۆماندا لەم فەترەیەدا بینیم وەزیری رۆشنبیری فەرەنسی هاتبوو سەردانی کوردستانی دەکرد، لە رێگا گەیشتە بوك و زاوایەك ئەملاو ئەولای زاوا و بووکەکەیشی ماچ کرد بە بەردەمی زاواکە، کابراش زۆر پێی ئیعتیادی بوو و پێدەکەنی ! !

+ تەفسیری ئەو دیاردەیەی نەمانی غیرەت و داڕووخانی ڕەوشت، ئەوەیە کە خەسڵەتە فیطری‌یەکان بە هۆی پەروەردەوە گەشە دەکەن، بە هۆی فێرکردن (تعلیم)ەوە گەشە دەکەن نەشونما دەکەن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ، قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ، وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا ﴾ (الشمس ٧- ١٠).

تەزکیە یانی گەشە پێدان و پەروەردەکردن و نەشونما پێدان، ئەو دیمەنەی کە تۆ بینیوتە، شتێکی فیطری نیە، بەڵکو ئەوە کەوتنە ژێر کاریگەریی عادەتی میللەتێکی فیطرەت تێك چوویە، کابرا ویستوویەتی خۆی لەگەڵ ئەو جەووەدا بگونجێنێ، من دەزانم ئەو زاوایە لە قەراری نەفسی خۆیدا پێی ناخۆش بووە هاوسەرەکەی بە بەرچاویەوە ماچ بکرێ! بەڵام بۆ ئەوەی ڕەخنەی لێنەگیرێ بێ دەنگ بوە، وەك گەلێك لە ئافرەتان هەن کە بەرگ و پۆشاکی سەیر و عەجایەب لەبەر دەکە، هەیانە دەڵێ: وەڵلاهی لە دڵی خۆمان دا نامورتاح و ناسوودەین بەڵام ئەوە عادەت و باوە و ئەگەر وا نەکەین ڕەخنەمان لێدەگیرێ.

- بابێینەوە سەر مەبەستەکەمان.

کە عەقیدە و عیبادەت و ئەخلاق چەند یاسایەکی نەگۆڕیان بۆ دانراون !

+ بەڵێ خوای پەروەردگار دەقی (تفصیلی) بۆ داناون و پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵە دەقێکی بۆ داناون کە مەجالی ئیجتیهادیان تێدا نیە مەگەر لە چۆنیەتی جێبەجێکردنیاندا، ئەگەرنا شەریعەت خاڵی تێدا خستوونە سەر پێتان.

بەڵام ئەو دەقانەی کە پەیوەندی‌یان بە لایەنی ماددی ئینسانەوە هەیە وانین، چونکە ڕووح نەگۆڕە بەڵام لایەنی ماددی دەگۆڕێ لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دیکە، بۆیە ئەو دەقانەی شەریعەت (الکتاب و السنة) کە پەیوەندی‌یان بە لایەنی حوکم و سیاسەتەوە هەیە یان لایەنی ئیدارەوە، یان پەیوەندی‌یان بە لایەنی ئابووری و لایەنی کۆمەڵایەتی‌یەوە هەیە، دەبینین لە حاڵێك دا کە لە بواری عیبادەت دا تەنانەت پایەکانی دەست نوێژیش لە قورئان دا باس کراون بەڵام لە بواری حوکم و سیاسەت دا خوای پەروەردگار شێوەو شکڵی دەوڵەتی لە قورئان دا بۆ باس نەکردووین، بەڵکو هەم قورئان هەم سوننەت کۆمەڵێك پایەو ڕەکیزەیان خستوونەڕوو کە دەبێ سیستەم و حوکمڕانێتیی ئیسلامیی لەسەریان بنیات بنرێ، هەروەها لە بواری ئابووریی‌دا خوای پەروەردگار لە لایەکەوە خاوەندارێتی (الملکیة) دەسەلمێنێ وەك دەفەرموێ: ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ﴾(البقرة من الآية ٢٨٦) یان دەفەرموێ: ﴿ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ ﴾(البقرة من الآية ٢٧٩) لەو لاشەوە دەفەرموێ ﴿ كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ ﴾(الحشر من الآية ٧) کەواتە ئیسلام لە ڕوی ئابووری‌یەوە تەنها چەند پایەو بنەمایەکی سەرەکی دیاری کردوە ! لە لایەکەوە ئینسان بۆی هەیە بەرهەمی ڕەنجی خۆی بخوات، بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە دەڵێ نابێ لەسەر حیسابی خەڵك و

جـەماوەر مـالّ و سـامان وەسـەرێك بـنێ، ﴿ كَـــيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِـــيَاءِ مِـــنْكُمْ ﴾ واتـە: نابـێ مـالّ و سـامان و دارایـی لـە دەسـت دەوڵەمـەندەکان دا کۆبێـتەوە، کەواتـە سیسـتەمی سـەرمایەداریی لـە ئیسـلام دا ناڕەوایە و پەیدابوونی چینی (بۆرژوازی) ناڕەوایە کە ئێسـتا لـە سیسـتەمی سـەرمایەداریی‌دا هەیـە، بـەڵام دیسـان واش نـا کە کابرا زۆریـش خـۆی مـاندوو بکـات بـەڵام دیسـان هەر یەکسان بێتەوە لەگەڵ کەسـێك دا کـە هیچ خۆی ماندوو نەکردوە، وەك (ئیشـتراکیەت) دەیڵـێ !!

بـەڵـێ ئیسـلام لـەو بوارانـەدا کۆمەڵـێك پایـەی دیـاری کـردوون، بـەڵام بۆشـاییەکی زۆری بەجێهێشـتوە، بۆ گەشەکردنی زەمان و بۆ (تطور)ی ژیـان، بـۆ ئیجتـیهادو هەڵهێـنجانی زانایـان و پسپۆڕان کە سەرجەم ئەو بۆشاییانە بە حوکم و یاسای هەڵهێنجراوی گونجاو پڕ بکەنەوە.

ئایا ئیجتیهادی شەرعزانان (الفقهاء) و پسپۆڕان لە بواری بازرگانی و مامەڵـە(الـتجارة والبـیع والمعاملـة) و لـە بـواری پـەیوەندیی نـێوان دەوڵـەتان دا، لەچـی‌یەوە پـەیدا بـووە؟ بـێگومان لەوە پەیدا بووە کە خـوای پـەروەردگار کۆمەڵێك ئایەتی فەرمووەو پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێك فـەرموودەی فـەرمووە لـەو بوارانـەدا بـەڵام لـە ڕووی حـیکمەتەوە بۆشـاییەکی زۆر بەجێهـێڵراوە بـۆ ئەوەی کە لەبەردەم گۆڕانی زەمان و گەشـەکردنی ئینسـان دا دەسـتوپێی خـەڵکی بـە کۆمەڵـێك دەقـی دیاری‌کـراو نەبەسـترێ، بـەڵکو مەجالیان هەبێ بە ئیجتیهادی خۆیان و بە پێی داخوازیی بەرژەوەندی‌یەکانیان ئەو کەلێنانە پڕ بکەنەوە.

جـا مـن لـێرەدا لـەو بـارەوە دەقێکـت بـۆ دەخوێـنمەوە کـە زانای پایەبـەرز (ابـن القـیم الجوزیـة) لـە کتێـبی (الطرق الحکمیة في السیاسـة الشـرعیة) لـە لاپـەڕە (١٣-١٤)دا هێـناویەتی، کـە هەندێکیان لە زانای

نـاودار (ابن عقيل)ەوە نەقڵ دەكات و دەڵێ: (فقال ابن عقيل: السياسة ماكـان فعـلا يكـون معه الناس أقرب الى الصلاح و أبعد عن الفسـاد و إن لم يضـــعه الرسـول و لا نــزل بــه وحــي) واتــە: سياســەت (مەبەسـت سياسـەتی شـەرعی‌يە) بريتـيە لـە كـردەوەيەك كە خەڵك بە هۆيەوە لە بـەرژەوەندی نزيكتـر بن و لە زيانيش دوورتر بن، با پێغەمبەری خواش ﷺ دای‌نـەنابێ و دەقيشـی لەسـەر نەهاتـبێ، هـەر شـتێك ببێـتە هۆی دابـين كـردنی بـەرژەوەندی خەڵك، ئەوە سياسەتێكی شەرعی‌يە، دواتر دەڵــێ: (فـإن أردت بقولك) پێشـتر قسەيەكی زانايەكی شافيعی مەزەب دێـنێ كـە گوتوويەتی (لا سياسة الا ما وافق الشـرع) جا بەرپەرچی ئەو قسـەيە دەداتـەوەو دەڵــێ: زانايە شافيعی‌يەكە گوتوويەتی: تەنها ئەوە بە سياسەت دادەنرێ لە ڕووی شەرعی‌يەوە كە موافيقی شەرع بێ و بە پـێی شـەرع بـێ، وەڵامـی دەداتــەوەو دەڵــێ: (فـإن أردت بقولك: الا ما وافـق الشـرع أي لم يخـالف مـا نطـق به الشرع، فصحيح، و إن أردت: لا سـياسـة الا مـا نطق به الشرع فغلط و تغليط للصحابة) واتە: ئەگەر لەو قسـەيەت دا كـە دەڵـێی (لا سـياسـة الا ما وافق الشرع) مەبەسـتت پێی ئـەوە بـێ كـە پێچـەوانەی شـەرع نـەبێ و لەگـەڵ دەقێكی شەرعی تێك نـەگيرێ، ئـەوە ڕاسـتە، بـەڵام ئەگەر مەبەستت پێی ئەوە بێ كە دەبێ حەتمـەن دەقـێكی شەرعی لەسەر بێ، ئەوە غەلەت و بە غەڵەت دانانی هـاوەڵان (أصحاب)يشەوە دوايی چەند وێنەيەك دێنێتەوەو دەڵێ: (فقد جـرى مـن الخلفـاء الراشـدين مـن القـتل و التمثـيل مـا لا يجـده عـالم بالسـنن...) چـەند وێنەيەك دێنێتەوە لە خەليفە ڕاشيدەكان (رضي الله عنهم) كـە چـەند شـتێكيان كردوە بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەيكردوون، بۆ وێـنە: ســووتێنرانی قورئـان (مصـحف)ەكـان لـە ڕۆژگـاری خەلـيفەی سـێيەم دا خـوا لـێی رازی بـێ، دوای ئـەوەی كـە هــەموو خەڵكـيان

کۆکردەوە لەسەر (مصحف)ی (عثمان) خوا لێی رازی بێ، دیارە هەر هاوەڵێك (مصحف)ێکی نووسیبۆوە، بە ئیجتیهادی هەموو هاوەڵان کۆیان کردنەوەو هەموویان سووتاندن[٩٠] . هەروەها خەلیفەی چوارەم (ئیمامی عەلی) خوا لێی رازی بێ، کە زەندیقەکان ئەوانەی کە (علی)یان بە پەرستراو (اله) دەزانی سووتاندنی!

هەروەها خەلیفەی دووەم (ئیمامی عومەر) خوا لێی رازی بێ، کە (نصر بن حجاج)ی لە شاری مەدینە نەفی کرد، کە گەنجێکی زۆر جوان بوو رۆژێك گوێی لێبوو ئافرەتێك پێی هەڵدەگوت، ئینجا عومەر بانگی کرد و گوتی: مادام وایە تۆ خۆت جوان و بەرچاو مەکە، وە فەرمانی پێکرد کە پەرچەمی هێشتبوویەوە بیتاشێ، بەڵام کاتێك پەرچەمی لابرد و سەری کورت کردەوە جوانتریش هاتە بەرچاو! ئەوجار (ئیمامی عومەر) خوا لێی رازی بێ گوتی: نابێ لە مەدینەی پێغەمبەردا ﷺ حاڵەتێکی وا هەبێ ئافرەتان خۆزگە بۆ گەنجێك بخوازن بە حەرامی ، نابێ لە مەدینەی پێغەمبەردا ﷺ شتی وا ببێ بۆیە نەفی کرد بۆ شارێکی دیکە.

جا دیارە ئەو حوکمە راستەوخۆ لە هیچ دەقێکی قورئان و سوننەت دا نیە، بەڵکو یاسایەکی سیاسەتی شەرعیيە، دوایی (ابن القیم الجوزیة) قسەیەکی زۆر جوان دێنێ و دەڵێ: خوای پەروەردگار (ارسل رسله و انزل کتبه لیقوم الناس بالقسط وهو العدل الذي قامت به الارض و السموات) واتە: خوا پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوە، کتێبەکانی ناردۆتە خوار تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەچن،

---

(٩٠) چونکە موصحەفەکانی دیکە بە ئیجتهادی شەخسی و هەر کەسە بە شێوەیەك نووسیبوویەوە .

ئـەویش بریتـیە لـەو دادگەریـیەی کـە ئاسمان و زەوی بە هۆی ئەوەوە ڕاوەسـتاون، پاشان دەڵێ: (فإذا ظهرت امارات العدل و أسفر وجهه بأي طـريق كـان فـثم وجـه الله و ديـنه) واتـە: جـا لە هەر شوێنێك نیشانە و سـیمایەکانی دادگـەری دەرکـەوتن ڕووی گـەش و جوانـی دادگـەری دەرکـەوت بـە هـەر شـێوەیەك بـێ، ئـەوە شـەرعی خـواش لەوێـیە و دیـنیخواش لەوێدایە، پاشـان دەڵـێ: (فـأي طريق استخرج به العدل و القسـط فهـي مـن الديـن ليسـت مخالفة له، فلا يقال: إن السياسة العادلة مخالفـة لمـا نطق به الشرع بل موافقة لما جاء بل هي جزء من أجزائه و نحـن نسـميه سياسـة تـبعا لمسطلحكم و إنما هي عدل الله و رسوله ظهر بهـذه الأمـارات و العلامـات) دەڵێ: کەواتە چۆن دادگەری دەچەسپێ و چـۆن بـەرژەوەندیی خـەڵك بێتە دی مادام پێچەوانەی دەقێکی شەرعی نـەبێ ئـەوە شـەرعە، ئیدی مـەرج نـیە کـە حەتمـەن دەقـێکی شەرعی لەسـەر بـێ، بـۆ وێـنە: دیـاری کـردن (تحديـد)ی مـاوەی حوکمڕانی کە ئێسـتا باوە لە وڵاتانی دیموکراسییدا کە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، چوار ساڵ بێ، یان پێنج ساڵ بێ، هەرچەند بێ مادام خەڵك بە چاکیان زانـی و گوتـیان ئەو شتێکی باشە بۆ ئەوەی هیچ کەس نەیکاتە میرات، یـان بـۆ ئـەوەی زۆر ڕەگ و ڕیشـە دانەکوتێـت، ئـەوە مـادام خـەڵك بە باشـی دەزانـن وە هـیچ دەقـێکی شەرعیشـی لەسـەر نیە کە قەدەغەی بکـات، داگـەریی پـێ جێبـەجێ دەبێ و بەرژەوەندی خەڵکی پێ دابین دەکرێ، ئەوە مەسەلەیەکی ڕەواو چاکە.

– وەك نیظامی جمهوری؟

+ بـەڵێ سیستەمی کۆماری کە جەماوەری خەڵك حوکمڕانەکانیان هەڵ دەبژێـرن و ئـەو میکانـیزم و ئـیدارياتانەی کـە هەيـەتی بە کورتی چۆن بـەژەوەندی خـەڵك دابـین بـبێ و چـۆن خـراپە و زیـان لـە خـەڵك

دووركەوێتەوەو بەرژەوەندی‌یەكانی خەڵك دابین بن، شەریعەتی خوای پەروەردگار هیچ نكوولّی لێی نیە مادام پێچەوانەی دەقێكی شەرعی نەبێ، بێگومان هیچ كاتێكیش دەقەكانی شەریعەت لەگەڵ هیچ قازانج و بەرژەوەندی‌یە ڕاستەقینەكانی تاك و كۆمەڵ دا تێك نەگیراون و ناگیرێن.

– كەواتە دەتوانین بڵێین: داهێنان (إبداع) لە دین دا حەرامە؟! لەو سێ بوارەدا كە جەنابت فەرمووتن و دەقی شەرعی‌یان لەسەرە (عەقیدە، عیبادەت، ئەخلاق)؟

+ بەڵێ، بەڵام لە بوارەكانی دیكەی دونیایی‌دا وەك .. حوكمڕانی و كاروباری ئیداری و زۆرشتی دیكە ڕێگە كراوەتەوە بە پێی ئەو بنچینە شەرعی‌یانە كە بۆیان دانراوە ئیجتیهادی تێدا دەكرێ و مەسەلەیەكی دیكەیە.

وە من قەناعەتم وایە كە پەیداكردن و داهێنان (الأحداث و الإبتداع) لە دین دا چەندە خراپە، تازەگەریی و داهێنان (التجدید و الأبداع) لە ژین دا هێندە پێویستە، واتەبە پێچەوانەن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین كە دین تەنها بریتی نیە لە (عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاق)، بەڵكو من دەڵێم لە بواری عەقیدە و عیبادەت و ئەخلاق دا دەقەكانی‌دین باسی وردە بابەتەكانی ئەو مەسەلانەشیان كردوە، ئەگەرنا دین وێڕای ئەو سێ شتانە سیاسەت و حوكمیشەو ئابووری و كۆمەڵایەتیشەو سیاسەتی نێو دەوڵەتانیشە، وە دین لەو بوارانەدا كە ئینسان عەقڵی پێیان دەشكێ وە ژیان و گوزەرانیش لەو بوارانەدا زۆر بە خێرایی گەشە دەكات و بەرەو پێش دەچێ، (نصوص)ی كەمی داناوە، وە بۆ ئەوەی دەست و پێی خەڵك نەبەسترێ بۆشایی زۆری هێشتۆتەوە تاكو بە ئیجتیهادی پسپۆڕان و شارەزایانی دین و ژین پڕ بكرێتەوە،

ئەگەرنا دین هەر ئەو سێ بوارەی نیە، ئەو سێ بوارەی دین زیاتر پەیوەندییان بە تاك (فرد)ەوە هەیەو زیاتر پەیوەندییان بە ڕووح و کەینوونەی ئینسانەوە هەیە بەڵکو دین لە بوارەکانی دیکەش دا هەر دەیەوێ حاکم بێ، هەمووی ئاراستە (توجیە) دەکات، بەڵام بۆ ئەوانە دین مەجالی زۆری هێشتۆتەوە بۆ عەقڵی ئینسان و ئیجتیهادی ئینسان.

– مامۆستا با بڕۆینە سەر تەوەرەیەکی دیکە هەر لەو قەزیەی حوکمڕانیەدا زۆرجار گلەیی لە ئیسلام یاخود لە ئیسلامییەکان دەکرێ و دەڵێن: کەوا مێژووی ئیسلامیی شاهیدە کە ئیسلام لە دیکتاتۆریەتەوە نزیکە تا دیموکراسیەت، هەرچەند جەنابت بە دوورو درێژی باسی ئەوەت کرد لە ئەلقەی پێشوودا کە ئیسلام ئیسلامە نە دیموکراسیەو نە دیکتاتۆرییەتە، جا ئایا دەتوانین بڵێین: کۆمەڵێ خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوان ئیسلام و دیموکراسیەت دا؟!

+ بەڵێ

– ئەدی خاڵی هاوبەش چییە لە نێوان ئیسلام و دیکتاتۆرییەت دا؟!

+ هەرچۆن بێ تا ڕاددەیەك دیموکراسی ڕێزگرتنی میللەت و جەماوەری تێدایە وەك باسمان کرد دەجا هەموو شەریعەتەکانی خوای پەروەردگاریش هاتوون تاکو لەسەر خەڵك بکەنەوەو لەسەر میللەت و جەماوەر وەدەنگ بێن لە بەرانبەر دەستەڵاتداران دا، هەر بۆیەش دیکتاتۆریەت و فیرعەونایەتی و طاغووتایەتی بە درێژایی مێژوو گەورەترین دوژمنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و سەختترین کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێیان بووە! ئەوە (نوح)ەو (علیه الصلاة و السلام) کە (ملأ) ﴿ قَالَ الْمَلأَ الَّـذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِنْ قَوْمِهِ ﴾ (الأعراف: من الآية ٨٨) واتە: ئەو ئەشراف و زلەزلانەی کە خۆیان بە زل گرتبوو، بەڵێ ئا ئەوانەی دژی دەوەستنەوە! بەڵام کێن کە دەبنە پشتیوان و

شـوێنكەوتوانی (نـوح)؟! ئەوانەن كە خۆ بە زلگرەكان (ملأ) بە لاواز و نـەزان و فامكـاڵ ناویـان دەبـەن: ﴿ فَقَالَ الْمَلاَ الَّـذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَـا نَـرَاكَ إِلاَّ بَشَرًا مِثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّـذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ﴾ (هود: من الآية ٢٧) .

بـەڵێ خۆبەزلگـرەكان بـە شـوێنكەواتوانی نـوح دەڵـێن (أراذل) واتـە: هەرچـی و پەرچـی و خـەڵكی سـادە و هـەژار و ڕەش و ڕووت شـوێنكەوتووانی پێغەمـبەران بوونە، دیارە حیكمەت و فەلسـەفەی ئەو دیاردەیەش ئاشكرایە، كە هەمیشـە پەیڕەوان و لایەنگرانی پێغەمبەران (علـیهم الصـلاة والسـلام) ڕەش و ڕوت و چەوسـاوەو بـەش خوراوەكان بـوون چونكە زانیویانە پێغەمبەران لەسەر مافەكانیان بە جوابن، ئینجا ئایـا كـێبوون ئەوانـەی دژی پێغەمـبەران (علـیهم الصـلاة والسـلام) بـوون؟! خـوای پـەروەردگار لـە چـەندان ئایـەتدا پێناسـەی ناحـەز و دوژمـنانی پێغەمـبەران دەكـات بـۆ وێـنە: لـە سـووڕەتی (سـبأ)دا فەرموویـەتی: ﴿ وَمَـا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلاَّ قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ ﴾ (سبأ: ٣٤)

واتـە: وە هـیچ ئاگاداكەرەوەیـەكمان لـە هـیچ ئاوەدانیـەك دا ڕەوانـە نەكـردوە كـە خۆشـگوزەرانەكانی نەیانگوتـبێ: ئـێمە بـەوەی ئـێوەی پێڕەوانە كراون بێبڕواین.

– مامۆسـتا (مترفوها) یەعنی چی؟

+ واتـە خۆشـگوزەرانەكان، ئەوانـەی كـە نەیارانی پێغەمبەرانن (علیهم الصـلاة والسـلام) خـوای پـەروەردگار بـە چـەند شـێوەیەك پێناسـە و ناوزەدیـان دەكـات، بـۆ وێنە: (مترفوها، الذین استكبروا، الذین طغوا في البلاد) چونكە هەمیشە ئەوانەی كە خۆشـگوزەران و خۆبەزلگر و یاخی

و سنوور بەزێنن، ئەوانەی کە خۆیان بەسەر خەڵك دا فەرز دەکەن و ستەمیان لێدەکەن و مافە سیاسی و ئابووریو فەرهەنگییەکانیان لێزەوت دەکەن ئەوانە دژ و ناحەزی ئایین و بەرنامەی خوای دادگەرن، چونکە دڵنیان کە ئەگەر پێغەمبەران سەربکەون ئەو بازاڕەیان لێ تێك دەچێ، بۆیە بە شێوەیەکی ڕەها (بصورة مطلقة) و بە هیچ جۆرێك هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئیسلام و دیکتاتۆریەت دا نیە، چونکە دیکتاتۆریەت پێش ئەوەی لەگەڵ شەریعەتدا دژ بێ، لەگەڵ خودی (عەقیدەو ئیمان)دا دژ دەوەستێت، چونکە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی کاکڵەکەی بریتیە لە خوا بەیەکگرتن (التوحيد) خوای پەروەردگار لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴾ (الانبياء :٢٥) .

واتە: (وە هیچ پێغەمبەرێکمان پێش تۆ نەناردوە (عليه الصلاة والسلام) مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە جگە لە من پەرستراوێکی دیکە نیە، جا بەندایەتی بەس بۆ من بکەن) بەڵێ بەندایەتی بۆ خوا کردن و تەنها خوا بەپەرستراو (إلە) زانین و پەرستنی، بە مانای فراوان و گشتگیری پەرستن و بەندایەتی (العباده و العبوديه) ئا ئەو خوا بە یەکگرتن (توحيد)ە و کاکڵە و جەوهەری عەقیدەی ئیسلامییە، دەجا ئاشکرایە کە دیکتاتۆریەت و خۆ لە خەڵك کردنە پەرستراو و خۆ بەسەر خەڵك دا فەرزکردن و حەڵاڵ و حەرام دانان بۆ خەڵك و حوکمڕانی موتڵەق کردن بەسەر خەڵك دا ، یەکسەر لەگەڵ ئەو (توحيد)ەدا دژ دەوەستێت، تەماشا دەکەین (فرعون) لە بەرانبەر وەڵامی (موسى)دا عليه الصلاة السلام) چی دەڵێ لە کاتێك دا کە دەچێ بۆ ئەوەی گەلی چەوساوەی خۆی (بني اسرائيل) لە بن دەستی دەربێنێ و قوتاری

بکات و پێی دەڵێ: ﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ تُعَذِّبْهُمْ ﴾ (طه من الآیـة ٤٧) واتـه: بـەنی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرە و چیدیکە ئازاریان مـەدە و مـەیان چەوسێنەوە، فیرعـەون دەڵێ :- ﴿ لَئِنْ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي لأَجْعَلَنَّكَ مِنْ الْمَسْجُونِينَ ﴾ (الشعراء: من الآية ٢٩) واتـە: ئەگـەر بێجگە لـەمن پەرسـتراوێکی دیکـەت هـەبێ لەگەڵ گیراوانت دەخەم! ! واتە دەتگرم وەك زۆر خەڵکی دیکەشم گرتوە.

هـەروەها سـەرنج بدە فیرعـەون چـی بـە خەڵك و جەماوەری وڵاتەکەی دەڵێ:﴿ فَقَـالَ أَنَا رَبُّكُمْ الأَعْلَى ﴾ (النازعات: من الآية ٢٤) واتـە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم!

دیکـتاتۆر و طـاغووتـێکی دیکـەی مـێژووش (نەمـرود)ە وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّـذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّي الَّـذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ ﴾ البقرة (٢٥٨)

وەك دەبیـنین ئـەویش بـە هـەمان شێوەی فیرعـەون و هەر طاغووت و دیکـتاتۆرێکی دیکـە، لافـی پەروەردگارێتی و پەرسـتراوێتی لێدەدات! ئـەوەتا کاتـێك (ابراهـیم)-علـیە الصـلاة والسـلام- دەفـەرموێ: پـەروەردگاری مـن دەژێنێ و دەمرێنێ، نەمردووی دیکتاتۆر و طاغووت دەڵێ : منـیش خەڵك دەژێنم و دەمرێنم! ! دەڵێن نەمروود دوو کەسی بێ خەڵك لە بازاڕی هێنان یەکێکیانی کە هیچ خەتای نەبوو، کوشت و ئـەوی دیکەشـی ئـازاد کـرد، ئینجا گوتی: ئەوە منیش ئەمەیانم زیندوو کردەوە ئەمەشیانم مراند!

کەواتـە فیرعـەون و نەمـروود و طـاغووتەکان بە درێژایی مێژوو دوژمنی سەرسـەختی پێغەمـبەران (علـیهم الصـلاة و السـلام) بـوون، چـونکە

پێغەمبەران فەرموویانە: دەبێ تاکە حاکم خوا بێ، ئەوانیش گوتوویانە: نەخێر ئێمە حاکمین، پێغەمبەران گوتوویانە: دەبێ هەموومان بەندەی خوابین، کەچی ئەوان گوتوویانە: نەخێر دەبێ خەڵك کۆیلەی ئێمە بێت!! بۆیە وەك گوتم هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئیسلام و یاخود سیستەمی حوکمڕانی ئیسلام و دیکتاتۆریەت دا نیە، بەڵکو ئەو دووانە دوو شتی زۆر دژ و پێچەوانەی یەکترین، ئیسلام دەڵێ: دەبێ بەندەکان هەموویان بەس بەندەی خوا بن و هەر خوا پەرستراو بێ، بەڵام دیکتاتۆری دەڵێ: دەبێ یەکێك لە بەندەکان بەندایەتی و کۆیلایەتی بۆ بکرێ و بپەرسترێ و وەك خوا (جل و علا) بگرە بەڕێزتریش تەماشا بکرێ!!

- مامۆستا گیان جەنابت دەڵێی: هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئیسلام و دیکتاتۆریدا نیە، بەڵام سەیری مێژووی مسوڵمانان بکەین هەرچەندە لە ئەڵقەی پێشوودا جەنابت فەرمووت ئیسلام بەرپرس نیە لە لادانی ئەو خەڵکە کە لە دین لادەدەن بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەبینین زۆرێك لەو کەسانەی کە خۆیان بە خەلیفە یاخود بە (أمیر المؤمنین) ناوبردوە لادانێکی زۆریان هەیە و بەرەو دیکتاتۆریەت ڕۆیشتوون، لە نێویان دا یەکێکی وەك (حجاج) ئەگەر ئەو قسانەی کە لە بارەیەوە دەکرێت هەر هەندێکیشی ڕاست بێ، بێگومان دیکتاتۆری!

جا ئایا لە ئیسلام دا زەمانەت چیە بۆ ئەوەی سیستەمی حوکمڕانی بەرەو دیکتاتۆریەت نەڕوات؟ چونکە دیموکراسیەت تا حەددێك زەمانەتێکی بۆ خۆی داناوە، بۆ وێنە: دەستووری داناوە، ڕای گشتی داناوە، جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکانی داناوە، بۆ ئەوەی ئەو

دیکتاتۆریەتە دروست نەبێت، جا ئایا ئێمە چیمان هەیە بۆ ڕێگریی لەبەردەم دیکتاتۆریەت دا ؟!

+ لەو بارەوە کە ئایا ئیسلام چ زەمانەت (ضمانة) ێکی هەیەو داناوە بۆ ئەوەی کە دەستەڵاتی جێبەجێکردن (السلطة التنفیذیة) لا نەدات؟ من لە پێشدا ئەوە تەئکید دەکەمەوە کە ئیسلام تەنها لەو قۆناغە بەرپرسیارە کەبە کردەوە مێژووی حوکمڕانیی ئیسلامیی بووە کە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانە، هەروەها ئەو ماوە کورتەی حوکمڕانی (عمر بن عبدالعزیز) کە بە پێنجەمین خەلیفەی ڕاشید دانراوە، وە ناوبەناویش هەندێك لە دەستەڵاتدارانی دیکەش وەك (نورالدین محمود زنکی) و (صلاح الدین الأیوبی) ڕەحمەتی خوایان لێبێت، هەروەها ژمارەیەکیش لە حوکمڕانانی (عوسمانی)ش کە پیاوی باش و ئەهلی تەقوار و پابەند بوون بە شەرعەوە، ئیسلام تەنها لەو قۆناغانە بەرپرسیارە کە حوکمڕانەکان پێیەوە پابەند بوونە بە شەریعەتەوە.

– واتە : تەنها لەو قۆناغانە بەرپرسیارە کە شەریعەت تێیاندا جێبەجێکراوە ؟!

+ بەڵێ، چونکە ئەو حوکمڕانانە بە شێوەیەکی شەرعی چوونەتە سەر کورسی حوکم. بەڵام کەسێك بە زۆرداری خۆی کردبێتە حاکم و خۆی کردبێتە حوکمڕان ئەوە ئیسلام لە کردەوەکانی بەرپرسیار نیە، هەرچەندە بە ناوی ئیسلامەوەیە بەڵام بوختانە بە حوکمو بە سیاسەتی ئیسلامەوە، جا لێرەدا من دەمەوێ ئاماژە بۆ شتێك بکەم: کە شەرعزانان (فقهاء)ی ئیسلام لە کتێبەکانی سیاسەتی شەرعی لەژێر ناوونیشانی (حکم المتغلب) یان (حاکمیە المتغلب) هێناویانە، واتە: حوکمڕانی بە زۆرەملێ و خۆسەپێنەر، جا زانایانی ئیسلام لە

بارەی حوکمی ئەو جۆرە حوکمڕانییەوە بوونەتە دوو بەشەوە، هەندێکیان گوتوویانە: ویلایەتەکەی بەسەر موسڵمانان دا دروست و ڕەوایە، هەندێکیشیان دەڵێن: ئەو جۆرە حوکمڕانییە دروست نیە، دیارە من لەگەڵ ئەو ڕایەدام کە دەڵێ: دروست نیە، بەڵام ئەوانەش کە دەڵێن دروستە دەڵێن: بە ناچاری دروستە، واتە: شەرعی نیە و دەیشەرعێنن، و گوتوویانە: چونکە (حكم غشوم خير من فتنة تدوم) ئەم پەندەیان وەك قاعیدەیەك بەکارهێناوە، حوکمێك کە زۆریی تێدایە و زوڵم و جەور و خراپەی تێدایە باشترە لە فیتنەیەك کە بەردەوام بێ و ئاژاوەیەك کە نەبڕێتەوە.

بەڵام بێگومان هەر کەسێك بە شێوەی شەرعی نەچووبێتە سەر کورسی حوکم شەرعییەتی نیە، هەر بۆیەش (حسين بن علي بن ابى طالب) خوا لێیان ڕازی بێ، پاشان (زيد) ی کوڕی (على بن حسين بن على)، پاشان (محمد) و (ابراهيم) کوڕانی (عبدالله)، پاشان (عبدالرحمن بن الأشعث)وە ... وە...هتد لە ستەمکارانی ئەمەوی و عەبباسی ڕاپەڕیون، هەڵبەتە زۆرێك لە زانایانی ئیسلامیش بە تایبەت دوو پێشەوای گەورە (أبو حنيفة) و (مالك) پشتگیریان کردوون و فەتوایان بۆ داون، وە کاتێك پرسیاریان لێکراوە لەو بارەوە و پێیان گوتوون: ئێوە چۆن فەتوا دەدەن کە خەڵك پشتگیری (زيد) بکەن، یان پشتگیری (محمد) و (ابراهيم) ی برای بکەن کە یەکەمیان دژی (هشام)ی ئەمەویو، ئەوانی دیکەش دژی (أبو جعفر المنصور)ی عەبباسی ڕاپەڕیون؟!

لە وەڵام دا گوتوویانە: (هشام) و (أبو جعفر) هەقیان نیە، وە ویلایەتی شەرعییان نیە بەسەر مسوڵمانان دا.

بـەڵێ هـەر ئـەو ڕایـە ڕاسـتەو بەڵگەش زۆرن، یەکیان ئەوەیە کە خوای پـەروەردگار بـە (ابراهـیم– علـیە الصـلاة والسـلام) دەفـەرموێ: ﴿ إِنِّي جَـاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّـالِمِينَ ﴾ (البقرة: من الآية ١٢٤)

واتـە: مـن تـۆ دەگـیرم بـە پێشـەوا بـۆ خـەڵکی، گوتـی: ئـەدی لەوەچەکەم؟! فەرمووی: بەڵێن و پەیمانی من ستەمکاران ناگرێتەوە.

واتـە: لەوەچـە (ذریـة)ی تۆش هەر کەسێك وەك بێ شایستە بێ، بەڵام کەسێك ستەمکار (ظالم) بێ خوای پەروەردگار دەفەرموێ: بەڵێنی من بەوە کـە ببێـتە پێشـەوای مسـوڵمانان نایگرێـتەوە، ئیـنجا بـێگومان مەسـەلەی هەڵـبژاردنی حوکمڕان و (بیعة) لەگەڵدا کردنیشی بەڵگەیەکی دیکـەی پـتەوە لـەو بـارەوە، چـونکە پـەیمان و بەیعـەت پـێدان یەعنی چـی؟! دیـارە وشـەی (بـیعة) لـە وشەی (بیع)ەوە هاتوە، یەعنی وەك چـۆن تـۆ پـارە دەدەی بـە بابایـەکی دووکـاندار ئـەویش کەلوپەلێکـت دەداتـێ، ئیـنجا ئایـا (مـبایعة) یەعـنی چـی؟! سـەرجەم زانایـانی سیاسـەتی شـەرعی لە بارەی (مبایعة)ەوە دەڵێن: (مبایعە) ئەوەیە کە مسـوڵمانان دەسـت دەخەنـە نـێو دەسـتی ئـەو دەسـتەڵاتدارەوە کـە شـەریعەتی خوایان بەسەردا جێبەجێ بکات و بە دادگەری حوکم بکات و ئەوانـیش بـە قسـەی بکـەن، وە پاشـان پێغەمـبەر ﷺ کاتـێك کـە دەفـەرموێ : ( انمـا الطاعـة في المعـروف) کـە لـە (صـحیح الـبخاری)دا هـاتوە: واتـە: گوێڕایەڵـیی بـۆ حوکمـڕانان تـەنها لـە چـاکە دایە، واتە: ئەگـەر ناشـەرعی بـێ نـابی بـە قسـەیان بکرێ، بەڵکو دەبێ دەسـتیان بگرن و لە دژیان ڕاپەڕن.

– ئەدی لە بارەی (ضمانات)ەوە چیان گوتوە؟!

+ بە کورتی دەڵێم: هەرجۆرە (ضمانة)ێك لە دیموکراسیدا هەبێ، ئەوە لە ئیسلام دا هەموو ئەوانە بە چاکتر هەن و غەیری ئەوانەش شتی دیکە هەیە، یەکەمین زەمانەت (ضمانة) بۆ جێبەجێکردنی سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامیی، بۆ دەست گرتنی دەستەڵاتدار کە لا نەدات ئەوەیە کە هیچ حاکمێك شەرعییەتی نیە تا میللەت خۆیان هەڵینەبژێرن (لا شرعية بدون انتخاب و بيعة) هەر بۆیە زانایانی ئیسلام و مێژوونووسان بە (ابوبكر، عمر، عثمان، علي) دەڵێن: خەلیفەی ڕاشید، بەڵام لە دوای ئەوانەوە پێیان دەڵێن: مەلیك وە (الملكية الفردية)!! پاشان ئەو ئیمان و عەقیدەو ئەو مسوڵمانەتی و عیبادەتەی کە مسوڵمانان لەسەری پەروەردە دەکرێن، کە جگە لە خوا سەر بۆ کەس نەوی نەکات و بێجگە لە شەرعی خوا هیچ شتێکی دیکە بە بەرنامە و شەرع نەزانێ و بێجگە لە ڕازیکردنی خوا مەبەستی شتێکی دیکە نەبێ، ئا ئەو جۆرە پەروەردە ئیمانییە وا لە خەڵك دەکات کە نەهێڵێ، جا چ دەستەڵاتدار بێ و ئیمانەکەی نەیهێڵێ، وە چ ڕەعییەت بێ و نەهێڵێ دەستەڵاتدارەکەی لا بدات، دیارە مەسەلەی فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە و قسەگوتنی هەق لە لای حوکمڕانی لادەر (قول الحق عند سلطان جائر)یش کە بە گەورەترین جیهاد دانراوە[٩١] هەر لێرەوە سەرچاوەی گرتوە، پاشان لە یەك جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان، لە کاتێك دا کە حوکمڕانێتی ئیسلامیی (شوورایی)ش نەبوە دەستەڵاتەکان هەر لە یەك جیا بوونە، چونکە (السلطة التشريعية) کە لە زانایان دا خۆی بینیوەتەوە چ موجتەهیدان (مجتهدين) و چ موفتییەکان، تەماشا دەکەین مەگەر تاك و تەرایەك

---

(٩١) (أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر)

زانـای خۆفـرۆش کـه ناونـراون (وعـاظ الســلاطین) یـان وەك (أبو حامد الغـزالي) بـه (زانایـانی خـراپ/ عـلماء السـوء) یـان نـاو دەنێ، ئەگەرنا زانایـانی بەرجەستە، بۆ وێنە: هەر چوار سەر مەزهەبەکان( أبو حنیفة، مـالك، شـافعی، احمـد) ڕەحمـەتی خوایـان لەسـەر بـێ، وە (سـفیان الـثوري) و (سـعید بن الجبیـر) و (ابو جعفر الطبري) و (زید بن علی) و( جعفـر الصادق) و (ابن حزم) و (داود) کە هەموویان بەرجەستەو گەورە بـوون ئامـادە نـەبوون تەنانـەت فەتوایەکـیش بـدەن بـۆ ڕازی کـردنی حاکمـێك و سجنیان هەڵبژاردوە و کوژران و ئاوارەیی‌یان هەڵبژاردوە بۆ وێـنە: (سـعیدی کوڕی جوبەیر) شەهید کراوە، (ئیمام ئەحمەد) فەلاقە کـراوە، (ئـیمام شـافیعی) دەرکـراوە، (ابـو حنـیفة) کـە ئامـادە نەبووە ببێـتە (قاضـی القضـاة) سـجن کـراوە، وە (ئیمام مالك) کە دەرکراوە، هـەموویان دیفاعـیان کردوە لەوە کە خوا فەرموویەتی و پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی، وە هەوڵـیان داوە کـە بـە مـوو لانـەدەن و فەتوایەکی بە غەڵەت نەدەن و لەو پێناوەش دا هەموو باجێکیان داوە.

ئیـنجا لە بواری (السلطة القضائیة)دا زۆرجاران خەلیفەیەك کێش کراوە بـۆ بـەردەم (قاضـــي) چ لـە سـەردەمی خەلـیفە ڕاشـیدەکاندا و لـە رۆژگـاری دەســتەڵاتدارانی (ئەمەوی و عەبباسی و عوسمانی)شدا چەند جـارێك ڕوویـداوە کـە حوکمـڕان کاتـێك کـە کێشـەیەکی بـووە لەگـەڵ کابـرایەکی سـادە یـان لەگـەڵ پیرەژنـێکدا هێـنراوە بـۆ لای (قاضي) و ئەویش حوکمی ڕەوای خۆی داوە!

– مامۆســتا دەتوانـین بڵـێین: ئەگـەر دەسـتەڵاتدارێك زوڵمی کردبێ، یـاخود خەلـیفەیەك زوڵمـی کـردبێ، لەسـەر فەتوایـەك زوڵمی نەکردوە، ئەگـەر شـوێنێکی داگـیر کـردبێ وەك زوڵـم داگـیری کردوە، نەك لەسەر

فـەتوای زانا و عالمێك، یان بڕیارێکی شەرعی بەدەسەتەوە بووبێ، ئایا وا نیە؟!

+ بـا، وایـە هـیچ کاتێك ئەو جۆرە حوکمڕانی‌یەی کە لە ئەورووپادا بووە کـە ئـەوان پـێی دەڵێن: حوکمی خوایی (ثیوکراسی) کە حوکمڕان خۆی بـە سـێبەری خـوا زانیوە، وە پاپاش لەگەڵی‌دا شەریکە دز بووە، واتە لەگـەڵ (قەیسـەر) یـان پادشـادا، وە حوکمـڕان لـە یـەك کـات دا هـەم دەسـتەڵاتی یاسـادانان (السـلطة التشـریعیة)ی بەدەسـت بووە و خۆی قـانوونی دانـاوەو هـەم دەسـتەڵاتی ڕاپـەڕاندن (السـلطة التنفـیذیة) و خـۆی یاسـاکانی جێبەجێکـردوە و هـەم دەسـتەڵاتی قەزایی (السلطة القضائیة)شی بەدەست بووەو خۆیشی دادوەریی کردوە!!

بـەڵام لـە ئیسـلام دا دەسـتەڵاتی قـەزایی هەرگـیز نەهاتۆتـە ژێـر دەسـتەڵاتی یاسـادانان دا (السـلطة التشـریعیة)ەوە کـە لـە زانـاو موجتەهـیداندا بەرجەسـتە بـووە، بۆیـە ڕاستە ئەگەر زوڵمێکیش کرابێ دەسـتەڵاتی ڕاپـەڕاندن کـردوویەتی، لەبەرئـەوە هەمیشـە موسـڵمانان زانـیویانە کە ئەوە شتێکی ناشەرعی‌یەو بەردەوام ئەو هەموو شۆڕش و ڕاپەڕیـنانەی هـەبوون لـە مـێژووی ئیسـلام و مسـوڵمانان دا، زانایـان سەرمەشـقیان بوون کە لە بەرانبەر دەستەڵاتداراندا هەڵگیرساون، هەتا ئـەو کاتـەی کـە نائومـێد بوون لەوەی کە دەسـتەڵاتدار و حوکمڕانەکان لـە سۆنگەی ئـەوەوە کـە هێـندە خۆیانـیان مەحکـەم کـردبوو چـونکە سوپایەکی جەڕراڕیان هەبوو، زانیان کە ڕاپەڕینەکەیان بێ سوود دەبێ و بۆیـان دەرکـەوت کـە بـێ ئاکام دەبێ گوتیان: خەڵکینە لەبەرئەوەی کـە زیـان و زەرەر و مەفسـەدەی زیاتـرە ڕامەپـەڕن و دروسـت نـیە ڕاپـەڕن، لەبەرئـەوەی مەفسـەدەی زیاتـرە نـەك لەبەرئـەوەی کـە لـە ئەسڵدا دروست نیە؟!

– مامۆستا گیان ئەمجار با بێینە سەر مەسەلەیەکی تر لەم ڕۆژانەدا هەموو حیزبە کوردستانیەکان بە ( کۆمەڵی ئیسلامی / الجماعة الاسلامیة ) یشەوە لە کۆیە کۆبونەوەیەکیان کردو لەسەر ئەو ڕایە بوون کە کوردستان ئەگەر بە کردەوە ببێت بە هەرێمێك پێویستی بە دەستورێك دەکات، بۆیە هەر لە ئێستاوە ڕەشنووس (مسودة)ی دەستورێك داڕێژراوە، جا نازانم ئایا بە وردی خوێندووتەوە یان نا ؟!

+ بەڵێ بە وردی خوێندومانەتەوە منیش و برایانی دیکەی (قیادة)ش

– ئایا هیچ تێبینیتان لەسەر هەبوو ؟

+ بەڵی بە تەئکید تێبینیمان لەسەر هەبووە .

– هەر ئەو دەستوورە ( فیدراڵی)یە کە هەیەگوێم لە یەکێك لە سیاسەتمەداران بوو کە پێویست ناکات ناوی بهێنم دەی گوت: هەموو لایەنە سیاسی‌یەکانی کوردستان بینیویانەو خوێندوویانەتەوە، وە ڕزامەندیشیان لەسەر دەربڕیوە، ئایا وایە ؟!

+ منیش لە هەفتەنامەی برایانی یەکگرتوودا خوێندمەوە کە لە ژمارەی ئەم دوایی‌یەدا چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ کاك (فەلەکەدین کاکەیی)دا کردوە کە لەو بارەوە لێیان پرسیوە ئەویش گوتویەتی بەڵێ هەموو لایەنە سیاسی‌یەکانی کوردستان ئەو پڕۆژەیان بینیوە و ڕەزامەندیشیان لەسەر دەربڕیوەو لەسەری تەبان، بەڵام لە ڕاستی‌دا ئەوە بەو شێوەیە نیە، وە ئێمە موستەحیلە ڕازی بین بە پڕۆژەیەکی دەستوور کە لە قورئانەو هەڵنەقوڵێ و لیژنەیەك دایبنێ و پاشان لە پەرلەمانێکدا (تصدیق) بکرێ ! کە ئەمە سەرەڕای پێچەوانەی ئیسلام بوون نەشم بیستووە کە لە هیچ شوێنێکی دنیادا لیژنەیەك چەند حیزبێك دروستی بکەن و دەستوور دابنێ، چونکە ئەسڵەن بەهۆی دەستوورەوە ئەوە دیاری دەکرێ کە پەرلەمان چۆن چۆنی

هەڵدەبژێردرێ ! هەروەها چۆنیەتی دیاریکردنی دەستەڵاتی قەزایی و دەستەلاتی ڕاپەڕاندنیش کە چۆن چۆنی وڵات بڕێوە دەبات دیسان دەستوور ئەوە دیاریی دەکات !! کەواتە دەستوور لەوە گەورەترە کە دانانی لە توانای لیژنە و پەرلەمان دا بێت، بە پێی سیستەمە دیموکراسی‌یەکانیش! ئنجا ئێمەش وەك میللەتێکی مسوڵمان دەستوورمان قورئانەو ئەو بنچینەو بنەمایانەیە کە لە قورئان و سوننەتەوە هەڵدەهێنجرێن .

— جا ئایا ئەو پڕۆژەی دەستووره هیچ شتێکی ناشەرعی تێدا بوو ؟!

+ بەڵێ بە تەئکید .

— وەك چی ؟!

+ ئێمە وەك ئیسلامی هەموو ئیسلامی‌یەکانیش لەم مەسەلەیەدا لەگەڵم هاوڕان، وە ئەوەی تۆزێك لە دین و ژینیش خاڵی بووبێ هەمان ڕای هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە هەر شتێك لە بەرژەوەندی ئەم میللەتەمان دا بێ بۆ دنیا و دوارۆژی، وە لەڕووی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیو ئەدەب و ئەخلاق و ..... هتد مادام پێچەوانەی شەرع نەبێ بەچاکی دەزانین، دیارە هەرگیز شەریعەتیش لەگەڵ خێرو بەرژەوەندی ڕاستەقینەی خەڵکدا تێك ناگیرێ، ئەو پڕۆژەی دەستوورەکە هات هەرچەندە تێبینیم لەسەری هەبووە، بەڵام یەکسەر لیژنەمان نارد، وە ڕەخنەو تێبینی‌یەکانی خۆشمانمان پێدا نارد کە لەسەر پڕۆژەکە بوومان، وە گوتمان بچین لە (کۆیە) لە کۆبوونەوەکەدا تێبینی‌یەکان بخەنە ڕوو .

جا یەکەمین تێبینیمان ئەوەیە کە ئێمە میللەتێکی مسوڵمانین و دەستوورێك کە بۆ وڵاتێکی مسوڵمان دادەنرێ دەبێ ناوی خوای تێدا بهێنرێ بەڵام بەداخەوە وشەی خوای — جل جلالە— تێدا نیەو بە

(بسم الله) دەست پێ ناکاو !! پاشان دیاری نەکراوە داخۆ دینی ئەو میللەتە چی‌یە؟ دینی ئەو خەڵکە لەم هەرێمی کوردستانەدا هەیە چی‌یە؟

ئایا ئێمە چین ؟ مادام مسوڵمانین بۆچی بیشارینەوە؟! خۆ تەنانەت لە دەستووری ڕژێمی بەعسیش دا هاتووە کە (دینی ڕەسمی وڵات ئیسلامە)!!

پاشان دیاری نەکراوە کە ئایا سەرچاوەی یاسادانان (مصدر التشريع) چی‌یە؟! بەس گوتراوە: سیستەمێکی دیموکراسی بنیات دەنێین! بەڵام لە ڕاستی‌دا ئەو مەسەلە گەورەیە دەبێ ڕاپرسی گشتی (الاستفتاء العام) ی بۆ بکرێ کە ئایا ئەو میللەتەی ئێمە حکومەتێکی ئیسلامیی دەوێ کە هەموو ئیجابیەت و چاکەکانی کە لە دیموکڕاسی‌دا هەن گرتوونیە خۆی، وە لە سەلبیات و کەم و کوڕی‌یەکانیشی پاك و بەریـیە، بەڵکو لە مەسەلەیەکی هێندە گەورە گرنگ و چارەنووسسازدا پێویستە ڕاپرسی گشتی بەمیللەت بکرێ نەك لیژنەیەك ئەو کارە بکات، جا سەیر ئەوەیە وەفدی ئێمەو ئیسلامی‌یەکانی دیکەش کە چوون پێشنیارەکانی خۆیان داون بە لیژنەکە چ بە نووسین چ بە شەفەیی، لیژنەکە گوتوویەتی: باشە دوایی خۆمان تەماشایان دەکەین! کەچی دوایی پەرلەمان دانیشتوە و خۆیان چۆنیان پێ خۆش بووە وایان بڕیار لەسەر داوەو ئێستاش دەڵێن: هەموو لایەنەکان پەسندیان کردوە!!

بەڵام وانیە، چونکە ئەوە پەیوەندی بە (ئیمان و عەقیدە)وە هەیەو ئێمە بەهیچ ڕەنگێك ڕازی نابین بە هیچ بەرنامەیەك غەیری شەریعەتی خوای پەروەردگار وە غەیری ئیسلام بە دینی خۆمان نازانین، دیارە دیموکڕاسیەتیش دینە، بەڵێ پێویستە زۆر چاك بزانین کە دیموکڕاسەتیش دینێکە لەو دینانەی کە بەشەر داینـاون و کۆمەڵێك

شتی چاکەی تێدا هەن و کۆمەڵێك خراپەشی تێدا هەن، بەڵام ئێمە شەریعەتێکمان لەبەر دەستە کە خوای پەروەردگار بۆی ناردووین و هەموی چاکەو خێرو بەرەکەتی دنیاو دوارۆژی تێدایە و بە هیچ بەرنامەیەکی دیکەشی ناگۆرینەوە، بەڵام دەمێنێتەوە سەر مامەڵەکردن لەگەڵ دیموکراسیدا وەك ئەمری واقیع، ئێمە بە تەئکید لەژێر سایەی دیموکراسیدا ئەگەر دیموکراسی ڕاستەقینە هەبێ کارو چالاکی ئیسلامیی زۆر گەشە دەکات، بەڵگەشمان ئەوەیە کە کەمێك لە جەزائیر لە ساڵی (١٩٩١)دا بورای دیموکراسی درا ئیسلامییەکان (جبهة الانقاذ) لە هەڵبژاردن یەکەمیان هێنا، هەروەها لە تورکیاش کە تارادەیەك دیموکراسی لێیە ئیسلامییەکان یەکەمن، دیسان لە پاکستان و بەحرەین و مەغریب، هەروەها لەهەر شوێنێك مەجال بدرێ بە ئیسلامییەکان، چونکە میللەت مسوڵمانە تەنها ( ئیسلام)یان دەوێ هەتا ئیسلام هەبێ شتێکی دیکەیان ناوێ بەڵام بە مەرجێك خەڵك بزانێ کە ئیسلام چییەو شتەکانی دیکەش چین ؟! بۆیە ئێمە هیچ کاتێك لە دیموکراسی ناترسین، بەڵکو ئێمە لە دیکتاتۆری و لە (اِستبداد) دەترسێین، لە حوکمی تاك ڕەوانەو حوکمی طاغوت و فیرعەونایەتی دەترسین، ئەگەرنا ئێمە هیچ باکمان لە دیموکراسی نیە، بە مەرجێك ڕاست بێ، نەك هەر بایی ئەوەندە دیموکراسی بێ قسە بە خواو پێغەمبەر ﷺ بکوترێ!! هەربایی ئەوەندە دیموکراسی بێ شتی پێچەوانەی قیەم و ئەخلاقی ئیسلامیی ئەنجام بدرێ و هەر بایی ئەوندە خەڵك ئازادی هەبێ تا قسە بە ئیسلام دەگوترێ و بە موقەدەساتی مسوڵمانان دەگوترێ!! بەڵام ڕێگە نەدرێ بە خەڵك کە ڕەخنە بگرێ لە سیستەمی حوکم و لە هەڵس و کەوتی حوکمڕانەکان لە شێوەی تەوزیعی ماڵ و سامان و لە ڕەوتی سیاسی و لە سیاسەتی دەرەکی و

سیاسەتی نێوخۆ، ئەمانە هەموویان حەڕام و قەدەغەبن و تەنها دیموکراسیو ئازادییەکە لەوەدا کورت بێتەوە کە قسە بە خوا بگوترێ و قسە بە ئیسلام بگوترێ و تۆمەتی خراپ بدرێتە لای مسوڵمانەکان و لای ئیسلامییەکان!!

بەڕاستی ئەوە شتێکە قبووڵ ناکرێ، ئەگەرنا ئێمە هەتا زەمینەی کیانێکی ئیسلامییمان بۆ دەڕەخسێ ئامادەبن کە وەك ئەمری واقع مامەڵە لەگەڵ دیموکراسیدا بکەین، بەڵام بە تەئکید جگە لە ئیسلام بە هیچ حوکمێکی دیکە ڕازی نین و هەوڵیش دەدەین میللەتەکەمان مسوڵمانە حوکم و سیستەمێکی بەسەرەوە حاکم بێ کە لەسەر بناغەی دینەکەی بنیات نرابێ واتە وەك چۆن دینەکەی ئیسلامەو حوکمەکەشی ئیسلامی بێ، کە بە تەئکید ئەو کاتە سەرفرازی دنیاو دواڕۆژ دەبێ، وە هەموو ئەو ئیجابیات و چاکانەی کە لە (دیموکراسی)دا هەن، وە کاتی خۆی لە (سۆشیالیزم)دا هەبوون، وە لە هەر فیکرەو بیرو بەرنامەیەکی دیکەدا هەن، لە (ئیسلام)ی ئێمەدا بە شێوەی چاکتر هەن، وە ئاشکرایە پێش ئەوەی ئەوانە پەیداش ببن ئیسلام هەبووەو ئێمە لە بواری شتی ئیدارەشەوە هیچ پەرچ و مانعێکمان لە بەردەم دانیە کە لە هەر کەسێك سوود وەربگرین و لە هەر سیستەمێك بەهرەمەند بین وەك چۆن (عومەری کوڕی خەطاب) خوا لێی ڕازی بێ لە سەردەمی خۆیدا کاتێك کە خەلیفەی مسوڵمانان بووە لە ڕووی ئیدارییەوە سوودی بینی لە چۆنیەتی سیستەمی حوکڕانی ( فارس و ڕۆم) بۆ ئەوەی کە سیستەمی حوکڕانی ئیسلامیی گەشە پێ بدا دیوانی (جند) وە دیوانی (خراج) و دیوانی (زکاة)و ئەوانەی داهێنا، هەروەها پۆستەی داناو بەندیخانە (سجن) ی داناو زۆر شتی ئیدارەی لە فارس و ڕۆم وەرگرت و داهێنا بێ ئەوەی کە ناوی

خـۆی بگـۆڕێ و بڵـێ: دەوڵەتەکـەمانمان گۆڕیـوە بۆ سیستەمی فارسی یـان ڕۆمـی! ! یـەڵکو هەرئیسـلامیی بـوو، ئـەو ( میکانـیزم )انەشـی ئیسـتفادە لـێکرد، چـونکە لەسـەر بـناغەی ئیسـلام و پابـەندی بـە شـەریعەتەوە ئـەو شـتە ئـیداریی (میکانـیزم)انـە بـە باشـترین شـێوە بەکاردەهێـنرێن و بەهـرەیان لێ وەردەگـیرێ بـۆ گەشـەپێکردن و پەرەپێدانی ئەو دەوڵەتە ئیسلامیی‌یە .

– خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە مامۆستا گیان.

+ خـوای پـەروەردگار پاداشـتی ئـێوەش بداتـەوەو عاقیـبەتی هـەموو لایەکمان خێر بکات .

# نێوەرۆك

شتیکی ڕوون و ئاشکرایە ، کە بۆ تێگەیشتنی هەر وشەو زاراوەیەك بەتایبەت ئەوانەی ، کە بونەتە ڕەمزو ناو و نیشان بۆ مەسەلە گرنگەکان و ڕێچکەو بیر دۆزەکان ، پێویستە سەرنجی ڕەگ و ڕیشەکانیان بدەین و گوێ بۆ خاوەنەکانیان و ئەوانە بگرین ، کە بۆ یەکەم جار بەکاریان هێناون ، نەك لە گۆترە و بەمەبەستێکی تایبەت چەمك و واتایان بۆ دابتاشرێ و ڕاستیەکان بشێوێنرێن ، کەسەرەنجام خەڵکی گیرۆدەی هەڵەو چەواشەبون دەبن!.

عەلی باپیر

التفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ/ هەولێر .

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ -٢٢٣٠٩٠٨ -٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com